# ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی

بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی
لە کۆڕی زانیاری کورد



# ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی

بە پێی لێکۆڵینەوەی لێژنەی زمان و زانستەکانی

لە کۆڕی زانیاری کورد

# ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی

بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی

لە کۆڕی زانیاری کورد



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی
لیژنەی زمان و زانستەکانی لە کۆڕی زانیاری کورد
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٠٩٠
چاپی دووەم ٢٠١١
تیرێژ: ٢٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٦٦ - ٢٠١١
نەخشاندنی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
ڕازاندنەوەی بەرگ: مریەم موتەقیییان
پیتکاری: ڕۆشنا ڕەشاد
هەڵەگری: کارزان کانەبی
ڕێنووسی یەکگرتوو: بەدران ئەحمەد حەبیب

# ڕوونکردنەوەییێکی پێویست

کۆڕی زانیاری کورد، لە ڕۆژانی سەرەتای دامەزرانیەوە، چەند لیژنەیێکی پێک هێنا بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی کە بە پێی یاسای دامەزرانی بۆی دیار کراون.

بۆ خەریکبوون بە زمانی کوردییەوە، کە یەکێکە لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی کۆڕ، لە هەوەڵەوە لیژنەیێک دامەزرا بە ناوی (لیژنەی زمان)ەوە بە ئەندامەتی ئەم مامۆستایانە: پاکیزە ڕەفیق حیلمی، کامیل بەسیر، گیو موکریانی، عەزیز ئەحمەد، سادق بەهائەدین، نووری عەلی ئەمین و ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی. نەختێک دواتر مامۆستا حافز موستەفا قازیش خرایە سەر لیژنەکەوە و بوون بە هەشت ئەندام. ئەم لیژنەیە لە ڕۆژی ٣ – ٥ – ١٩٧١دا کەوتە سەر کارکردن و دوازدە جاران کۆ بووەوە و بەسەردا هەڵوەشایەوە و یەکێکی تری لە جێگە دانرایەوە بە ناوی (لیژنەی زمان و ئیملا) و لەم ئەندامانە پێک هێنرا: مەسعوود محەمەد، هەژار (عەبدوڕەحمان)، پاکیزە ڕەفیق حیلمی، نەسرین فەخری، کامیل بەسیر، سادق بەهائەدین، عەبدولحەمید ئەترووشی و نووری عەلی ئەمین.

لە یەکەم نیگاوە دەردەکەوێت لە هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەم لیژنانە لایەنی گرتنەوەی زۆربەی شێوەکانی ئاخاوتنی کوردی ڕەچاو کراوە تاکو ڕێزمانێک کە لە ئەنجامی تۆژینەوەی لیژنەیێکی ئەوتۆوە بەرهەم بێت سەرلەبەری شێوەکانی کوردی تێدا خوێندرابێتەوە بەو نیازە کە وا لە بەراوردکردنی زۆرینەی شێوەکانەوە هەل پتر چەنگ کەوێ بۆ دۆزینەوەی دەستووورە ڕەسەنەکانی ڕێزمانی کوردی. ئەم مەبەسەش بەلاوە بندرێ مەبەسی ڕووپێوکردنی هەموو زمانەکەمان، ئەگەر مومکین بێت، لە ڕێی تێخوێندنەوەی هەموو شێوە ئاخاوتنەکانیەوە کارێکە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە و گەلێک یارمەتیی زمانزان دەدات هەم بۆ پێکهێنانی فکرەیێکی گشتی لە بارەی زمانی کوردییەوە و هەم بۆ تێبرکردن لە گەشتی پسپۆڕانە و تێ هەڵکشینەوەی مێژووناسان بۆ ناو جەرگە و بۆ سەر بنجی زمانەکە.

بێگومان ڕەچاوکردنی ئەم مەبەسانە لە سەرەتاوە وای کرد پێکهێنانی لیژنەکان باوەش بە ژمارەیێکی زۆر لە ئەندامانـدا بگرێ، بەڵام بە تاقیکردنەوە دەرکەوت لیژنەی زۆر ئەندام بە هۆی درێژەکێشانی دەمەتەقەی نێوانیانەوە بڕشتی ئەوەندە کەم دەبێ کە لەگەڵ ئەرک و کاتەکەی چ گونجانێکی نەبێ، بۆیێ ئەم لیژنەیەش هەڵوەشیاوە و ئەمجارەیان لە ڕۆژی ١٢ - ١١ - ١٩٧٢دا دوو لیژنەی لێ کەوتەوە: یەکێکیان بە ناوی (لێژنەی زمان) کە لەم ئەندامانە پێک هێنرا: مەسعوود محەمەد، هەژار، نەسرین فەخری، سادق بەهائەدین و نووری عەلی ئەمین. ئەوی تریان بەناوی (لیژنەی لێکۆڵینەوەی زمان) کە لەسەر ڕێبازێکی تایبەتی خۆی خەریکی تۆژینەوەیە و چ پێوەندیێکی بە لیژنەکەی ترەوە نییە.

لیژنەی زمان بەردەوام بوو لەسەر چالاکیی خۆی تا ڕۆژی ٥ - ١١- ١٩٧٣. لەم ڕۆژەدا بڕیارێکی نوێ لە ئەنجومەنی کۆڕەوە دەرچوو لیژنەیێکی تازەی پێک هێنا لە ژێر ناونیشانی (لیژنەی زمان و زانستەکانی) بە ئەندامەتیی: مەسعوود محەمەد، نەسرین فەخری، سادق بەهائەدین و نووری عەلی ئەمین. مامۆستا هەژار خۆی لە ئەندامەتیی ئەم لیژنەیان دەرهاویشت بۆ مەبەسی یەکلابوون لەگەڵ چالاکیی لیژنەکانی تر کە تێیاندا ئەندام بوو، بەتایبەتی لیژنەی ئەدەب. کاری ئەم لیژنەیە درێژەکێشانی کاری لیژنەکەی پێشووترە کە ناوی (لیژنەی زمان) بوو، چی لێرەدا دەیخوێنیتەوە بەرهەمی دوو لیژنەی یەک لە دوایەکی (لیژنەی زمان) و (لیژنەی زمان و زانستەکانی)یە لەو ڕۆژەوە کە کەوتنە سەر کاری سەربەخۆیانەوە.

لیژنەکانی سەر بەزمانەوە لە سەرەتاکانی خەریکبوونیانەوە بەزمان ڕێنووس و ڕێزمانیان تێک بەستبوو، واتە چارەسەرکردنی گیروگرفتی ڕێنووس و دۆزینەوەی دەستوورەکانی ڕێزمانیان لە هەمان کاتدا دەست تێ وەردەدا، لەمەشدا ئەم ڕاستییەیان ڕەچاو کردبوو کە بەشێکی زۆری چۆنیەتیی نووسینی وشە و کەرتەکانی ئاخاوتن بەندە بە دۆزینەوەی ئەو دەستوورانەی ڕێزمان کە دیار دەدەن تەرکیبی وشە و ڕستە چۆنە و لە چییەوە هاتووە و کامی بە کامیەوە لە نووسینـدا بلکێ وەیا نەلکێ. بەڵام زووبەزوو دەرکەوت بەستنەوەی دانانی ڕێنووس بە دەرهێنانی دەستوورەکانی ڕێزمانەوە لەگەڵ پێویستیی خێراکردن لە دانانی ڕێنووسێکی یەکگرتوو ناگونجێ، چونکە فەرمانی ڕێزمان کارێکی نەفەسدرێژ و بەرفرەوانە، لەوانەیە چەند ساڵ تێ پەڕێ بەر لەوە لیژنە وەیا تاک لێی ببێتەوە لە

کـاتێکدا گـیـروگرفـتی ڕێنووسی کوردی لە کـوردسـتـان عێـراقـدا پێـویـسـتی بە چارەسـەرکـردنێکی خێـرا و سـەربەخـۆ هـەیە بەڵکو بتـوانرێ یەک شـێوە و ڕێنووس بکرێ بە دەسـتـووری گشـتی بۆ هـەمـوو لایەنێک و هـەمـوو نووسـەران. ئەم تێبینییە وای کرد لیژنەکانی ڕێزمـان خۆ بدزنەوە لە گـیروگرفـتی ڕێنووس و یەکلا بنەوە بۆ تۆژینەوە لە ڕێزمان.

کـاری ئەم لیـژنەیەی (زمـان و زانسـتـەکـانی) کە درێژەکـێشـانی کـاری (لیـژنەی زمان)ە بـۆ ئامانجێکی دیارکراو بووە لەلایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە، کە بریتییە لە ڕێکخسـتنی پوخـتـەیێکی ئەوتۆی ڕێزمـانی کـوردی دەست بدا بۆ خـوێندن لە پلە هەڵکشـیـوەکـانی فـێـرگـەکـانی رەسـمی و کـۆلێـجـەکـان، مـەبەس ئەوە نـەبووە لە تۆژینەوەیدا قـووڵ بێـتـەوە بۆ بنـاوانی زمـانی کـوردی کە سـەر دەکـێشـتـەوە سـەر لێکۆڵینەوەی مێـژووی زمـان و خـەریکبـوون بە فـۆنەتیکەوە سـەرەڕای گـەیاندنەوە یەکتری زارە جوداکانی لە ناوچەیێکەوە بۆ ناوچەیێکی تری کوردستانی گەورە.

لیژنە لە خـەریکبوونی بە باسـەکانی ڕێزمـانەوە ویستوویەتی هـەرجارە چاوێک بە بیروباوڕی زمـانزانانی کـوردیدا بخـشـێنێ و بەراوردێکیش بکا لە نێوانـی زمـانی کوردی و ئەو زمـانانەی کە ڕێزمـانەکانیان بەلای کوردەوارییەوە نەختێک ئاشنایە. بۆ ئەم ئامـانجە تا لە توانایدا بووبێت سـەرەتای لێکۆڵینەوەکـانی بە هێنانەوەی ئەو بیروباوەڕانە و دەستووری ئەو زمـانانە دەست پێ کردووە، بـەلام نەیتوانیوە هەموو جارێک لەسـەر ئەم کـارەی بەردەوام بێت لەبەر هـەندێ هۆی کە سەردەکێشـێتـەوە سـەر ناچاری و دەست نەڕۆیشتن. لیـژنە خـاوەنی ژوور و کـتـێبـخـانە و ئەرشـیـفی تایبەتی خۆی نییە بتوانێ سەرچاوەی ئەو بەراوردکردنانە، کە کتێبەکانی ڕێزمانی کـوردی و هی زمـانەکـانی بێگانەیە، هەمیـشـەکات بەردەست بکات. هەر یەکێک لە ئەندامـەکانی، وەک کتێبخـانەیێکی بچـووکی گـەڕۆک، هەرجارە چ کتێبێکی ڕێزمانی لا هـەبێ بۆ کۆبوونـەوەی لیژنە لەگەڵ خـۆی دەیهێنێ. لەم هـاتوچۆیەشدا زۆر جاران وا دەبێ کـتێب بزر دەبێ و جێگریشـی نییە بێـتەوە جێی یاخود بە درەنگەوە جێگر پەیدا دەبێـتـەوە، ئیـتـر لە کـۆبوونەوەکـانی دواتردا کـەلێنـی ئەو کـتـێبـە بزربووانە دەردەکەوێت تا ڕۆژێک کە کتێبی تازە لە لایێکەوە بەردەستی لیـژنە دەکەوێت. واش دەبێ یەکێک لە ئەندامانی لیژنە ناتوانێ لە کۆبوونەوەیێک، وەیا زیاتر، ئامادە بێت ئیـتـر بە خـۆی و بەو کـتـێبـە ڕێزمـانییـەی کە هـەیەتی لە لـیـژنە دادەبڕێ و بایی ئەو

ســەرچاوەیەی کــە لایەتی کــەلێن دەکــەوێتــە توێژینەوەی ئەو کــۆبوونــەوەیە و پڕکـردنەوەشی دەبێتـە فـەرمـانی دواڕۆژ. سـەرەڕای ئەمـانە گـۆڕانی ئەندامـان لە دامــەزراندنی لیـژنەی تازەدا وا دەکا ئـەو کـتـێبـەی کە لە هەوەڵەوە لەبەر دەسـتی لیـژنەدا بوو نەکـەوێتـەوە بەر دەسـتی بە هۆی لێکەوتنی خـاوەنی کـتـێبـەکـە لە ئەندامـەتیی لیژنەی نوێ. بە نموونەی روونکردنەوە دەڵێم تاکە نوسخەی کتێبێکی ڕێزمـانی مـامـۆسـتـا تۆفـیق وەهبی کـە دەسـتـی لیـژنەی بەسـەر ڕادەگـات ئەو دەسنووسـەیە کە لای د. نەسرین فـەخری هەیە و خۆی شکڵنووسی کردووە لەبەر کتێبەکە، دەوجا چەندێکی د. نەسرین لە کۆبوونەوەی لیژنە دابڕابێت کتێبەکەی مـامـۆسـتـا وەهبـیش نادیار بووە. وا چاوەڕوان دەکـرێت ئەم کـەمـوکـەسـرییـە لە کەرسـتـەی دیراسـە و باری لەبار بۆ چالاکیی لیژنە، بەتەواوبوونی خـانووی تازەی کۆڕ بەسـەر بچێ لەو رووەوە کە مەودای بەرفرەوانتر و جێگە و ڕێگەی ڕێکوپێکتر و کتێبخانەی دەوڵەمەندتر بۆ لیژنە پەیدا بێت.

لێرەدا پێویست دەبینم بارێکی گرنگی تری چۆنیـەتیی کاری لیژنە و شـێوازی توێژینەوەی لە ڕێزماندا روون کەمەوە:

لیژنە وای بە چاک زانـی نەخشـەیێکی گشتی بۆ لێکۆڵینەوەکانی بکێشێت تاکو پێ بە پێ و هـەنگاو بە هـەنگاو و لە چارچێوەی ئەو نەخشـەیەدا بەرەوپێشـەوە بڕوا بۆ ناو باسـەکانی ڕێزمـانی کـوردی. لـەم ڕێبـازەدا شـێوازی کـلاسـیکیی توێژینەوەی زمـانی تێکەڵ کـرد لەگەڵ شـێـوازێکی مـەیلەو خۆکـردداﹸ، بڕیاری دا لە سـەرەتاوە کەرت و بەشـەکانی ئاخـاوتنی کوردی دەست نیشـان بکات و بە پێی باوەڕی خۆی لێیانەوە بدوێت و ناو و زاراوەیان بۆ دابنێت، بەدوا ئەوەدا بکەوێتە سەر لێکۆڵینەوە لە چۆنیـەتیی دروسـتکردنی ڕستە و داڕشـتنی گوتە لە زمـانی کوردیدا. لە تێکڕای دانانی نەخشـە و بەسـەردا ڕۆیشـتـنی، ئەوەشی ڕەچاو کرد کە نیگای خۆی ببڕێتـە سـروشت و تایبـەتی ئاخـاوتنی کـوردی نەک لە کـولانەی ڕێزمـانی ئاخـاوتنەکـانی بێگانەوە سـەیری زمـانی کوردی بکـات، واتە لە بەر تیـشـکی نـاوەکـیی سـەلیـقـەی کــوردیدا ڕێزمــانەکــە شی کــاتەوە نـەک لە دەرەوەڕا چرای بۆ بخــوازێتــەوە. لە پێکهێنانی ئەم مـەبەستـەشدا بە درێژاییی کـات دەبوو سەقافەتی جودا جودای هـەر چوارِ پێنج ئـەندامـەکـانی لیـژنە بێـتــەوە سـەر یەک شــەقـامــەڕێی توێژینەوە، قـەناعـەتـەکانی تایبـەتـی ئەندامـەکانیش بەلاوە بنرێ بۆ ئیـحـتیـمـالی دۆزینەوەی

ڕاستییەکی تازە و شرایەوە لە ڕێزمانی کوردیدا. هەرچەند ئەم خۆ لەبیرکردنە کارێکی زەحمەت بووە و هەموو جاران لە تواناد نەبووە، بەڵام لە بەشی هەرەزۆری تۆژینەوەکان هەوڵ دراوە بیروباوەڕی هەموو ئەندامەکان لەسەر یەک ڕای کۆبێتەوە چەنداوەکو ئەم هەوڵدانە داخوازی دەمەتەقە و کێشەیێکی دوور و درێژیشی کردبێ. کە بێیت و سەیری (محضر)ی کۆبوونەوەکانی لیژنە بکەیت دەبینی وا بووە چەند کۆبوونەوەیێک تێ پەڕیوە بێ ئەوە چ مەودایێکی ئەوتۆ بڕابێ لە تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەدا کە لەگەڵ درێژ خایاندنی ئەو دەمەتەقانە بگونجێت، چونکە هەوڵدانی بێ وچان و بۆ گەیشتن بە بیروباوەڕێکی یەکگرتوو لیژنەی لە بزووتنەوەی خستووە. هەندێ جار نەگونجانی ڕای ئەندامانی لیژنە گەیشتووەتە ڕادەیێک وا پەسەند دیتراوە لیژنە دەستی خۆی لە تۆژینەوەی شوێنی ڕێک نەکەوتنەکە بکێشێتەوە و گرفتەکە بخاتەوە بەر چاوی ئەنجومەنی کۆڕ تاکو ئەو بەپێی دەسەڵاتی خۆی بڕیار بەسەر شتێکدا بدات، بەڵام هەموو جاران لە حاڵی وەهادا کۆڕ گرفتەکەی بۆ لیژنە گێڕاوەتەوە بێ ئەوە هیچی لێوە بڵێ لەو ڕووەوە کە وا تاکو کۆتاییی کاری لیژنە، هەرچی هەبێ سەر بەتۆژینەوە لە ڕێزماندا، بەجێ بهێڵرێ بۆ لیژنەکە خۆی نەکا بەرهەمەکەی ببێتە مزاش وەیا وەک دەغڵی هەڕەمەی لێ بێت. لەمەڕا دەردەکەوێت ئەوپەڕی دیموکراسی لە دەربڕینی بیروباوەڕ و شێوازی کاری لیژنەدا بەکار هاتووە و لە هیچ لایێکەوە هیچ شتێک بەسەریدا نەسەپێنراوە.

لێکۆڵینەوەکانی لیژنە، لە ماوەی ڕابردوودا، گەڵاڵەیێکە پێویستی بە ڕێکخستن و پوختەکردن هەیە بۆ ئەوە ببێتە بەرهەمێکی شایان بە بڵاوکردنەوە و شکڵی کتێبی ڕێزمان وەرگرێ. لیژنە بە ئومێد بوو لە پاش تەواوکردنی هەموو باسەکە جارێکی تر بەسەریدا بێتەوە و کەلەبەرەکانی پڕ کاتەوە و ناڕێکییەکانی لەبار کاتەوە ئەوسا بیخاتە بەر چاوی ئەنجومەنی کۆڕەوە تاکوو ئەویش بۆ دواجار دەسبژارێکی بکا و بڕیار لەسەر ڕاست و هەڵەی بدا ئەوجا لە شکڵی کتێب وەیا چەند گوتارێک لە گۆڤارەکەیدا بڵاو بکرێتەوە. بەڵام وا دیارە دیوانی سەرۆکایەتی بەرژەوەندی لەوەدا دیت بەرهەمەکە خێراتر بخرێتە بەرچاوی خوێنەری کوردییەوە بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندن و ڕەخنە لێگرتنی. ئەم خێراییکردنە بووە هۆی مانەوەی جوداوازیی بیروڕای ئەندامانی لیژنە وەک کە هەبوو، چونکە وەک گوترا ئەنجومەنی کۆڕ جارێ بڕیاری لەسەر هیچ ڕایێکیان نەداوە تا بیکاتە ئەو دستوور

کە خۆی رای لێیە و وەک پێشنیازی کۆربیخاتە بازاڕی نرخاندن و ڕەخنەی خوێنەرانەوە. لێرەدا بیروباوەڕی ئەندامانی لیژنە لەسەر حاڵی گەلاڵەیی ماوەتەوە بێ هیچ بژارکردن و سازدان و ڕێکخستن، کەس لە لاوە دەستێکی پوختەکردنی بۆ ئەم گەلاڵەیە نەبردووە.

ماوەتەوە بڵێم لیژنە لە پێشەوە چ بڕیارێکی سەرەتاییی نەدا لە بارەی چەندبوونی بەشەکانی زمانی کوردییەوە، ئەم چەندبوونە درایە بەر حوکمی تۆژینەوە لە زمانەکەدا جا زۆر بێ یا کەم. لەم مەیدانەدا تەنیا ئەوەندەی کرد کە دەست بکا بەو بەشانەی چ گومان نییە لە بوونیان سەربەخۆییان و لە هەموو زماناندا بە شێکی سەربەخۆی ئاخاوتن ژمێرراون بۆیەیە ڕاستەوخۆ لە پێشەوە یەخەگیری بەشی (ناو) و تاقمەکەی بوو.

مقرر (دەمڕاست)ی لیژنە

مەسعوود محەمەد

# بەشەکانی ئاخاوتن

## ١

## ناو

ناو ئەو وشەیەیە سەربەخۆ واتایەک دەگەیەنێت کە بە کاتەوە نەبەستراوە، وەک: کاوە، ساڵ، بەرد، پیاوەتی، هەولێر، ڕۆیشتن، گوڵ، پەپوولە، فڕۆک، بەستەڵەک، هەڵپەڕکێ، تێ هەڵکێشان.

[تێبینی و ڕوونکردنەوە:
کە دەگوتوێ (بە کاتەوە نەبەستراوە) بۆیەیە هەتاکو ناوەکانی (ظرف زمان) وەک ڕۆژ، شەو، ساڵ، مانگ، سات، کات... هتد بەر ئەم تەعریفە بکەون و نەچنە ناو تەعریفی کار (فعل)ەوە، چونکە لەو ناوانەدا (کات) ناوەڕۆکی وشەکانە نەک پێیانەوە بەستراوە. لە عەرەبیدا دەڵێن (غیر مقترن بالازمنة الثلاثة)، واتا ئەو (اقتران)ەی عەرەبی بەسترانەوەکەی کوردییە لەم تەعریفەدا.
دەمڕاستی لیژنە]

ناو لە دوو ڕووەوە باس دەکرێت:

١- لە ڕووی پێکهاتنەوە.

٢- لە ڕووی واتاوە.

یەکەم- ناو لە ڕووی پێکهاتنەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١- سادە

٢- ناسادە

ناسادەش دەبێتە دوو بەش:

أ- لێکدراو

ب- دارێژراو

١- ناوی سادە

هەتا ئێستا بۆ ئەم زاراوەیە ئەم وشانە دانراون.

١- سەعید سدقی (تەنیا)ی بەکار هێناوە.

٢- توفیق وەهبی (سادە)ی لە فەرهەنگە ئینگلیزییەکەیدا بەکار هێناوە.

٣- مەردۆخ (سادە)ی لە فەرهەنگەکەیدا بەکار هێناوە.

٤- شێخ محەمەدی خاڵ (سادە)ی لە فەرهەنگەکەیدا بەکار هێناوە.

٥- کوردۆییێف (ئاسان)ی لە ڕێزمانەکەیدا بەکار هێناوە.

٦- رشیدی کورد (خوڕی)ی لە ڕێزمانەکەیدا بەکار هێناوە.

٧- جگەرخوێن (سادە)ی لە ڕێزمانەکەیدا بەکار هێناوە.

٨- نووری عەلی ئەمین (پەتی)ی لە ڕێزمانەکەیدا بەکار هێناوە.

٩- هەژار وا پێشنیاز دەکات کە وشەی (ساکار) بەکار بهێنرێت.

پێناسینی (تعریف) ناوی سادە:

لیژنە بۆ دۆزینەوەی تەعریفێکی تەواو دوور و قووڵ لەم باسەی کۆڵییەوە و ئەو تەعریفانەی کە لەمەوبەر بۆی دانراوە هێنایەوە بەر چاو:

سەعید سدقی دەڵێت: ئیسمێکە ئیسمێکی تری لەگەڵا نەبێ، وەکو (عەلی، مراد، شار، بازاڕ).

مەردۆخ دەڵێت: ناوی سادە لە یەک واژە دروس بووگە، وەک دەرز، کێو، قورسی، بلبل.

زۆربەی نووسەرانی تر هەر ئەو تەعریفەی بۆ ناویان داناوە کردوویانەتە تەعریف بۆ ناوی سادە، دوایی تەعریفێکی سەربەخۆیان هێناوەتەوە بۆ ناوی لێکدراو.

لیژنە بە دوا ئەم چاو پێداخشاندنە بەو تەعریفانەدا کەوتە سەر لێکۆڵینەوە لە تەواوی و ناتەواویی تەعریفەکان لە بەر تیشکی واتای (سادە) خۆیدا. هەریەک لە

ئەندامەکان رای تایبەتی خۆی دەربڕی، لە ئەنجامی بەراوردکردنی هەموو لایەنێکی باسەکە و ڕایەکان لیژنە ئەم تەعریفەی پەسند کرد:

ناوی سادە ئەو ناوەیە کە لە تەنیا وشەیێک پێک هاتبێت، وەک:

بەرد، با، مرۆڤ، دەشت، ڕەگ، مەڕ، گۆشت.

[تێبینی و ڕوونکردنەوە:

سادەبوونی ئەم وشانە لە ڕواڵەتی ئێستاکەیانەوە دەفامرێتەوە، لیژنەش هەر ئەم ڕواڵەتەی کردووە بە بنگەی بڕیاری سادەبوونیان. تۆژینەوەی لیژنە بەرەو سەرچاوەی وشەکانی فەرهەنگی کوردی تێ هەڵناکشێت تاکو هەموو وشەیێک بباتەوە سەر بنجی مێژوویی خۆی و سادەیی و ناسادەییان دەرخات. ئاشکراشە ئەم وشانەی لە ڕواڵەتی ئێستاکەیاندا بە سادە دەژمێردرێن هەر بە سادەیی دەمێننەوە هەرچەند تۆژینەوەی مێژوویی ناسادەییشیان بسەپێنێ چونکە کەس نایێ لە نووسیندا بە شکڵی ناسادەیان بەکار بێنێ وەیا لە وتووێژدا بە غەیری جۆری ئێستایانی بڵێتەوە. کە بێین و ئەو وشانەی ئێستا بە سادە دەناسرێن هەڵیان وەشێنینەوە وەک ئەوەی «کلۆج» بکەینەوە «کل وجە»، ئاخاوتنی کوردیمان دەگۆڕێت بەرەو ناقۆلایی و دزێویەوە کە ئەمە کارێکە دژی هەموو بەرژەوەندێکی زمانی کوردی.

دەمڕاستی لیژنە]

٢- ناسادە: هەتا ئێستا بۆ ئەم زاراوەیە ئەم وشانە بەکار هێنراون:

١- سەعید سدقی (تێکەڵ).

٢- توفیق وەهبی (لێکدراو).

٣- مەردۆخ (پەیوەست).

٤- کوردوێف (بارگران).

٥- نووری عەلی ئەمین (ئاوێتە).

٦- ڕەشیدی کورد (لێکدائی).

٧- جگەرخوێن (پەرچەم).

پێناسینی ناوی ناسادە:

لیژنە بۆ دۆزینەوەی تەعریفێکی تەواو دوور و قووڵ لەم باسەی کۆڵییەوە و ئەو تەعریفانەی کە لەمەوبەر بۆی دانران هێنانیەوە بەر چاو، وەک:

سەعید سدقی دەڵێت: ئیسمی مرکب ئیسمێکە ئیسمی تری لەگەڵدا بێت وەکو عەلی مراد، شاربازێر.

مەردۆخ دەڵێت: ناو پەیوەست ئەو ناوەس یا لە دوو واژە یا زیاتر دروس بووگە، وەک خداداگ، باخەوان، خۆرەتاو، گوڵاو.

کوردویێف ناوی لێکدراو دەکا بە دوو بەشەوە، بەشێکیان بە یاریدەی ناو و ئاوەڵناو هتد... پێک دێت. بەشەکەی تریش بەهۆی پێشگر و پاشگرەوە پێک دێت.

نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانی کوردیدا دەڵێت: وشەی لێکدراو ئەو واژەیەیە کە لە دوو وشە یا پتر پێک هاتبێت، وەک: مێرگەسوور، مارماسی، بەرداش.

لە دەستووری زمانی فارسیدا دەڵێت: ناوی لێکدراو ئەو ناوەیە کە خاوەنی دوو پارچە بێت، وە هەر پارچەیەیان واتایەکی جودای هەبێت و بە هەردووکیان ببنە ناوێک، وەک کەروێشک.

لیژنە دوای هەڵسەنگاندنی ئەم تەعریفانە، هیچ کامێکیانی پەسند نەکرد و کەوتە سەر وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە بۆ ئەوەی بگات بە تەعریفێکی دروست.

لە هەمان کاتدا لیژنە کەوتە سەر لێدانەوە لەوە ئاخۆ دابەشکردنی (ناو - یاخود وشە بە جۆرێکی گشتی) لە سەرەتاوە بکرێ بە دوو بەشەوە:

١- سادە.

٢- ناسادە.

ئەوجا ناسادە بکرێتەوە بە:

١- لێکدراو.

٢- داڕێژراو.

یاخود یەکسەر ناو لە رووی فۆرمەوە بکرێ بە سێ بەشەوە:

١- سادە.

٢- لێکدراو.

٣- داڕێژراو.

لە کاتی دەمەتەقە لەسەر ئەم پرسیارە سێیەم هاتە ناو ئاخاوتنەوە بۆ ئەوە ناو بکرێ بە دوو بەشەوە:

١- سادە، ٢- ناسادە بێ ئەوە ناسادە دابەش بکرێتەوە بۆ: (لێکدراو، داڕێژراو).

دوای ئەم موناقەشانە لیژنە کەوتە سەر هەڵبژاردنی یەکێک لەو دابەشکردنانە:

د. نەسرین فەخری و نووری عەلی ئەمین پەسندیان کرد کە ناو لە سەرەتاوە بکرێ بە سێ بەشەوە:

١- سادە، ٢- لێکدراو ٣- داڕێژراو - دروست کراو - بێ ئەوە ناوی ناسادە بێتە ناوەوە.

مەسعوود محەمەد، هەژار و سادق بەهائەدین لەو باوەڕەدا بوون ناو لە سەرەتاوە بکرێت بە ١- سادە ٢- ناسادە. ناسادەش بکرێ بە

١- لێکدراو ٢- داڕێژراو.

لیژنەی پەیڕەوی ڕای زۆرینەی ئەندامانی کرد و بڕیاری دا لە نووسینەکانیدا ناو بکا بە ١- سادە ٢- ناسادە. ئەوجا کەوتەوە سەر لێکۆڵینەوەی باسەکە.

٢- ناوی ناسادە:

لیژنە ئەم تەعریفەی پەسند کرد بۆ ناوی سادە:

«ئەو ناوەیە لە وشەیێک و زیادی پێک هاتبێت ئەوجا زیادییەکە وشە بێت یا ئامراز یا پێشگر یا پاشگر یا هەر شتێکی تر».

ئەم تەعریفە بۆیە پەسند کرا چونکە هەموو جۆرەکانی ناسادە (لێکدراو و داڕێژراو) دەگرێتەوە، وەک:

مارماسی، بەردەنوێژ، بن بەردەقیلە.

ئەوجا ناوی ناسادەش دوو جۆرە:

أ- لێکدراو: ئەو ناوەیە کە وا بە لانی کەمەوە دوو وشەی واتاداری تێدا بێت، وەک:

دڵشاد، کەومار، رووپاک، شەولەبان، گوڵەگەنم. شەکرەسێو، باگردێن.

ب- دارِێژراو: ئەو ناوە ناسادەیە کە تەنیا وشەیێکی واتاداری تێدا بێت، وەک: داسوولکە، پیاوەتی، ملوانکە، هەڵکەوت، داهات.

[روونکردنەوە:

لە تەعریفی ناوی دارِێژراو کە گوترا (تەنیا وشەیێکی واتاداری تێدا بێت) و باسی پێویستبوونی (زیادە)ی تێدا نەکرا بۆیەیە چونکە لە سەرەتای تەعریفەکەوە گوترا (دارِێژراو ئەو ناوە ناسادەیە...) لە ناسادەشدا بوونی (زیادی) مەرجە، ئیتر پێویست نامێنێ بە باسکردن و مەرج گرتنی زیادەکە دەنا دەبێتە (تحصیل حاصل).

دەمرِاستی لیژنە]

دووەم - ناو لە رووی واتاوە:

لە پێشەوە نمایشێکی ئەو دابەشکردنانە دەکەین کە لەمەوبەر لە لایەن زمانەوانەکانی کوردییەوە بۆ (ناو) لە-رووی مەعناوە دانراون:

آ- مامۆستا سەعید سدقی، هیچ جوداوازیی لە میانی فۆرم و واتای ناوەوە دەرنەخستووە تەنیا لە رێبازێکی ترەوە بۆ باسکردنی ناو چووە و ناوی کردووە بە دوو بەشەوە..

آ- ناوی عام

ب- ناوی خاص

ب- مەردۆخ، ناوی لە رووی مەعناوە کردووە بەم بەشانەوە:

١- ناوی شەخسی. رۆستەم

٢- ناوی جەمع. گەل

٣- ناوی نەوع. ئەسپ

٤- ناوی جنس. گیاندار

٥- ناوی زەمان. دوێنێ

٦- ناوی مەکان. کوردستان

٧- ناوی سەوت. بارە

٨- ناوی لەون. سوور

٩- ناوی عەدەد. چوار

١٠- ئیسمي صفه. پانی

١١- ئیسمی طعم. تاڵی

١٢- ئیسمی مەصدەر. بوون، چوون

١٣- ئیسمی فاعل. ببڕ، بکوژ

١٤- ئیسمی مەفعوول. فرۆشیاگ

١٥- صیغەی مبالغه. گرینۆک

١٦- صفەی مشبه. درێژ، کۆتا

١٧- ئیسمی معنی. هۆش

١٨- ئیسمی ضمیر. ئێمە

١٩- ئیسمی ئیشارە. ئەم

٢٠- ئیسمی کنایه. (فلان، فیسار....)

جـ - مامۆستا خاڵ. لە فەرهەنگەکەیدا ناو دەکات بە دوو بەشەوە:

١- عام (تێکرا)، وەک: دار، بەرد، پیاو.

٢- خاص (تایبەتی)، وەک: نەریمان، کرماشان.

د- نووری عەلی لە ڕێزمانەکەیدا (بەرگی دووەم)، ناو لە رووی مەعناوە دەکات بەم بەشانەوە:

١- ناوی تایبەتی: شاسوار

٢- ناوی گشتی: شار

٣- ناوی مادی: دەرگا، زێڕ

٤- ناوی مەعنەوی: ئازایی، بەختیاری

٥- ناوی تاک: منداڵ

٦- ناوی گەل: مەڕان (ئەم مەڕانە)

هـ- كتێبی دەستووری زمانی فارسی بۆ پۆلی یەكەمی ناوەندی، ناوی لە رووی مەعناوە كردووە بە شەش بەشەوە:

١- اسمی عام

٢- اسمی خاص

٣- اسمی ذات

٤- اسمی معنی

٥- اسمی مفرد

٦- اسمی جمع

و- لە رێزمانی ئینگلیزیدا (ئەمە بۆ نموونە لە زمانەكانی رۆژاوا، تاكو روون بێتەوە لەو زمانانەشدا ناو لە رووی واتاوە دەكرێت بە چەند بەشەوە) كراوە بەم بەشانەی خوارەوە

١- الاسم العام Common Noun

٢- الاسم المعنوی Abstract Noun

٣- الاسم المادی Concrete Noun

٤- اسم العلم Proper Noun

٥- اسم الجمع Collective Noun

پاش نمایش و بەراوردكردنیان لەگەڵ زمانی كوردیدا، ناو كرا بە سێ بەشەوە:

١- ناو لە رووی (مفهوم، مضمون) پەراوێزەوە، واتە چەند تاكان دەگرێتەوە، ئەمیش دەكرێت بە سێ بەشەوە:

آ- ناوی گشتی (عام): مەڕ، كوڕ، شار.

ب- ناوی تایبەتی (خاص، علم): هەڵەبجە، نەسرین، تانجەرۆ.

جـ- ناوی كۆمەڵ (اسم الجمع): لەشكر، پۆل، گەل.

٢- ناو لە رووی زایەندەوە[1] (جنسەوە). ئەمیش دەكرێت بە چوار بەشەوە:

---

(١) وشەی (زایەند) بە واتای (جنس، Sex) جەلادەت بەدرخان بەكاری هێناوە بە دوا ئەودا رەشید كورد و نووسەرانی تریش بەكاریان هێناوە.

آ- ناوی نێرینە: ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا هەر بۆ زایەندی نێر دانرابێت، وەک:
پیاو، ئەسپ، کەڵەشێر، پیرۆت، بەران.

ب- ناوی مێیینە: ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا هەر بۆ زایەندی مێ دانرابێت، وەک:
ماین، پوور، مریشک، کچ، جێڵ، مەڕ، ژن.

جـ- ناوی دوو لایەن (دوو زایەند): ئەو ناوەیە کە بۆ نێر و مێ بەکار دێت، وەک:
کەو، گیشک، وەستا، شاگرد، کاوڕ، بەرگدروو، دۆست، دوژمن.

هەندێ جار ناوی دوولایەن (دووزایەند) لە ڕێی بەکارهێنانی وشەیێکەوە لەگەڵیدا، بەلایەکدا دەخرێت و زایەندی بۆ دیار دەکرێت وەک:

| ناوی دوو لایەن | بۆ نێرینە | بۆمێیینە |
|---|---|---|
| گیسک | گیسکەنێر | گیسکەمێ |
| سەگ | گۆڵەسەگ | دێڵەسەگ |
| کەو | نێرەکەو | ماکەو |

د- ناوی بێ لایەن (بێ زایەند): ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا زایەندی نێر و مێی نییە، وەک: دار خانوو، هاوار، نوێن، ڕۆیشتن، خوری، خواردەمەنی.

تێبینی:

لە شێوەی ژووروودا (کرمانجی) هەموو ناو بە ئیزافەکردنی ئامرازی نێر و مێ لە یەکتر جودا دەکرێنەوە، وەک:

هەوارا دوی گورگی (مێیینە)

سەرێ مەزن (نێرینە)

وشەی (دار) ئەگەر وشک بوو (نێر)ە، وەک دارێ گویزێ، ئەگەر سەوز بوو (مێ)یە، وەک دارا گویزێ.

هەروەها لە شێوەی خوارووشدا، بە تایبەتی خۆشناو و باڵاکەتی، لە بانگهێشتن و ئیزافەدا وەک شێوەی ژوورروو جودایی لە نێر و مێدا هەیە. جگە لەوانەش لە شێوەی سلێمانی و هەولێر و کۆیە و موکریانیشدا لە بانگهێشتندا جودایی نێر و مێ هەیە، وەک:

پووریٚ وەرە (یٚ)

کورە مەرِۆ (ە)

٣- ناو لە رووی سەربەخۆییی هەبوونەوە:

دەکریٚ بە دوو بەشەوە:

١- ناوی مادی:

هەندیٚ لە رِیٚزمانەکان بەم جۆرە تەعریفیان کردووە:

آ- رِیٚزمانەکانی کوردی[١]: وشەی (بەرجەستە)یان بۆ زاراوەکە بەکار هیٚناوە، بەم جۆرەش تەعریفیان کردووە (ئەو ناوەیە کە قەوارەیەکی هەیە و بەردەست و بەرچاو، واتە دەگیریٚت و دەبینریٚت، وەک ماست، بەفر، دەرگا، گۆشت...).

ب- رێزمانی فارسی دەبیٚژیٚت: اسمی ذات (مادی) ناوی شتیٚکە کە خۆی لەخۆیدا وجوودی هەیە، وەک درەخت، ئاو، هەوا، تەهران.

جـ- رِیٚزمانی ئینگلیزی دەڵیٚت: ناوی مادی ئەو ناوەیە کە وجوودی هەیە و دەگیریٚت، وەک: پەنیر، شیر، زیٚرِ، ئاسن.

بەڵام لیژنە بەم جۆرە تەعریفی ناوی (مادی)ی کرد:

ناوی ئەو شتەیە کە بەر هەست دەکەویٚت، وەک خویٚ، کەرە، زیٚرِ، شیر، با، دەنگ، بۆن، تریفە، بروسکە، ئاورنگ، قەل، مرۆڤ.

[ئەم تەعریفە هەموو ناویٚکی مادی دەگریٚتەوە کە چاو نایبینیٚ وەیا دەست نایگریٚ، چونکە بەر هەستیٚکی تر دەکەویٚت وەک (دەنگ).

دەمرِاستی لیژنە]

٢- ناوی معنوی (گوزارە):

آ- رِیٚزمانی کوردی[٢] زاراوەی (واتایی)ی بۆ بەکار هیٚناوە، بەم جۆرەش تەعریفی کردووە: (ئەو ناوەیە کە نابینریٚت و ناگیریٚت بەڵام بە ئەندیٚشە لە دڵدا ویٚنەی

---

(١) قوتابخانەکان.

(٢) قوتابخانەکان.

بۆ دەکێشرێت و هەستی پێ دەکرێت، وەک کوردایەتی، باوەڕ، شەرم، زانین...)

ب- مەردۆخ، تەنیا ئەوەندە دەڵێت (بۆ ناسینی گوزارە دانراوە، وەک هۆش، زانست، جەنگ، برسێتی).

ج- لە ڕێزمانی ئینگلیزیدا بەم جۆرە تەعریفی ناوی مەعنەوی (مجرد) کراوە: «ئەو واژەیەیە کە حاڵێکی موعەیەن وەک (نەخۆشی) یاخود چۆنیەتییەکی تایبەتی وەک (جوانی) ڕادەگەیەنێت و بە دەست ناگیرێت و بە بیر و خەیاڵدا دێت وەک: ڕەشایی، تاریکی، بەختیاری، نەخۆشی، پیاوەتی، هێز».

د- لە ڕێزمانی فارسیدا ئەم تەعریفەیان بۆ داناوە: ناوی مەعنا گوزارەیەک دەگەیەنێت کە وجوودی لە شتی تردایە و ناوی حاڵەتێک وەیا سیفەتێکە، وەک: هۆش، ڕەشایی، ستەم، خەم، نەخۆشی، دەستکورتی.

لیژنە ویستی بە پێی باوەڕی خۆی تەعریفێکی باشتر و گونجاوتر لەگەڵ واتای (ناوی گوزارە - معنی - مجرد)دا بدۆزێتەوە. دوای بەلاوەنانی گەلێک پێشنیاز ئەم تەعریفەی پەسند کرد: ناوی گوزارە ناوی شتێکە کە بوونی سەربەخۆی نییە بگرە لە شتی بەرهەست وەیا لە بیر و خەیاڵ (تصور)دا پەیدا دەبێت وەک: پیاوەتی، هێز، چاکە، جوانی، نەخۆشی.

[ڕوونکردنەوە:

ڕازی نەبوونی لیژنە بەو تەعریفانە، سەرەڕای ئەوە کە تەعریفەکان هەموو ناوەکانی گوزارە ناگرنەوە، لەوەشەوە دێت کە داڕشتنیان لە هی تەعریف ناکات کە دەبێ دەست لەسەر سروشتی تەعریفکراوەکە دانێت، بەڵکو پتر لە هەڵنانی سنوورێک دەکات بە دەوری موفرەداتی تەعریفکراوەکەوە بەڵام هەردوو سەری ئاڵقەی سنوورەکەش نەگەیشتوونەوە یەکتر.

مەبەس لە «هەست»یش ئەو پێنج هەستە مەشوورەکەی (دیتن، بیستن، چێشتن، بۆنکردن، هەستی پێست - لمس -)ە، بەو پێیە هەر شتێک بەر یەکێک وەیا پتر لەو هەستانە بکەوێت دەبێتە ناوی مادی، کە هەر هەستیش نەکەوت و بە بیر و خەیاڵ زانرا دەبێتە ناوی گوزارە.

وا دەبێ بە پێی ئەم تەعریفە هەندێک شت هەڵبگرێ پێی بگوترێ ناوی مادی و ناوی گوزارە وەک (جەنگ). ئەوەی ڕاستی بێ لە هەموو تەعریفەکاندا ئەم دوولایییە پەیدا دەبێ بەڵام من قسەم لەگەڵ تەعریفی لیژنەیە. بە کورتی دەڵێم هەریەک لەو ناوە دوولایییانە کە ساغ بووەوە بەر هەستێک دەکەوێ، دەبێتە ناوی مادی هەرچەند بە دەست نەگیرێ وەیا قورسایی نەبێ وەیا هیچ جۆرە بوونێکی مادی نەبێ وەک (بێن، ڕەنگ).

لەم کورتەیەی قسەکەمدا دەمەوێ بڵێم کە هات و (بوونی مادی) کرا بە مەرج بۆ (ناوی مادی) ئەوسا تەعریفی لیژنە دادەمێنێ لە عاست ئەو مەرجەدا.

دەبێ ئەوەش بزانین ئەگەر (مادەبوون) کرا بە مەرج گەلێک جاران بڕیاردان بۆ مادە بوون و نەبوونی شتان کارێکی ئاسان نابێ، بە نموونە وشەی (دەنگ) کە دەلالەتی شتێکی هەیە بەر هەست دەکەوێ بە پێی تەعریفی لیژنە دەبێتە ناوی مادی، بەڵام ساغکردنەوەی (مادیبوون و مادی نەبوونی) دەنگ هەڵدەگرێ دەمەتەقەی دوور و درێژی لەسەر بکرێ و هەندێک بڵێن چ وجوودی مادی لە دەنگدا نییە و کەسانی تریش بڵێن چونکی دەنگ لە شەپۆل و لەرانەوەی هەوا وەیا مادەیێکی تر پەیدا دەبێ شتێکی (مادی)یە.

وا هەیە ناوێکی گوزارە لە ناوێکی ترەوە وەردەگیرێ کە ئەویش هەر گوزارەیە وەک چاوگی (ترسان) کە لە (ترس)ەوە هاتووە. لەمەدا چ دژێیک پەیدا نابێ لەگەڵ تەعریفەکەی لیژنەدا.

[دەمڕاستی لیژنە]

ناوی گوزارە لە بنەڕەتدا دوو جۆری هەیە:

١- بنجی: ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە هەر لە بنچینەدا بۆ گوزارە دانراون وەک: باوەڕ، جەنگ، هۆش، زانین، ترس، مەرگ.

٢- دروستکراو: ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە لە وشەیێکی ترەوە وەرگیراوە بە هۆی ئامراز وەیا دارشتنێکی تایبەتییەوە. بە زۆریش لە ناو و ئاوەڵناوەوە وەردەگیرێت لە رێی بەکارهێنانی پاشگرەوە:

أ- دروستکردنی لە ناوەوە:

کورد + ایەتی = کوردایەتی

پیاو + ەتی = پیاوەتی

کوڕ + ێنی = کوڕێنی

ب- دروستکردنی لە ئاوەڵناوەوە:

جوان + ی = جوانی

ڕەش + ی = ڕەشی

ڕەش + ایی = ڕەشایی

دۆست + ی = دۆستی

دۆست + ایەتی = دۆستایەتی

خراپ + ە = خراپە

پوختەی باسی ناو ئەمەی خوارەوەیە:

یەکەم - ناو لە رووی فۆرمەوە:

أ- ناوی سادە.

ب- ناوی ناسادە:

١- لێکدراو.

٢- دارڕژاو (دروستکراو)

دووەم - لە رووی گوزارەوە:

١- ناوی گشتی

٢- ناوی تایبەتی — ناو لە ڕووی مەفهوومەوە (١)

٣- ناوی کۆمەڵ

٤- ناوی نێر

٥- ناوی مێ                    ناو لە ڕووی زایەندەوە (٢)

٦- ناوی دوو لایەن

٧- ناوی بێ لایەن

٨- ناوی مادی                    ناو لە ڕووی سەربەخۆیی هەبوونەوە (وجوود مستقل) (٣)

٩- ناوی گوزارە

آ- بنجی.

ب- دروستکراو.

[ڕوونکردنەوە:

زاراوەی (لە ڕووی مەفهوومەوە) زاراوەیێکە لە لایەن هەندێک زمانزانەوە بەکار هاتووە، کە ئەندامێکی لیژنەش لەوانە، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەس بە پێی لێکدانەوەی تایبەتی ئەو کەسانەوە. لێرەدا مەبەس لە (مفهوم) ئەوەیا ئایا تاکە ناوێک چەند تاکی وەک خۆی دەگرێتەوە، کە گوتت (ئازاد) یەک ئازادت مەبەسە. کە گوتت (لەشکر) تێکڕای ئەو کەسانە و ئەو شتانەت مەبەسە کە لە واتای (لەشکر)دا هەیە. پێشتر لەگەڵ (مفهوم)دا وشەی (پەڕاوێز)یش بەکار هات بۆ ڕاگەیاندنی ئەم لایەنە.

دەمڕاستی لیژنە]

٢

# ڕاناو - ضمیر

ڕاناو لە گەلێک سەرەوە باس دەکرێت، پێ بە پێ لێیان دەکۆڵرێتەوە و بە پێی بیروباوەڕی لیژنە روون دەکرێنەوە:

یەکەم: ڕاناو لە رووی زاراوەوە

هەتا ئێستا نووسەرانی کورد لە بری (ضمیر- Pronoun) ئەم زاراوەی خوارەوەیان بەکارهێناوە:

آ- مامۆستا سەعید سدقی: زاراوەی «ضمیر»ی بەکار هێناوە و بەم شێوەیەش تەعریفی کردووە (ضمیر لفظیکە جیگای اسم دەگرێت).

ضمیریش دوو نوعە:

١- ضمیری متصل - وەکو بە قەڵەمت دەنوسم.

متصلیش دەکا بە دوو بەشەوە:

أ- ئاشکرا وەکو: خوێندم.

ب- شارراوە وەکو: نوست.

٢- ضمیری منفصل وەکو من خوێندم، ئەو هەڵستا.

مامۆستا سەعید سدقی هەر ئەمەندە لەسەر ڕاناو دواوە، لە هەموو ڕوویێکیشەوە پەیڕەوی زمانی عەرەبیی کردووە کە ئەوسا بۆ ئەو تاکە سەرچاوەی لێکۆڵینەوە بووە.

ب- لە کتێبی ڕێزمانی قوتابخانەکاندا (ڕاناو) بەکار هاتووە و بەم جۆرەش تەعریف کراوە:

ڕاناو ئەو وێژەیەیە جێی ناوێک دەگرێت وەکو (ئەی کرم) و دەشکرێ بەم بەشانەی خوارەوە:

١- ڕاناوی کەسی - ئەمیش دوو جۆرە:

أ- کەسی لکاو وەکو: کەی ئەڕۆیت (یت)

ب- کەسی جودا وەکو: من، ئێمە، ئەوان.

٢- ڕاناوی خۆیی، وەکو (من خۆم هاتم) بۆ تەوکیدی ناو یا ڕاناو بەکار دەهێنرێت.

٣- ڕاناوی ئیشاری وەکو (ئەمە، ئەوە...)

٤- ڕاناوی گەیەنەر وەکو (ئەو کچەی کە لەگەڵمدا دەڕۆیشت خوشکم بوو) لەم ڕستەیەدا وشەی (کە) ڕاناوەکەیە.

٥- ڕاناوی پرسیاری، وەکو: کێ، چۆن، چلۆن، کوا، کام، کەی، کوێ، چی، چما، چەند... هتد.

٦- ڕاناوی نادیار وەکو: یەکێ، کەس، فلان، فیسار، کابرا، هین، هەرامە..

٧- ڕاناوی هەیی: وەکو (هی من، هی تۆ..).

جـ- مەردۆخ لە لاپەڕە (٢٠)ی بەشی یەکەمی فەرهەنگەکەیدا بۆ (ضمیر) وشەی (کێشک)ی بەکار هێناوە.

د- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردی - جزمی یەکەم بەغدا ١٩٢٩، لاپەڕە ٢٨دا بەم جۆرە باسی ڕاناو دەکات، زاراوەی (بۆناو)یشی بەکار هێناوە:

(بۆناوی کەسی لە گەرداندا بۆ پێشاندانی باس لێکراو لە صیغە و دەم زیاد ئەکرێن، وەکو لە فقرە ٢٤٩دا ووتبوومان ئەمانە دوو چەشنن:

١- بۆ ناوی کەسی سەربەخۆ وەک (من، ئێمە).

٢- بۆ ناوی کەسی پێوەنووساو وەک (ئەوانە هاتن- ن-). بۆ ناو بەم جۆرە دابەش دەبێ:

١- بۆ ناوی کەسی (من، تۆ).

٢- بۆ ناوی ئیشاری (ئەم، ئەمە، ئەو، ئەوە..).

٣- بۆ ناوی لێکدەر (کە، ی کە. ئەو کەسە کە ڕۆیشت، ئەو کەسەی کە...).

٤- بۆ ناوی مبهم (یەکێ، کەسێ، کام، هیچ، کابرا، هین..).

٥- بۆ ناوی پرسی (کێ، چەند، کام، چی، کوێ..).

٦- بۆ ناوی خۆیی (خۆم - خۆمان، خۆت- خۆتان).

٧- بۆ ناوی ملکی (هی من، هی ئێمه..).

هـ- مامۆستا سادق بەهائەدین لە موحازەرەی خۆیدا ڕاناوی کردووە بە (٨) بەشەوە لەمەشدا ڕەچای ئەو کتێبە گرامێرەی کوردی کردووە کە بە شێوەی کرمانجی نووسراون:

١- جێ ناڤێت کەسی

| | |
|---|---|
| ئەز، تو، ئەو | بۆ کاری تێ نەپەڕ |
| ئەم، هین، ئەو | |
| من، تە، وێ - وی | بۆکاری تێپەڕ |
| مە، وە، وان | |

٢- جێ ناڤێت هەیی: یێ من، یامن، یێن من.

٣- جێ ناڤێت خۆیی: خۆ.

٤- جێ ناڤێت نیشانی: ڤی، ڤێ، ڤان، وی، وێ، وان، ئەف - ئەو، ئەڤان، ئەوان.

٥- جێ ناڤێت پێ گەهـ: یێ کۆ، یاکۆ، یێن کۆ.

٦- جێ ناڤێت پرسینێ: کی، کێ، چ، کا.

٧- جێ ناڤێت بێ هێل: ئێ، یێ.

٨- جێ ناڤێت نەپەنی (مبهم).

و- دەستووری زمانی فارسی دەڵێت: ضمیر وشەیێکە دەبێتە جێنشینی (ناو) وەکو (حەسەنم دیت و ئەوم تێ گەیاند).

ضمیریش دابەش دەکات بەم بەشانەی خوارەوە:

١- ضمیری شەخسی وەکو (من، ئێمە)

٢- ضمیری ئیشارە وەکو (ئەمە، ئەوە).

٣- ضمیری موبهەم وەکو (یەکێک، هەر، هەر کەس، تێکڕا، فلان، هیچ کەس، هەموو، هەموو کەس، هەموو شت).

٤- ضمیری پرس وەکو (کێ هات؟ کەی هات؟ چۆن هات؟ لە کوێوە هات؟).

تێبینی:

ئەم وشە و ڕستانە لە فارسییەوە وەرگێڕدراونەتە سەر کوردی.

ز- لە دەستووری زمانی رووسی - بەرگی یەکەم، مۆسکۆ ١٩٦٠ لاپەڕە ٢٦ بەم جۆرە ڕاناوی دابەش کردووە:

١- ڕاناوی کەسی وەک (من، ئێمە..).

٢- ڕاناوی هەیی وەک (هی..).

٣- ڕاناوی ئیشاری وەک (ئەمە، ئەوە..).

٤- ڕاناوی نادیار وەک (کەسێک، شتێک، یەکێک).

٥- ڕاناوی نەفی (هیچ کەس، هیچ شت).

٦- ڕاناوی تفصیل (تعیین) وەک (هەموو، هەریەکە).

٧- ڕاناوی پرسیار وەک (کێ، کەی، کوێ..).

تێبینی:

ئەم بەشەی دەربارەی زمانی رووسی لەلایەن د. نەسرین فەخرییەوە وەرگەڕاوەتە سەر کوردی.

ح- لە دەستووری زمانی ئینگلیزیدا دەڵێت: ڕاناو ئەو وشەیەیە کە جێی ناو دەگرێتەوە و لە بری ئەو بەکار دێت بۆ ئەوەی لە ڕستەدا دووبارە نەکرێتەوە، ڕاناویش دەکا بەم بەشانەوە:

١- ڕاناوی کەسی (ئێمە، ئەوان..).

٢- ڕاناوی تملک (هی من، هی ئەو..).

٣- ڕاناوی پرسیاری (کەی، چۆن، چەند..).

٦- ڕاناوی لێکدەر (Which, Who)

تێبینی:

ئەم بەشەی کە باسی ڕاناو لە زمانی ئینگلیزی دەکات لە لایەن لیژنەوە لە کتێبی دەستووری زمانی ئینگلیزییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر کوردی.

دوای ئەم نمایشە لیژنە کەوتە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی لە بارەی

(ڕاناو)ەوە. لە سەرەتاوە ویستی تەعریفێک بۆ ڕاناو دانێت کە وا بەتەواوی بیگرێتەوە و نەهێڵێت شتی تری تێکەڵ بێت، واتە لە سنووری دەسەلاتدا تەعریفێک بێت کە پێی دەگوترێ (جامع و مانع) بۆ ڕاناو. لەم ڕووەوە، دوای هەڵسەنگاندنی ئەو تەعریفانەی لە نمایشەکەدا بۆ ڕاناو دانرابوون، لیژنە هەموویانی بەلاوە نا، چونکە بە پێی بڕوای تێکڕای ئەندامانی لیژنە هیچ کامێکیان دەست نادات ببێت بە تەعریف بۆ (ڕاناو) لە ڕێزمانی کوردیدا.

بۆ دۆزینەوەی تەعریف لیژنە کەوتە سەر موناقەشە، موناقەشەکەشی بە درێژاییی دوو کۆبوونەوە بەردەوام بوو. لە ئەنجامدا دەرکەوت ئەندامان لە یەک باوەڕدا نین بەرانبەر (ڕاناو) و تەعریفەکەی. لەبەر ئەمە گیروگرفتەکەی خستەوە بەردەم ئەنجومەنی کۆڕ تاکو بەپێی دەسەلاتی خۆی گرفتەکە بڕەوێنێتەوە. بەلام ئەنجومەن بڕیاری دا خۆی تێکەڵ بە کاری لیژنە نەکات هەتا ئەو کاتەی لێی دەبێتەوە.

لە پاش ئەم بڕیارەی ئەنجومەنی کۆڕا لیژنە دوو کۆبوونەوەی تریشی بەسەر برد بۆ تاکە مەبەستی دۆزینەوەی تەعریفێک کە هەموو ئەندامان پێی ڕازی بن، بەلام هەر نەگەیشت بە ئەنجامێک. لەبەر ئەمە وای پەسند کرد جارێ دەست بکات بە لێکۆڵینەوە لە بەشی (ڕاناوی کەسی) کە هەموو نووسەران لە هەموو زماناندا لە بارەیەوە یەک باوەڕن. جوداوازیی باوەڕیش لەبارەی بەشەکانی تری (ڕاناو) و دەمەتەقە لەسەر تەعریفی ڕاناو خرایە دوای لێبوونەوە لە باسی ڕاناوی کەسی.

[تێبینی و ڕوونکردنەوە

چۆنیەتیی بەکارهێنانی بیروباوەڕ لە لێکۆڵینەوەدا کە لە کۆڕی زانیاری کورد بووە بە ڕچەی ئیشکردن، دیاردەیێکی دیمۆکراسی ڕەفتارە لە سەرلەبەری ئەو چالاکییانە کە پێوەندییان بە کۆڕەوە هەیە. هەر ئەم ئازادییەی بیروباوەڕە وای کرد لیژنە تا ڕادەی لەکاروەستان خۆی پێوە ببەستێتەوە هەرچەند لەمەشدا ئەرکی مادیی کۆڕ بەرەو زیادی دەڕوات، ئەم گێڕانەوەی گرفتە بۆ بەردەمی ئەنجوومەنی کۆڕ جارانی تریش ڕووی داوە بەلام هەموو جارێک ئەنجوومەن گرفتەکەی داوەتەوە بە لیژنە. ئەوەی ڕاستی بێ درێژ خایاندنی دەمەتەقە و لێکۆڵینەوەی لیژنە لە باسی (ڕاناو)

و نەگەیشتنی ئەندامانی لیژنە بە بیروباوەڕێکی یەکگرتوو وای کرد من گوتارێکی ١٢٠ لاپەڕەیی لەسەر هەندێک باری (ڕاناو) بنووسم و لە گۆڤاری کۆڕ (بەرگی دووەم - بەشی یەکەم)دا بڵاوی بکەمەوە لە ژێر ناونیشانی (سوورێکی خامە بە دەوری ڕاناودا). لەو گوتارەدا، هەر چەند گەلێک باری ڕاناو و بەشەکانی بەر لێکۆڵینەوە نەکەوتن، دیسانەوە بایی ئەوەی بیروباوەڕی گشتیم لەم باسەدا روون بێتەوە لەسەری دواوم.

دەمڕاستی لیژنە]

ڕاناوی کەسی (الضمير الشخصي)

لە سەرەتای باسەوە دەبێ بڵێین ئەم ڕاناوە دەکرێ بە دوو بەشەوە:

یەکەم - ڕاناوی کەسی جودا

نووسەران ئەم زاراوانەی خوارەوەیان بۆ کار هێناوە:

١- سەعید سدقی - منفصل.

٢- توفیق وەهبی - سەربەخۆ.

٣- مەردۆخ - کێشک نەلکیاگ (لاپەڕە ٢٠ لە بەشی یەکەمی فەرهەنگەکەیدا).

٤- نووری عەلی ئەمین - جوێ.

٥- کتێبەکانی ڕێزمانی قوتابخانەکان - جوێ.

(ف - ٣)

لیژنە زاراوەی «جودا»ی پەسند کرد هەم لەبەر رەسەنیی وشەکە کە بەوشەی «جوێ» بگیرێ و هەم لەبەر زۆر بەکارهێنانی لە ئاخاوتندا.

[روونکردنەوە:

کە بگەڕێیتەوە بۆ ئەو گوتارەی - سوورێکی خامە بە دەوری ڕاناودا - دەبینی بیروباوەڕی من لەوێدا دەربارەی دەوری ڕاناو بە تێکڕایی و ئەوەی پێی دەڵێن «ڕاناو لکاو» بە تایبەتی، بەرەو زاراوەکەی توفیق وەهبی پتر دەڕوا هەرچەند من لە گوتارەکەمدا

دوو زاراوەی (ڕاناوی مەند و ڕاناوی چالاک)م بەکار هێناوە. گونجانەکەی باوەڕی من لەگەڵ زاراوەکەی مامۆستا وەهبی لەوەوە دێت کە زاراوەی «لکاو و نەلکاو» وەیاخود «جودا و لکاو» یەکجار لە سروشت و دەوری ڕاناو دوور دەکەوێتەوە، بەڵام وشەی «سەربەخۆ» چونکە موقارەنەی ڕواڵەتی (سەربەخۆیی و ناسەربەخۆیی) دەکاتە شتێکی ناوخۆیی نێوانی هەر دوو جۆرە ڕاناوەکە و وەک (جودا و لکاو) ڕاناوە لکاوەکە ناکا بە سێبەر و تارمایی ئەو شتەی پێیەوە دەلکێ بۆیە دژایی پەیدا ناکات لە نێوان سروشت و دەوری ڕاناوەکە و زاراوەکەدا، هەر هێندە هەیە زاراوەکە لە ئاست ئەو سروشت و دەورەدا کورت دێنێ، کورتهێنانیش بە قەدەر دژایی نابێتە عەیب، من کە پەیڕەوی لیژنەم کرد لەم زاراوەیەدا دژی بیروباوەڕی خۆم، پشت ئەستوور بووم بەو گوتارە دوور و درێژەی (سووڕێکی خامە..) بەوەدا کات و چالاکیی لیژنەشم پاراست کە خەریکی دەمەتەقەی بێ لزوومم نەکرد لەو رووەوە کە من بیروباوەڕی خۆم تۆمار کردووە ئیتر بۆچی جارێکی تریش لیژنەی پێوە خەریک کەم و بیوەستێنم.

دەمڕاستی لیژنە]

ڕاناوی کەسی جودا ئەم وشانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

١- کەسی یەکەم:

أ- تاک «من، ئەمن، ئەز، م»

ب- کۆ «ئێمە، ئەمە، مە، ئەم»

٢- کەسی دووەم:

أ- تاک «تۆ، ئەتۆ، توو، ئەتوو، تە»

ب- کۆ «ئێوە، ئەوە، ئەنگۆ، هوین، وە، هەوە، هنگۆ، هنگ»

٣- کەسی سێیەم:

أ- تاک «ئەو، ئەوێ، ئەوی، وێ، وی»

ب- کۆ «ئەوان، وان، وا، ئەو، ئانە»

بەکارهێنانی ئەم بەشە ڕاناوە لە شێوەی کرمانجیی سەروودا پێویستی بەم ڕوونکردنەوەیە هەیە:

ڕاناوەکە دەکرێ بە دوو کۆمەڵەوە کە هەر کۆمەڵەی جۆرە بەکارهێنانێکی هەیە:

کۆمەڵی یەکەم:

کە بریتییە لە «ئەز، توو، ئەو» بۆ کەسی تاک و «ئەم، هوین - هنگ، ئەو» بۆ کەسی کۆ، لەگەڵ ئەم کارانەدا بەکار دێن:

١- تێ نەپەڕ:

أ- ڕابردوو: «ئەز چووم، توو چووی، ئەو چوو» بۆ تاک.

«ئەم چوون - چووین -، هوین چوون، ئەو چوون» بۆ کۆ.

ب- حازر: «ئەز دچم، توو دچی، ئەو دچە - دچیت -» بۆ تاک.

«ئەم دچن - دچین -، هوین دچن، ئەو دچن» بۆ کۆ.

جـ- داهاتوو (مستقبل): «ئەز دێچم، توو دێچی، ئەو دێچیت» بۆ تاک.

«ئەم دێچن - دێچین-، هوین دێچن، ئەو دێچن» بۆ کۆ.

٢- تێپەڕ:

أ- حازر: «ئەز دخۆم، توو دخۆی، ئەو دخوە - دخوەت -» بۆ تاک.

«ئەم دخۆن - دخۆین -، هوین دخۆن، ئەو دخۆن» بۆ کۆ.

ب- داهاتوو: «ئەز دێخۆم، توو دێخۆی، ئەو دێ بخوە - دێ بخۆت -» بۆ تاک.

«ئەم دێخۆن - دێخۆین -، هوین دێخۆن، ئەو دێخۆن» بۆ کۆ.

کۆمەڵی دووەم:

کە بریتییە لە «من، تە، وی - وێ»ی بۆ تاک و «مە، وە، وان» بۆ کۆ، لەگەڵ ئەم کارانەدا بەکار دێت:

أ- تێپەڕی ڕابردوو: «من خار، تەخار، وی - وێ خار» بۆ تاک.

«مە خار، وە خار، وان خار» بۆ کۆ.

ب- کاری (ویستن): ئەم کارە لە هەموو کات و بۆ هەموو کەسەکان یەک صیغەی هەیە:

١- ڕابردوو «من ڤیا، وی - وێ ڤیا» بۆ تاک.

«مه ڤیا، وەڤیا، وان ڤیا» بۆ کۆ.

٢- حازر: «من دڤێ - دڤێت، ته دڤێ - دڤێت، وی - وێ دڤێ - دڤێت» بۆ تاک.

«مه دڤێ - دڤێت، وه دڤێ - دڤێت، وان دڤێ - دڤێت» بۆ کۆ.

٣- داهاتوو « من دێڤێ- دێڤێت، ته دێڤێ - دێڤێت، وی - وێ دێڤێ - دێڤێت» بۆ تاک.

«مه دێڤێ - دێڤێت، وه دێڤێ - دێڤێت، وان دێڤێ - دێڤێت» بۆ کۆ.

ج- کاری هەبوون (تملک): ئەم کارەش لە هەموو کات و بۆ هەموو کەسەکان یەک صیغەی هەیە:

١- ڕابردوو «من هەبوو، ته هەبوو، وی - وێ هەبوو» بۆ تاک.

«مه هەبوو، وه هەبوو، وان هەبوو» بۆ کۆ.

٢- حازر «من هەیە، ته هەیە، وی- وێ هەیە» بۆ تاک.

«من هەیە، وه هەیە، وان هەیە» بۆ کۆ.

٣- داهاتوو « من دێ هەبت - دێ هەبە، ته دێ هەبت، وی - وێ دێ هەبت» بۆ تاک.

«مه دێ هەبت، وه دێ هەبت، وان دێ هەبت» بۆ کۆ.

ئەم کارەی «هەبوون» ئەگەر بە واتای «بوون - فعل الکینونیة» بەکار بێت، دەبێتەوە کاری تێ نەپەڕ و کۆمەڵەی یەکەمی ڕاناوەکانی بۆ بەکار دێت لە هەموو کات و بۆ هەموو کەسەکان وەک:

«ئەز هەمە، ئەم هەنە»

دووەم: ڕاناوی کەسی لکاو:

نووسەران ئەم زاراوەیان بۆ بەکار هێناوە:

١- سعید سدقی: متصل.

٢- توفیق وەهبی: پێوەنووساو.

٣- مەردۆخ: کێشک لکیاگ.

٤- نووری عەلی ئەمین: لکاو.

٥- کتێبی قوتابخانەکان: لکاو.

له سەرەتای باسەوە گوتمان بەشی یەکەمی راناوی کەسی ئەو وشانەن کە پێیان گوترا «جودا». ڕاناوی کەسی جودا هەر خۆیەتی جۆرێکی تری هەیە پێی دەگوترێ «ڕاناوی لکاو». نووسەران زاراوەی «لکاو، نووساو، پێوەنووساو»یان بۆ بەکار هێناوە کە هەموویان ڕاستەوخۆ لە «الضمیر المتصل»ی عەرەبییەوە وەرگیراون. لیژنە جارێ زاراوەی «لکاو»ی پەسند کرد لەمەشدا پەیڕەوی زۆرینەی نووسەرانی کوردی کرد.

بە ئیستیقرا لە شێوە ئاخاوتنەکانی کوردی دەردەکەوێت، ڕاناوە جوداکان کە دەگۆڕێن بۆ شکڵی «لکاو» دەبن بەمانەی خوارەوە:

أ- کەسی یەکەم:

١- تاک: دەبێتە «م» وەک: ڕۆیشتم، دەڕۆم، خواردم، برام، لێم گەڕێ...

٢- کۆ: دەبێتە «مان، ین، ن» وەک:

خواردمان (ڕابردووی تێپەڕ) - نەمانخوارد، دەمانخوارد، بمانخواردایە.

برامان (مضاف الیه).

لێمان دیارە (لەبەر حوکمی Preposition).

لە هەندێ جێگەی کوردستانی خوارووا (وەک پژدەر) لە جیاتی (مان) تەنیا پیتی (ن) بەکار دێت وەک (ئەمە گوتن، بران نین، لێن مەگرە).

دەخۆین، دەڕۆین، هەڵدەستین (کاری موزاریع).

ئێمە کوردین (ڕستەی بێ کار).

ب- کەسی دووەم:

١- تاک: دەبێتە «ت، ی - یت».

تۆ کردت (ڕابردووی تێپەڕ) - نەتکرد، دەتکرد، بتکردایە.

برات هات (مضاف الیه).

پێتەوە دیارە (لەبەر حوکمی Preposition).

دەکەی، دەڕۆی یاخود دەکەیت، دەڕۆیت (موزاریع بۆ تێپەڕ و تێ نەپەڕ).

تۆ کوردیت، کوردی (ڕستەی بێ کار).

٢- کۆ: دەبێتە «تان، ن، و».

خواردتان (ڕابردووی تێپەڕ) نەتانخوارد، دەتانخوارد، بتانخواردایە.

براتان (مضاف الیە).

لێتانەوە دیارە (لەبەر حوکمی Preposition)

دەکەن، دەڕۆن (کاری موزاریع)

ئێوە کوردن (رستەی بێ کار)

لە هەندێ شێوە ئاخاوتنی کوردستانی ژێرووا ڕاناوی «تان» دەبێتە «و – وو» وەک «ئەوە خواردوو، براو هات، لێوەوە دیارە».

ج- کەسی سێیەم:

لیژنە لەو درێژە پێدانەی بە لێکۆڵینەوەی لە بارەی ڕاناوەوە گرفتێکی ئەوتۆی نەهاتە بەر کە وا ڕای ئەندامانی تێدا ڕێک نەکەوێ تا گەیشتە باسکردن لە ڕاناوی لکاو بۆ کەسی دووەم و سێیەمی تاک. لێرەدا بیروباوەڕ بوو بە چەند جۆرێک. بۆ مەبەسی زاڵبوون بەسەر گرفتەکەدا ئەندامان هەر یەکەیان بیروباوەڕی تایبەتی خۆی روون کردووە.

١- دەمڕاستی لیژنە – مەسعوود محەمەد:

ڕای ئەو لە بارەی تێکڕای باسی ڕاناوەوە لە ژمارەیێکی گۆڤاری کۆڕدا بڵاو کراوەتەوە، پێویست نییە لێرەدا دووبارە بکرێتەوە.

٢- نووری عەلی ئەمین:

بەلای ئەوەوە پیتی «ت» لە کۆتاییی کاری «مضارع»ی تێپەڕ و تێ نەپەڕ بۆ کەسی سێیەمی تاک ڕاناوی لکاوە وەک:

دەخوات

دەچێت

هەروەها پیتی بزوێنی «ە» لە کاری فەرمان «أمر» بۆ کەسی دووەمی تاک، ئەویش ڕاناوی لکاوە وەک: بگرە، بکرە.

بۆ شیکردنەوەی هەموو گرفتەکە پێویستە ئەم ڕاستییانەش بخرێتە بەر چاو:

ڕاناوی لکاو کە لەگەڵ «کار» بێت دوو شێوەی هەیە وەک لەم وێنانەدا دەردەکەوێت:

وێنەی یەکەم:

| کەس | تاک | کۆ |
| --- | --- | --- |
| یەکەم | م | مان |
| دووەم | ت | تان |
| سێیەم | ی | یان |

ئەم شێوەیە لە کاری تێپەڕی ڕابردوودا بەبێ گیروگرفت بەکار دەهێنرێت وەک:

کێڵام کێڵامان

کێڵات کێڵاتان

کێڵای کێڵایان

لە حاڵەتی «اضافە»شدا هەر بەم جۆرە دێنەوە لە ڕستەدا:

پێڵاوم - پێڵاومان، پێڵاوت - پێڵاوتان... هتد.

وێنەی دووەم:

| کەس | تاک | کۆ |
| --- | --- | --- |
| یەکەم | م | ین |
| دووەم | ی(یت) | ن |
| سێیەم | - | ن |

ئەم شێوەیە لە هەموو صیغەکانی کاردا بێ گیروگرفت بەکار دێت تەنیا لە کەسی تاکی سێیەمدا نەبێت ئەم گۆڕانەی بەسەر دێت:

١- لە ڕابردووی تێ نەپەڕ و لە صیغەی ڕابردووی کارابزر «بناء للمجهول»دا دەرناکەوێت وەک:

ڕۆیشت، سووتا (ڕابردووی تێ نەپەڕ).

کوژرا، نووسرا (صیغەی ڕابردووی کارابزر).

٢- لە «مضارع»ی تێپەڕ و تێ نەپەڕی «معلوم»دا ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک لە شێوەی «ێ، ێت»دا دەردەکەوێت وەک:

| | | |
|---|---|---|
| دەچێ، دەچێت | (دە – چ – ێ، ێت | تێ نەپەڕ |
| دەخەوێ، دەخەوێت | دە – خەو – ێ، ێت | |
| دەمرێ، دەمرێت | دە – مر – ێ، ێت | |
| دەکێڵێ، دەکێڵێت | دە – کێڵ – ێ، ێت | تێپەڕ |
| دەکڕێ، دەکڕێت | دە – کڕ – ێ، ێت | |
| دەنووسێ، دەنووسێت | دە – نووس – ێ، ێت | |

٣– لە (مضارعی مجهول) ڕاناوی کەسی سێیەم لە شێوەی (ت)دا دەردەکەوێت وەک:

دەنووسرێت (دە – نووسرێ – ت)

دەخورێت (دە – خورێ – ت)

دەبینرێت (دە – بینرێ – ت)

بۆیەش لە شێوەی (ێت)دا دەرناکەوێت، چونکە (فیعلە موزریعە مەجهولەکە) کۆتاییی بەبزوێن (Vowel)ی (ێ) دێت، ئیتر ناشێ بزوێنێکی تر بەدوا ئەودا بێت بە ناچاری بزوێنێکیان دەفرتێت.

٤– بەڵام لە (فیعلی موزاریعی لازم و موتەعەدی مەعلووم)دا کە ڕەگەکانیان کۆتاییی بە بزوێن هاتبێت لە شێوەی (ات)دا دەردەکەوێت:

دەڕوات (دە – ڕۆ – ات)

دەگات (دە – گ – ات)

دەخوات (دە – خو – ات)

دەبات (دە – ب – ات)

کەسی سێیەم (هەرچەند پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی هەیە لە هەموو شێوەکانی تریشدا)، دەشێ بەم جۆرە باس بکرێت:

١– لە مازیی لازمدا دەرناکەوێت، وەک:

هات (...)

کەوت (...)

٢- له فیعلی مساعدا (له جملەی ئیسنادیدا)، وەک:

دارا مەردە (...) دەرناکەوێت.

٣- له هەموو صیغەکانی تردا له شێوەی (ێت)دا دەردەکەوێت، بەڵام هەندێ جار هەر (ێ) یا (ت) یا (ا) دەردەکەوێت، ئەمە له ڕووی ئەو تاوتووەوە هاتووە، کە بەسەر زمانەکەدا هاتووە، ئەگینا:

(ێ) کورتەی (ێت)ە.

(ا) شێوەی گۆڕاوی (ێ)کەیە، چونکە له زمانی کوردیدا، گۆڕینی پیتی (ێ) بۆ (ا) یا بە پێچەوانەوە (ا) بۆ (ێ) ڕوو دەدات وەک:

پێ پا

تا تێ

ڕێ ڕا

کێرد کارد

کەواتە (ات)ەکەی دوای کاری (دەڕوات، دەبات، دەخوات)

هەر (ێت)ەکەی دوا شێوەکانی تریەتی.

بەمەدا کورتەی ڕای نووری عەلی ئەمین کۆتایی دێت.

[وا بە چاک زانرا سادق بەهائەدین له بارەی تێکڕای (ڕاناوی کەسی له شێوەی کرمانجی سەروو) بدوێت:

دەمڕاستی لیژنە]

٣- بیروڕای مامۆستا سادق بەهائەدین دەربارەی ڕاناو (جهناڤ):

ڕاناو (ضمیر)

ڕاناوی کەسی بەزاری کرمانجی ژووروو دوو جۆرە:

جۆری یەکەمین:

ئەز، تو، ئەو بۆ تاک.

ئەم، هون (هنگ)، ئەو بۆ کۆ.

ئەم جۆرە واتە جۆری یەکەمین لەگەڵ زۆربەی کارەکان (فیعلەکان) بەکار دێن:
١- کاری بوون لە هەموو کاتەکان بە (اثبات) و بە (نفی) و پرسیارەوە.
ئەو نیشانانە کە بە کەسەکانەوە ئەبەسترێن لە کێشانی (تصریفی)ن ئەم کارە لە کاتی ئێستادا دەبنە بناغە کە بەسەر ڕەگی کارەوە دەبەسترێت کە لەگەڵ ئەم جۆرەی ڕاناوەکان بە جودا بەکار دێن وەک:

| | |
|---|---|
| ئەزم | Ez im |
| تویی | Tu yi |
| ئەوە | Ew e |
| ئەمن (ئەمین)(١) | Em in |
| هۆنن (هنگن)(٢) | Hun in |
| ئەون | Ew in |

ئەم نیشانەی (پاشگرانە) (ئم im)، (ی yi)، (ئە e)، (ئن in) لەگەڵ ڕەگی کارەکانی جۆری یەکەمین بەکار دێن کە ئەمانەن:

١- لەگەڵ کاری تێ نەپەڕی ڕابردوو لە نڤستن:

| | |
|---|---|
| ئەز نڤستم | ئەم نڤستن (نڤستین زاری بادینانی). |
| تو نڤستی | هون نڤستن |
| ئەو نڤست | ئەو نڤستن |

لە چۆن:

| | |
|---|---|
| ئەز چۆم | ئەم چۆن (چوین بەزاری بادینانی) |
| تو چۆی | هۆن چۆن |
| ئەو چۆ | ئەو چۆن |

لە کاتی ئێستە (حازر) و لە پاشی (ئایندە - مستقبل) لە نڤستن

| | |
|---|---|
| ئەز دنڤم | ئەز دێ نڤم |

---

(١) لە زاری کرمانجی بادینانە.
(٢) لە زاری کرمانجی بادینانە.

| | |
|---|---|
| تو دنقی | تو دێ نقەی |
| ئەو دنقە(دنقیت)[٣] | ئەو دێ بنقە (نقیت)[٤] |
| ئەم دنقن (دنقین)[٥] | ئەم دێ نقن (نقین)[٦] |
| هون دنقن | هۆن دێ نقن |
| ئەو دنقن | ئەو دێ نقن |

٢- لەگەڵ کاری تێپەڕەکانی ئێستە و لە پاشان لە: خواردن - خارن

| | |
|---|---|
| ئەز دخۆم | ئەز دێ خۆم |
| تو دخۆی | تو دێ خۆی |
| ئەو دخوە (خوت)[٥] | ئەو دێ بخوە (خوت - زاری بادینان) |
| ئەم دخۆن (دخوین) - زاری بادینان) | ئەم دێ خۆن (خوین - زاری بادینان) |
| هون دخۆن | هون دێ خۆن |
| ئەو دخۆن | ئەو دێ خۆن |

جۆری دووەمینی ڕاناوی کەسی ئەمانەن:

(من، تە، وی، وێ) بۆ تاک.

(مە، هەوە «وە»، ئەوان «وان، وا») بۆ کۆ.

ئەم جۆرە ڕاناوی کەسی واتە جۆری دووەمین لەگەڵ ئەم کارانەی خوارەوە بەکار دێن و نیشانە کەسییەکان (م im)، (یی yi)، (ە e) بۆ تاک و (ئن in) بۆ کۆ بەکار ناهێن:

١- کاری یایدەری هەبوون لە هەموو کاتدا:

کاتی ئێستە:

---

(٣) ئەو دنقت (دنقیت) لە زاری کرمانجی بادینانی.

(٤) ئەو (دێ نقیت) لە زاری کرمانجی بادینانی.

(٥) ئەم دنقن (دنقین) لە زاری کرمانجی بادینانی.

(٦) ئەم دێ نقین لە زاری کرمانجی بادینانی.

(٧) ئەو دخوت لە زاری کرمانجی بادینانی.

وێ هەیە – هەنە (کە لە یەک شت پتر بێت)

من هەیە – هەنە

تە هەیە – هەنە

وی هەیە – هەنە

مە هەیە – هەنە

لە بۆ کۆ هەوە (وە) هەیە – هەنە

وان (وا) هەیە – هەنە

کاتی ڕابردوو:

من هەبوو – هەبوون

تە هەبوو – هەبوون

وی هەبوو – هەبوون

وێ هەبوو – هەبوون

مە هەبوو – هەبوون

لە بۆ کۆ وە هەبوو – هەبوون

وان هەبوو – هەبوون

٢– لەگەڵ کاری تێپەڕی ڕابردوو (ماضی متعدی) لە شکاندن:

من شکاند – شکاندن

تە شکاند – شکاندن

وی شکاند – شکاندن

وێ شکاند – شکاندن

مە شکاند – شکاندن

لە بۆ کۆ وە شکاند – شکاندن

وان شکاند – شکاندن

له خواردن: من خوار (خار) - خوارن، مه خوار - خوارن.

٣- لەگەڵ کاری داخواز (طلب)ی ڤیان (ویستن):

کاتی: ڕابردوو:

| | |
|---|---|
| | من ڤیا - ڤیان |
| | ته ڤیا - ڤیان |
| | وی ڤیا - ڤیان |
| | وێ ڤیا - ڤیان |
| | مه ڤیا - ڤیان |
| بۆ کۆ | وه ڤیا - ڤیان |
| | وان ڤیا - ڤیان |

کاتی ئێستە: من دڤێت (دڤێ - دڤێتن)، مه دڤێت (دڤێ، دڤێتن).

کاتی له پاشا: من دێ ڤێت (دێ ڤێ - دێ ڤێتن) مه دێ ڤێت (دێ ڤێتن)

لەم جۆرەی دووەمین راناوی کەسی دەبنە ڕاناوی هێیتی (تملک) شت وەک:

| | |
|---|---|
| مالا من | دەستێ من، مالێن من دەستێن من |
| مالا ته | دەستێ ته |
| مالا وی | دەستێ وی |
| مالا وێ | دەستێ وێ |
| مالا مه | دەستێ مه، مالێن مه، دەستێن مه |
| مالا وه (هەوه) | دەستێ وه (هەوه) |
| مالا وان | دەستێ وان |

لەبەر ئەوە زمانزانەکانی زاری (شێوەی) کرمانجی لەسەر ئەم بیروباوەڕەنە کە ڕاناو لە کرمانجی دوو جۆرە و هەر جودایە لە ڕستەدا.

ئەمەش تەعریفی ڕاناوە بەپێی بیروڕای سادق بەهائەدین:

جهناڤ (بەرناڤ): ئەو بێژەیە یاکو درستەییدا جهێ ناڤی چ مروڤ یان تشت دگریت، چ (ڕاستەخو) ئێکسەر یان ژی بکریار و نیشانکرن وەک:

ئەحمەد چو مال. ئەو چو مال.

ئەحمەد دچیت مال. ئەو دچیت مال.

ئەحمەد دێ چیت مال. ئەو دێ چیت مال.

بێژەیا (ئەو)، جهێ ئەحمەدی دگرت.

٤- ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەم و دووەمی تاک بە پێی بیروڕای د. نەسرین فەخری:

«ێت» ڕاناوە بۆ کەسی سێیەمی تاک لە کاتی ئێستا و داهاتوودا نەک «ێ» بە تەنیا، هەرچەندە «ێ»ش - کە کورتکراوەی «ێت» و «ێتن»ە - بە تەنیاش ئەو کەسە بە دیار دەخات لە قسەکردن و نووسیندا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە نووسینی «ێت» بە پێویست دەزانین لەبەر هەندێک هۆ لەوانە:

١- هەندێک جار ئەو «ێ»یە نامێنێت بە تایبەتی لەگەڵ ڕەگی ئەو کارانەدا کە کۆتاییان بە بزوێن دێت و لە جێگەی «ێ»ی «ا» بەکار دێت وەک: دەکات، دەبات، دەخوات، دەشوات، ئینجا ئەگەر «ت» بقرتێنین (ا) دەمێنێتەوە، ئایا دەگونجێت بڵێین جارێکیان ڕاناوی «ێ» و جارێکیان ڕاناوی «ا» بەکار دێنین بۆ کەسی سێیەمی تاک لە کاتی ئێستا و داهاتوودا؟ یان ڕاست ئەوەیە کە یەک «ڕاناو» هەبێت وە بڵێین بە گوێرەی کۆتاییی ڕەگەکان پیتە بزوێنی پێش «ت» گۆڕینی بەسەردا دێت و بەڵام «ت» هەر دەمێنێتەوە.

٢- لەگەڵ ڕەگی کاری چاوگە ئەلفییەکاندا کە هەمیشە کۆتاییان بە «ێ» دێت، ئەگەر «ت»مان قرتاندن بڵێین چی؟ کە هەمیشە کۆتاییان بە «ێ»ی ڕەگەکەیە یان ڕاناوەکە؟ ئەگەر بڵێین هی ڕەگەکەیە ئەی کوا ڕاناو یان بە پێچەوانە.

٣- کاتێک کە ئەو کارانە لەگەڵ پاشگری «وە»دا بەکار دێنین چار نییە ئەو «ت»ە دەگەڕێتەوە لەوێدا چی دەڵێین؟ دەڵێین ڕاناوە و لە شوێنی تر دەیقرتێنین ئەمە باشترە یان لە پێشەوە بزانێت ڕاناوە و تووشی ئەو هەڵەیە نەبێت و وەک هەندێک لەگەڵ «وە»ی پاشگردا بیکات بە پاشگر و بڵێت «تەوە» پاشگرە.

٤- لەو کارانەی حەرەکەتیان تێدایە (انتقال) کە لە جێگەی ئامرازی «بۆ» «ە» بەکار دێنین دووبارە ناچارە ئەو «ت»ە دەگەڕێتەوە لەوێدا چی دەڵێین.

وا بزانم ئەگەر یەکسەر بڵێین ڕاناوە خۆمان لەو هەموو ئاڵۆزی و لێکدانەوە و

ڕوونکردنەوەیە ڕزگار دەکەین.

٥- لە شێوەی ژووروودا هەندێک جار «ێ» بەکار ناهێنن بەڵکو دەچێتە وێنەی ئەو بزوێنە کورتەی وێنەی نییە لە عەرەبیدا و «i»ی بۆ بەکار دێت لە نووسینی لاتیندا و ئەوەی ئیشارەت بۆ کەسەکە دەکات «ت»یە وەک: دچت، دکەت، دنڤیست...هتد.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ڕاناوێکی ڕەسەنە و لە شێوەی لوڕ و لە زمانی فارسیدا «د» و «ە» لە جێگەی «ت» بەکار دێت و سەیر نییە چونکە دوو دەنگی گەلێک نزیک بەیەکن و بە ئاسانی جێگەی یەکدی دەگرنەوە زۆر جار. هەروەها «ێت، یت، ت» لە رووسیدا بەکار دێت.

لەوانەیە هەندێک بڵێن کە واتە یا «ێتن - اتن» بەکار بێنین دەڵێین نا چونکە لەو شوێنانەدا کە ناچار «ت» دەگەڕێتەوە ناچاری گەڕاندنەوەی «ن» نابین، هەرچەندە لە باسکردندا پێویستە باس بکرێت و روون بکرێتەوە ئەمە لەلایێکەوە لەلایێکی ترەوە بە زۆری «ێت» بەکار دێت، نەک «ێتن»... هەمان شتیش دەڵێین دەربارەی ڕاناوی لکاوی کەسی دووەمی تاک لە ڕابردوو وە ئێستادا، هەرچەندە «ی» تیژ لێرەدا دەکەوێتە پێش «ت» نەک «ێ»ی کراوە.

لە بارەی پێناسینی ڕاناوەوە:

«زۆر جار هەندێک لە جۆرەکانی ڕاناو دەچنە نێوانی ئەو وشانەی کە زۆر ناسراون واتە ئەو ناو و ئاوەڵناو ژمارە و هەندێک ئاوەڵکار کە لە ڕاستیدا بە هیچ ڕوویێک لە ڕووەکانی «مفهوم»ی شت و «کمیة» و ژمارە وەسف ناکرێت تەنیا بەم ڕێگەیە یان دەلالەتیان لێ دەکات»(١).

واتە ڕاناو بەشێکە لە بەشەکانی ئاخافتن کە بە پێی ئەو دەلالەتانە ناو دەنرێت:

١- ڕاناوی کەسی «الضمائر الشخصية».

٢- ڕاناوی هەیی «ضمائر التملک».

٣- ڕاناوی خۆیی «الضمائر العائدة».

٤- ڕاناوی پرسیار «ضمائر الاستفهام».

---

(١) ئەوە لە رووسییەوە کراوە بە کوردی لەلایەن د. نەسرینەوە.

٥- ڕاناوی نیشانەکردن «ضمائر الاشارة».

٦- ڕاناوی نادیار «الضمائر المبهمة».

٧- ڕاناوی گەیێنەر «ضمائر الوصل - الضمائر الموصولة».

لێرەدا بیروڕی د. نەسرین فەخری کۆتایی دێت.

[ڕوونکردنەوە:

لە گوتارەکەی (سووڕێکی خامە..)دا باوەڕی خۆم دەربارەی بەشی زۆری باسی ڕاناو دەربڕیوە لێرەدا کورتەیێکی باوەڕم لە بارەی ڕاناوی کەسی دووەم و سێیەمی تاکەوە دەنووسم:

کەسی دووەمی تاک:

١- لە کاری تێپەڕی ڕابردوودا پیتی (ت) ڕاناوەکەیە وەک: کردت، نووسیت، خواردت. هەر ئەم (ت)ە دەشبێتە مضاف الیه وەک «برات هات، دەستت لادە.» لەگەڵ چەند وشەیێکی Preposition دێتەوە، وەک «بۆت روونە، لێتەوە دیارە، تێت دەگەم» هەروەها دەبێتە فاعیل و مەفعوول وەک: نووسیت. دەتنووسم.

٢- لە کاری تێپەڕ و تێ نەپەڕی موزاریعدا لە شێوەی (ی) دەردەکەوێت، بەڵام بە پێی جێگە وا دەبێ وەک بزوێن واش دەبێ وەک Consonat دەدرکێنرێت:

(دەکەی، دەڕۆی، دەبەی) لە مانەدا Consonant ە.

(دەکێڵی، دەنووسی، دەفڕێ) لەمانەدا بزوێنە.

لە ئەمر و نەهیی سەریحدا دەرناکەوێ وەک «بکە، بژی، بخۆ، بڵێ»، «مەکە، مەخۆ..».

لە ئەمر و نەهیی ناسەریحدا دەبێتەوە ئەو (ی)ەی باسمان کرد وەک «بکەی، بخۆی، بڵێی» بەڵام لە کاری وەک (بژی)دا دەرناکەوێ چونکە کۆتاییی کارەکە خۆی بزوێنی (ی) تیژە.

بەلای منەوە لەو کارانەدا (ی) ڕاناو هەرچەندە دەشێ پیتێکی (ت) بەدوا (ی)ەکەدا بێ بەڵام ئەم (ت)ە کەرت و بەشی ڕاناوەکە نییە و

نیشانەیێکی تەسریفی رووتە چونکە ڕاناو کە بەشێکی یەکجار بنجییە لە ئاخاوتنی کوردیدا ناشێ چ پیتێکی لێ بقرتێ، ئەو پیتەی بقرتێ ڕاناو نییە و شتێکی ترە جا هەرچی دەبێ بابێ. هاتنی پیتی (ت) لە شوێنی تریش شتێکی بەرچاوە وەک بڵێی: پارەکەمان دیوەتەوە. ئاوەکەم خواردووەتەوە.

لەم نموونانەی خوارەوەدا (ت)ەکە دەشێ بمێنێ و دەشێ بقرتێ، لە هەردوو حاڵیشدا شتێکی بنجی نییە لە ستەدا:

| | |
|---|---|
| شیرەکە بووەتە ماست | شیرەکە بووە بەماست |
| منداڵەکان بوونەتە پیاو | منداڵەکان بوون بەپیاو |
| گەیشتوومەتە ئامانج | گەیشتوومە ئامانج |
| گەیشتوونەتە ئامانج | گەیشتوونە ئامانج |
| هەیەتم | هەمە |
| ڕۆیشتبێتم | ڕۆیشتبم |
| ڕۆیشتبێتن | ڕۆیشتبن |

دەزانین لە کوردیدا پیتی (ی) چونکە پیتێکی ناسکی بێ هێزە بەبەریەوە هەیە بقرتێ.. بەلام چونکە لە شێوەی ڕاناودا زۆر کاریگەرە قرتانی بۆ نییە کەچی پیتی (ت) دەقرتێ هەرچەند پیتێکی بەهێزە، هۆیەکەش ئەوەیە کە لەو شوێنانەی قرتانی بەسەردا دێت بەشێکی بنجی نییە لە ئاخاوتندا بۆیە دەتوانی بڵێی (دەکەیت، دەخۆیت) دەشتوانی پیتەکەی (ت) بقرتێنی و بڵێی (دەکەی، دەخۆی) بەلام ناتوانی هەرگیز پیتی (ی) لەو کارانەدا تێ ببەیت و بڵێیت (تۆ دەخۆ یاخود تۆ دەخۆت).

کەسی سێیەمی تاک:

ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک لە کاری تێپەڕی ڕابردوودا دەردەکەوێ لە شکڵی (ی) وەک خواردی، کردی، کێلای، درووی. لێرەشدا کە هات و کەوتە دوای بزوێنی (ا، و) بۆ خۆی دەبێتە

Consonant وەک لە نموونەکـــاندا دەردەکـــەوت، لە دوا (ی) تیژیشەوە بزر دەبێ و ئیمکان نییە بدرکێنرێ وەک:

نووسی، پرسی، دزی...

هەر ئەو (ی)ەیە دەبێتە مضاف الیە و بەدوا هەندێ Preposition دا دێت:

دارا نەهات برای هات - براکەی هات.

لێیەوە دیارە، پێی گرانە، تێیدایە.

دەشبێتە بەرکار (مفعول) وەک: دەیبینم، دەیدوێنین.

لە کـاردا هـەر لەم کـارەی تێـپـەڕی ڕابردوودا دەردەکـەوێ، لەوە بەولاوە هەرچی کۆتـایی کـارەکـان هەیە بۆ کەسی سـێـیەمی تاک هەمـوویان شێوەی «تصریفی»ن و ڕاناو نین چونکە دەشێ بقرتێن و تێ بچن. تۆ کە گوتت: (دەڕوات، دەکات، دەکێڵێت، دەفرۆشێت) لە بیـرت نەچێ دەتوانی بڵـێی (دەڕواتن، دەکـاتن، دەکـێـڵـێتن...) هەروەها (دەڕوا، دەکا، دەکێڵێ). کە حاڵ وابێ بۆ دەبێ بڵێین تاکە پیتی (ت) ڕاناوە؟ ئەدی بۆ نەڵێین (تن) سەرلەبەری ڕاناوە؟.

کۆتاییی کار بۆ کەسی سێیەمی تاک ئەم ئیحتیمالانە هەڵدەگرێ:

ئەو دەڕوا دەڕوات دەڕواتن.

ئەو دەکێڵێ دەکێڵێت دەکێڵێتن.

ئەو دەژی دەژیت دەژیتن.

دەبینی هەرجارە پیتی پێش پیتی (ت) دەگۆڕێ و (ت)ەکە خۆی بە تەنیـا وەیا بە خـۆی و بە (ن)ەکـەی (تن)ەوە دەقـرتێ نـاشێ ڕاناو ئـەوەندە بـێ ئۆقــرە و بـێ «ثبـــات» بێ چونکە لە بەشـــە هـەرە گـرنگەکـانی ئاخـاوتنە. لە عـەرەبیـدا ئەوەی پێی دەڵێن (العـمـدة) حـیسـابێکی تایبـەتی بۆ دەکـرێ لە ڕێزمـاندا. ئەوەی ڕاسـتی بێ ڕاناو لە (العـمـدة)ش بنـجـیـتـرە کـە گـوتمان نـاشێ تێ بچێ. دەرنەکەوتنیشی لە هەندێ صیـغـەی کەسی دووەمی تاک و کەسی سـێـیـەمی تـاکـدا بێ تەعلیـل نییـە بەڵام لێـرەدا نـاتوانم لەسـەری

بنووسم هەروەک لە گوتارەکەشمدا مەودای نووسینی دەست نەکەوت.

ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک لە ڕستەی بێ فیعلدا دەبێتە بزوێنی (ە) کە فەتحەی عەرەبییە:

دارا ئازایە، دارا مەردە، ئێستا نێوەڕۆیە، ئەم کابرایە جەردەیە، شەکر شیرینە، دارا شنۆییە.

ساغکردنەوەی ڕاناوبوونی ئەو بزوێنە لە گوتارەکەمدا بە درێژی لە سەری نووسراوە، لزووم نییە لێرەدا دووبارەی بکەمەوە.

وا دەزانم تەعریفێک بۆ ڕاناو دابندرێ، دەبێ هەر ئەو بەشە بگرێتەوە کە ناوی نرا (ڕاناوی کەسی) چونکی کە ئەو بەشە ڕاناو بێت ئەوانی تر هەموویان لە ڕاناوی دەکەون. ج ڕاستییەکی شرایەوە ئاشکرا ناکەم بەوەدا کە بڵێم وشەکانی (ڕاناوی کەسی) لە بنەڕەتدا ڕاستەوخۆ و بێ پێچ و پەنا بۆ مرۆڤ دانراون. جارێ لە بەدیهییە بەرچاوترە وشەکانی «من، ئێمە» بۆ مرۆڤ نەبێ هەر دەست نادەن چونکە مرۆڤ نەبێ هیچ شتێک و هیچ گیانلەبەرێک نییە وتووێژ بکات و بڵێ «من». لە نووسیندا کە دیوارێک دەست دەکات بە ئاخاوتن نووسەرەکە بە دەنگی دێنێ و رستەی «من وابووم، من وام لێ بەسەرهات»ی بەسەر زارە مەوهوومەکەیدا دێنێت دەنا دیوار ورتەی لەبەرەوە نایەت. وشەی «تۆ، ئێوە» ئەوانیش بە «تسامح» نەبێ بۆ غەیری مرۆڤ بەکار نایەن.

وشەی «ئەو، ئەوان» ئاسانترن بۆ بەکارهێنانیان بۆ غەیری مرۆڤ نەک لەبەر ئەمە کە لە بنەڕەتدا بۆ مرۆڤ نین، بگرە لەبەر ئەوەیە کە مرۆڤ و غەیری مرۆڤ لە سیفەتی «غیاب»دا هاوبەشن. تۆ سەرنج بگرە دەبینی بە دەگمەن نەبێ «ئەو» بۆ (سەگ، باران، پیاوەتی، تەلەفۆن...) و هەرچی شت و زیندەواری تر هەیە بەکار نایەت: ئەوەی بۆ مرۆڤ و غەیری مرۆڤ بە ئاسانی بەکاردێت صیغەی کەسی سێیەمە لە (فعل)دا وەک (خواردی، نووست، هەڵدەستێت، دەمرێت). بۆ ئەوە بتوانیت وشەی «ئەو، ئەوان» بۆ

غەیری مرۆڤ بەکار بێنێت دەبێ حاڵی تایبەتی بدۆزێتەوە وەک کە بڵێی «من دیوارەکەم نەڕوخاند، ئەو لە خۆوە کەوت».

کە گوترا «من، ئێمە – تۆ، ئێوە – ئەو، ئەوان» بێ هیچ وشەیێکی تر و هیچ عەلامەتێک کە واتایێکی تایبەتییان بۆ دیار خات، تەنیا شێوەی مرۆڤ بە دڵاندا دێت و هیچی تر. قسە لێرەدا درێژەی زۆرە، بەوەندەی سەرەوە لێی دەبڕمەوە. لەمەوە، تەعریفێک کە من پێی ڕازی بم بۆ (ضمیر، Pronoun، ڕاناو ) شتێکە ئەمانەی تێ خوێندرابێتەوە و دەوری بنجی ڕاناویشی ڕاگەیاندبێ، تەعریفەکەش ئەمەیە:

ڕاناو ئەو کۆمەڵە وشەیەیە کە ڕاستەوخۆ بۆ کەسانی یەکەم و دووەم و سێیەم (وەیا قسەکەر و قسە بۆ کراو و قسە لێکراو) دانراوە، هەریەکێک لەو وشانەش لە وێنەیێکی تایبەتیدا دەبێتە هۆی پەیدابوونی واتای تەواو لە ئاخاوتنی کوردیدا.

ئەم تەعریفە لە وشەی کەسەکان بەولاوە هیچی تر ناگرێتەوە، دەوری (ڕاناوی لکاو)یش کە بەو نەبێ لە ئاخاوتندا جێبەجێ ناکرێ لەم تەعریفەدا تێ خوێندراوەتەوە. دەوری ڕاناوی لکاو بەداخەوە لای زمانزانانی کورد چ بایەخێکی پێ نەدراوە، لە حاڵێکدا شیرازەهۆنی ئاخاوتنی کوردی بە ڕاناوی لکاو پێک دێت.

پێی ناوێ بڵێم، بەڵام بە ناچاری دووبارە سێبارەی دەکەمەوە، من لە زاراوەی (ڕاناو) ڕازی نیم چونکی وشەکانی (من، تۆ، ئەوان.... هتد) و جوودی سەربەخۆیان هەیە و لەسەر ئەوە نەوەستاون دەبنە جێگری ناو یا نابنێ. خۆ زاراوەی (لکاو) هەر بەجارێ شەقامەڕێیەکانی ڕێزمانی کوردی کوێر دەکاتەوە. کوێرکردنەوەی شەقامی زمانیش بە پاچ و پێمەڕە نابێ، بەوە دەبێ کە بە خالقی واتای تەواوی ڕستە بڵێین (لکاو) کە بایی بەردێکی ڕەق و تەقیش دەوری بۆ دانانێت لە ئاخاوتندا.

دەمڕاستی لیژنە]

٥- بە بیروڕای مامۆستا هەژار:

دەبێ بگوترێ «ضمیر - ڕاناو» هەر ئەوانەن پێوە دەلکێن و لە رستە دروستکردندا زۆر کاریگەرن، لای وایە زاراوەی «بریلە»شی بۆ بەکار بێت کە بریتییە لە وشەی «بری - بەواتای بدیل» و ئەمرازی چووککردنەوەی «لە». بەو پێیە بریلە «ضمیر متصل» (٨) دانەیە.

م، ت، ی: وەک کە بڵێی کردم، کردت، کردی یاخود لە حاڵی اضافەدا (برام، برات، برای).

ان: بۆ کۆی کەسەکانە لە کاری تێپەڕدا وەک بڵێی کردمان، کردتان، کردیان. هەروەها لە حاڵی اضافەدا..

ی: بۆ کەسی دووەمی تاک لە کاری رابردووی تێ نەپەڕ و کاری موزاریعی تێپەڕ و تێ نەپەڕ وەک: ڕۆیشتی، مردی، چووی، دەڕۆی، دەچی، دەکەی، دەخۆی..

ین: بۆ کەسی یەکەمی کۆ لە کاری ڕابردووی تێ نەپەڕ و کاری موزاریعی تێپەڕدا و تێ نەپەڕدا وەک ڕۆیشتین، چووین، نووستین، دەنووین، دەڕۆین، دەکەین، دەشکێنین..

ن: بۆ کەسی دووەم و سێیەمی کۆ لە کاری رابردووی تێ نەپەڕ و کاری موزاریعی تێپەڕ و تێ نەپەڕدا وەک: ئێوە نووستن، ئەوان نووستن - ئێوە چوون، ئەوان چوون - ئێوە دەخۆن.. دەڕۆن - ئەوان دەخۆن. دەڕۆن..

و: بۆ کەسی دووەمی کۆ لە هەندێ شێوە ئاخاوتنی کوردستانی خوارووداکە بە تەواوی لە جێگەی «تان» دێت وەک: ئەوە کردو ئەوە خواردو - براو هات - لێو رازی دەبم.

ئەو بەشانەی کە تا ئێستاش پێیان گوتراوە (ضمیری کەسی، اشارە، پرس، خۆیی، هەیی، مبهم، لێکدەر) هیچ کامیان تا سەنگی ضمیری متصل (بریلە)ی باسکراو نین و دەبێ ناوێکی تریان بۆ دابندرێ وەک (ناو) یاخود (نیشان) یاخود (ئەمراز - ئەدات) یاخود هەر شتێکی تر بێت.

ڕاناوی لێکدەر:

ڕاناوی لێکدەر (Relative، اسم الموصول) تا ئێستا لە لایەن نووسەرانەوە

(لێکدەر، گەیێنەر، پێ گەھ، پێوەندی)ی بۆ بەکار هێنراوە لە کوردیدا.

لە فارسیدا (حرف ربط)ی پێ گوتراوە.

لە ڕێزمانی ئینگلیزی پێی گوتراوە Relative Pronoun

کوردۆیێڤ وشەی (هەڤ دوتی ) پێ گوتووە.

بە لای سادق بەهائەدین و نەسرین فەخرییەوە تەنیا وشەی (کە) ڕاناوە لەو رستانەدا کە ڕاناوی لێکدەریان تێدایە وەک (ئەو وێنانە کە هەڵواسراون جوانن، تۆ کە قوتابیت دەبێ بخوێنیت). ئەو پیتە (ی)ەی کە هەندێ جار دێتە پێش ڕاناوەکەوە پیتی پێوەندییە و کەرتی ڕاناوەکە نییە.

نووری عەلی ئەمین دەڵێ: پیتی (ی) یاخود (کە) ئەگەر بە تەنیا هاتن هەر یەکەیان ئەو ڕاناوەن کە پێی دەڵێن ڕاناوی لێکدەر، بەڵام لەم حاڵەدا فەرقیان لەگەڵ حاڵەتی بەجووتە هاتنیان لە ڕستەدا ئەوەیە کە (ی) تەنیا و (کە)ی تەنیا هەریەکەیان لەو شێوەیەدا ڕاناوی لێکدەری سادەیە، بەڵام ئەگەر بەسەریەکەوە بەکار هێنران دەبنە ڕاناوی لێکدەری ناسادە وەک:

ئەوەی کە دوێنێ لەسەر بانەکە کەوتە خوارێ، بارام بوو.

ڕاناوی (ی) یا (ی کە) بە زۆری لە دوا ڕاناوی ئیشارییەوە دێت.

تێبینی:

١- لە شێوەی کرمانجی ژووروو (ئێ کۆ) یا (یێ کۆ) لە بۆ نێر بەکار دێت، (ئاکۆ) یا (یاکۆ) لەبۆ مێیە، (یێن کۆ) لەبۆ کۆی هەردووکیان.

٢- وشەی (کە) کاتێ دەبێتە ڕاناوی لێکدەر کە هەم دوو رستە بەیەکەوە گرێ بدات و هەم لە بری ناوێک بەکار هێنرابێت، وەک:

منداڵەکەم دی کە لە سەرما هەڵدەلەرزی.

لەم رستەیەدا ڕاناوی (کە) رستەی (منداڵەکەم دی) و رستەی (لە سەرما هەڵدەلەرزی) بەیەکەوە گرێ داوە و هەم جێی ناوی (منداڵەکە)ی لە رستەی دووەمدا گرتووەتەوە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە وا وشەی (کە) وا دەبێت وەک ڕاناو بەکار ناهێنرێت، واتە کە یەک لەو دوو مەرجەی سەرەوە نەگەیشتتە جێ وشەی (کە) لە

ڕاناوی دەشۆرێت، وەک:

که هاتیت، پێت دەڵێم.

که پێڵاوەکەم لەپێ کرد، بزمارێک چوو بەپێمدا.

که ئەو هات، من ڕۆیشتبووم.

لەم سێ ڕستەیەدا هەرچەند (کە) دوو ڕستەی بەیەکەوە بەستووە، بەڵام جێی ناوی نەگرتووەتەوە، لەبەر ئەمە (ڕاناو) نییە و شتێکی ترە لە جێی خۆیدا لێی دەدوێین.

[تێبینی و ڕوونکردنەوە:

من لە گوتاری «سوورێکی خامە بە دەوری ڕاناودا» گوتوومە کە بێین و وشەکانی (من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئەوان - لەگەڵ شێوە لکاوەکانیان کە من لەو گوتارەدا پێیان دەڵێم ڕاناوی چالاک) بە ڕاناو دانێین هەرگیز ناشێ بە هیچ وشەیەکی تر بگوترێ ڕاناو چونکە ئیمکان نییە چ تایبەتییەکی مشترک کۆیان بکاتەوە. جودایی نێوان (م) لە ڕستەی (من هاتم)دا لەگەڵ وشەکانی (کام، فلانەکەس، شتێک، کە..) هێندە زەق و بەرچاو و بنجییە ناهێڵێ بیر بۆ ئەوە بڕوات هەموویان یەک بەشی ئاخاوتن بن چونکە کە پیتی (م) لە ڕستەی (من هاتم)دا وەک (فلانەکەس حیساب کرا چ لزووم نامێنێ ئاوەڵکار (ظرف) لەگەڵ ئاوەڵناو (صفة) جودا بکرێنەوە و بە دوو بەشی ئاخاوتن بژمێردرین یاخود وشەی (هاتن، خواردن) کە چاوگن پێیان بگوترێ (ناو) کەچی (هاتم، خواردم) فیعل بێ چونکە هەر نەبێ تایبەتییەکی (مشترک) لە نێوان (ظرف و صفة)دا هەیە کە (وەصف)ە، تایبەتییەکی تر مشترکیش لە نێوان (چاوگ و فیعل)دا هەیە کە (ڕوودان - حدوث)ە. پێویست نییە لێرەدا درێژە بەو قسانەم بدەم کە لە گوتارەکەدا درێژەیان پێ دراوە، بەڵام هێندە هەیە من لەو گوتارەدا باسی غەیری (ڕاناوی کەسی)م نەکردووە، بۆیە لێرەدا ڕێم هەیە کورتەیێکی یەکجار کورت لە بارەی ئەم ڕاناوەی (لێکدەر)ەوە بڵێم

که تا ڕادەیێک ناتەواوی ناوەڕۆکی گوتارەکەم پڕ کاتەوە:

گریمان[1] بەوە ڕازی بین ڕاناو وشەیێکە جێی ناوێک دەگرێتەوە، ئەوەی یەکجار ئاشکرا و ڕوونە: ئەم وشە وەیا ئەمرازەی (کە) لە رستـەدا هەرگیـز جێگەی ناو ناگـرێتـەوە بەڵکو بەخـۆی و بەو رستەیەی کە لە دوایەوە دێت شێوە وەسفێکی ناوەکە دەکات.

بە نموونە تۆ کە گوتت (ئەو پیاوەی کە نانەکەی خوارد مێوان بوو) بە رستـەی (کە نانەکەی خـوارد) وەسـفێکی بێ فـێڵ و ئاشکرای (پیـاو)ەکـەت کـردووە وەک ئەوەی کـە گـوتبـێت (پیـاوە نانخـواردووەکە). سرنج بگرە لەم ڕاستییە: چونکە رستـەی (کە نانەکەی خوارد) بۆ وەسفە وەسفیش بە تەنیا واتای رستەی تەواو بەدەسـتـەوە نادات دەبینی بۆ تەواوبوونی واتای رسـتـەکـە چاوەنوڕیی شتێکی تر دەکەیت بە دوا رستە وەسفییەکەدا بێت و واتای تەواو پێک بێنێت، رسـتـەی (مـێـوان بوو) ئەو چاوەڕوانکراوەیە.

ئەو پیاوەی کە نانەکەی خوارد

پیاوە نان خواردووەکە

سەیری هەردوو گوتە وەک نیمچە رستە واتای تەواویان نییە لە حـاڵێکدا لە رسـتـەی یەکـەمدا فیـعل و ضـمـیری لکاوی کـەسی سێیـەمی تاک هەیە کە لە رستـەدا (ئیسناد و حکم) پێک دێنن و دەبوو پێـویسـتـیـان بە رسـتـەیێکی تر نەبێت بۆ تـەواوکـردنی واتاکـەیان بـەڵام وەک گوتم چونکە بووە بە (وصـف) هەرچی (حکم وئیسناد)ێکی تێدا هەیە لە ناو (وصیفة)ەکەدا وەستاوە و نابێتە تەواوکەری واتای رستە. لەم ڕووەوە رستەی (ئەو پیاوەی کە نانی خـوارد) هاوتای تەرکیبە وسفییەکەی (پیاوە نانخـواردووەکە)یە بەبێ زیاد و کەم کە هیچ هۆیێکی (حکم و ئیسناد)ی نیهائیی تێدا

(١) گـریمان: بـە واتای (فـرضـنا)ی عـەرەبییـە لە جـیـاتی وشـەی (افـرض)ی عـەرەبیش (بگرە)ی کوردی بەکار دێت.

نییە و ناشێ هەبێ. بەڵام کە هاتی نیمچە رستەکەت لە (وصیفة) دەرهاویشت و گوتت (پیاو نانی خوارد وەیا ئەو پیاوە نانی خوارد وەیا پیاوەکە نانی خوارد) دەبێتە رستەیێکی تەواو بە (حکم و ئیسناد)ەوە.

نابێ زمانەوانی کوردی قیاسی زمانی کوردی لە زمانێکی تر بکات و لە بەر تیشکی ئەو زمانەدا سەیری کوردی بکات. لە ئینگلیزیدا کە وشەی Who،Whose ، Whome بە راناوی لێکدەر حیساب کراوە کارێکە دەخلێکی ئێمە و زمانی کوردی بە سەرەوە نییە، وشەی Whoش دیارە سەربەخۆییەکی ئەوتۆی هەیە هەڵدەگرێ حیسابێکی تایبەتی بۆ بکرێ لەو زمانەدا تاکو دەبینی حاڵەتی (فاعلیە و مفعولیە و اضافە)ی هەیە وەک ڕاناوەکانی کەسی I، My، Me لە رستەشدا هەرگیز ناقرتێ چونکە کە قرتا رستەکە لەبەریەک هەڵدەوەشێ. کە سەیری زمانی عەرەبی بکەیت دەبینی زاناکانی صرف و نحوی عەرەبی زۆریان بە (اسم الموصول)یان داناون لەوێشدا (الذي، الذین، اللذان. اللواتي، اللائي...) وشەی بنجین لە رستەدا و حاڵەتی (مرفوعیة، منصوبیة، مجروریة)یان هەیە و ناشێ بقرتێن دەنا رستەکە واتای نامێنێ کەچی لە کوردیدا وشەی (کە) نە ئەو سەربەخۆییەی هەیە نە ئەو بنجییەشە لە رستەدا چونکە دەشێ بقرتێ. سەرەڕای قرتانی، لەوانەیە راستەوخۆش بە پێش ناو وەیا (ڕاناو) بکەوێتەوە و ببێتە ئەمرازی (شرط) وەیا شتێکی تر وەک کە بڵێی «کە دارا نەیێ تۆش مەیێ». واش دەبێ دەکرێتە ئەمرازێکی (تحقیقی):

تۆ کە حوری وەرە نێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی
لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەیی سووزانمدا

با بێین لە رستەیێکدا ئەم وشەیەی (کە) تاقی بکەینەوە و بزانین دەشێ جێی ناوێک بگرێتەوە. لە رستەی (ئەو پیاوەی کە نانی خوارد مێوان بوو) وشەی (کە) گۆیا جێی (پیاو)ی گرتووەتەوە با

وشـەی (پیاو)ی بخـەینە جێگەیـەوە ئاخۆ چۆن دەبێ: (ئەو پیاوەی پیاو نانی خوارد..) لەمـەدا حـیسـابەکە دەرنـەچوو. با ئەمجارەیان وشـەی (پیاو) لە جێی خۆی هـەڵستێنین و بیگوێزینەوە بۆ جێگەی (کە) و بڵێین (ئەو پیاو نـانی خـوارد..) دیسـان رستـەکە چ واتای نابێ و گونجانێکی تێدا نییە.

پوختـەی قسـە و لێکدانەوەی من ئەوەیە کە وا ئەم وشـەیەی (کە) لە هـیـچ رووییێکـەوە دەست نادات پێی بگوتـرێ ڕاناو، بەڕاسـتـی لەوە زیاتر نییـە بە ئەمـرازێکی ئاسـایی حـیسـاب بکرێ لەم سـیفـەتەی ئەمـرازبوونیـشـدا تا بڵێی خـۆش جڵـەوە و هـەرجـارە بۆ مـەبەسـێک بەکار دێت.

دەمڕاستی لیژنە]

ڕاناوی خۆیی Reflexive:

ئەم ڕانـاوە وەک نووری عـەلی ئەمـین دەڵێت: لـە وشــەی (خـۆ) و ڕانـاوی کـەسی لکاوی (م – مان، ت – تان، ی – یان) دروست دەبێت و لە رستەدا بۆ تەوکید بەکار دێت وەک: من خۆم دەیبینم و پێی دەڵێم.

مـامـۆسـتـا سـادق بەهـائەدین و د. نـەسـرین فـەخـری دەڵێن: وشـەی (خـۆ) ڕاناوە دەشـێ لەگەڵ ڕاناوی کەسی لکاو بەکار بێت و بەتەنیاش بەکار بێت وەک:

خۆ شوشتن (خـۆ)

من خۆم هاتم (خـۆم)

سـادق بەهـائەدین دەڵێت لە شـێوەی سـەروودا هـیچ گۆڕینێک لە (خـۆ)دا نابێت چ بۆ نێر بێ و چ بۆ مێ.

[ڕوونکردنەوە:

من لە گوتارەکـەی «سوورێکی خـامە» هـەندێک لەسـەر وشـەی (خـۆ) دواوم، لێرەدا بە کـورتی دەڵێم وشـەی (خـۆ) وشـەیێکی فـەرهـەنگی عــادەتی وەهـایە هـەڵنـاگـرێ جـێی پێ لـەق بکرێ و بـخـرێتـە نـاو قـاڵبێکی تایبـەتی دوور لە سروشـتی خـۆیـەوە. تۆ کە گوتت «خـۆم

هەڵدەدەمەوە» وە یاخود «خۆم دەخورێنم» لێرەدا مەفهوومی وشەی «خۆ» لە رووی رێزمانەوە چ فەرقێکی نییە لەگەڵ ئەوەدا کە بڵێین «برام هەڵدەدەمەوە، پشتم دەخورێنم». لەگەڵ ئەمەشدا واتای «خۆ» بەبەریەوە هەیە لە بەکارهێناندا رۆڵی تایبەتی ببینێت: وشەی «خۆ» کە دەردێتە پاڵ راناوی لکاو تەئکید پەیدا دەکات، لەم تەئکیدەدا دەبێتە سێبەرێکی راناوەکە تەنانەت ناتوانێ لە کۆتاییی رستەدا داوای راناوێکی لکاو بکا کە بۆ وشەی «خۆ» بگەڕێتەوە. بۆ روونکردنەوە سەیری ئەم رستەیە بکە:

ئێمە خۆمان هاتین.

لێرەدا «خۆمان» نەیتوانی کاری «هاتین» لە راناوی «ئێمە» بستێنێتەوە. چ بڵێی ئێمە خۆمان هاتین و چ بڵێی «ئێمە هاتین» راناوی لکاوی کاری «هاتین» هەر ئەوەیە کە بۆ کەسی یەکەمی کۆ دانراوە کە «ین»ە. بەڵام کە گوترا «خۆ هەڵدانەوەمان کارێکی باش نەبوو» وشەی «خۆ» واتای تەئکیدی نەما و بووەوە بە وشەی عادەتی بۆیە لە کۆتاییی رستەدا گوتمان «باش نەبوو» نەمانگوت «باش نەبووین» وەک ئەوەی کە گوترابا «نان خواردنمان باش نەبوو». کە دەڵێی «خۆم دەبینم» لێرەدا وشەی «خۆ» لەگەڵ راناوی «م» کۆ بووەتەوە چ تەئکیدی تێدا نییە بەڵام جۆرێک «تخصص» دەمێنێتەوە لە واتاکەی «خۆ»دا نایەڵێ بگوترێ «خۆت دەبینم»، لەم حاڵەدا دەبێ بڵێی «تۆ دەبینم» تەنانەت لەو لەهجە ئاخاوتنەدا کە (خۆتان دەبینم) بەکار دێت لایەنی (خصوصیة)ە کە مەبەس نییە، واتای رستەکە دەبێتە (ئێوە دەبینم). هەر ئەم لایەنەی (خصوصیة)ە کە مەبەس نییە، واتای رستەکە دەبێتە (ئێوە دەبینم). هەر ئەم لایەنەی (خصوصیة)یشە وای کردووە نەشێ بگوترێ (من ئێمە دەبینم، من من دەبینم)، کەچی دەتوانی بڵێی «خۆمان دەبینم» هەرچەند «خۆ» دراوەتە پاڵ راناوی کەسی یەکەمی «کۆ» چونکە لەلایەن «خصوصیة»وە (من و ئێمە) هەردووکیان کەسی یەکەمن.

سروشتی «خۆ» کە لە واتاکەیەوە سەر هەڵدەدا وای لێ کردووە بتوانێ بە هۆی ئەمرازەوە ویا لەگەڵ وشەیێکی تردا واتای تازە پێک بێنێت وەک «خۆیی، خۆماڵی، کۆییاتی و خۆییاتی، ماڵخۆ» لەم وشانەدا چ خزمایەتییێک لەگەڵ مەفهوومی «ڕاناو» پەیدا نابێت بە هەر تەعریفێک بتەوێ (ڕاناو) دیار خەیت. کە گوتت «ئەم پیاوە خۆییە» وەک ئەوەیە بڵێی «ئەم پیاوە خزمە، یاخود بێگانەیە» خزم و بێگانە چەند ڕاناون خۆییش هەر هەند.

بەلای باوەڕی منەوە وشەی «خۆ» وشەیێکی فەرهەنگی عادەتی تاقمی «ناو»ە، بەر تەعریفی ناویش دەکەوێ بێ زیاد و کەم: «ناو وشەیێکە واتای تەواوی هەیە و بە کاتەوە نەبەستراوە». بەڵام بە پێی ئەو نامحدوودییە کە لە واتاکەی «خۆ»دا هەیە هەڵدەگرێ لە بەکارهێناندا هەر جارە قاڵب و ڕۆڵێکی جودا وەرگرێت، کە ئەمەش تایبەتییێکە هیچ پێوندییێکی بە «ڕاناو»ەوە نییە.

ئەم بەرخە خۆماڵییە

ئەم بەرخە ئاوەکییە

سەیری ئەم دوو رستەیە بکەیت و سرنجی لێ بگرێت هێندە لەیەکتر دەکەن، کوردی گوتەنی، درۆزن نەبێ فەرقیان ناکا. نازانم چۆن دەشێ «خۆماڵی» ڕاناو بێ و «ئاوەکی» شتێکی تربێ. من کە ئەمە دەڵێم قسەم بە تایبەتی لەگەڵ ئەو کەسانەیە کە دەڵێن وشە چی بێ هەر ئەوەیە با جێگە و باریشی بگۆڕێ، واتە کە وشەی «خۆ» ڕاناو بوو لە هەموو حاڵێکدا ڕاناوە. د. نەسرین و مامۆستا سادق لەم باوەڕدان. نووری عەلی ئەمین دەڵێ وشە لە بەکارهێناندا نەوعی خۆی دەگۆڕێ واتە دەشێ لە جێگەیێکدا ڕاناو بێ و لە جێگەیێکی تردا ئاوەڵناو بێ. بەلای منەوە، وەک دەستوورێکی بنجی، وشە لە بنەڕەتدا بۆ واتاییێکی تایبەتی دانراوە بەڵام حاڵەتی دەگۆڕێ، گۆڕانی حاڵەتیش وشەکە ناگۆڕێ. هەر بۆیەیە «خۆماڵی» نابێتە ڕاناو چونکە «خۆ» لە بنەڕەتدا ڕاناو

نیـیـه. دەبینی لە وشـەی «خۆیـی»دا ئەمرازی نیسبـەت هاتووە و پێـوەی لکاوە وەک بە «هـەولێـر و هەڵەبجـە»وە لکابـێ و بگوترێ «هـەولێری، هەڵەبجەیی».

وا دەزانم ئەم لێکدانەوانە بەس بن بۆ دیار خستنی ڕاناو نەبوونی وشەی «خۆ».

دەمڕاستی لیژنە]

ڕاناوی هەیی:

لە زمـانی کـوردیدا هەر وشـەی «هـی» بـۆ ڕاگەیاندنی «تملک» بەکـار دەهێنریت بەڵام بە پێی ناوچە شێوەی دەگۆڕێ، وا دەبێ دەگوترێ «ئی، یێ، یا، هـین» وەک:

ئەمە هی خۆمە، بزنەکە هی بارامە. پێڵاوەکە هین تۆیە.. هتد.

لە شـێـوەی ژووروودا فـەرقی «نێـر ومێ»ی تێدا دەکـرێ، مـەبـەسیش ئەوەیە کـە نێرایەتی و مێیایەتی وشـەی «هـی» لەم شێوەیەدا بەندە بە «مملوک»ەکەوە واتـە کە «مملوک» نێر بوو «مـالک» مێش بێ ڕاناوەکە نێر دەبێ وەک ئەوەی ژنێک بە کـوڕی خۆی بڵێ (کوڕی من) یاخـود باوکێک بڵێ (کـیـژا من). لە شـێـوەی ژووروودا ئەم ڕاناوە بەم چەشنەیە:

ئێ من، یاخود، یێ من – لە بۆ نێر.

ئامن، یاخود، یامن – لە بۆ مێ.

[ڕوونکردنەوە:

وشـەی «هـی» بەلای منەوە نەک هەر «ڕاناو» نییـە و بەس بگرە ئەو سـەربـەخـۆییـیـەی نیـیـە کـە بیـخـاتە ریزی تاقـمی «ناو»یشـەوە. لە ڕاسـتـیدا «هـی» هـۆیێکی سادەی «تملک»ە کە وا لە رستـەدا نەبێ هـەر واتا بەدەسـتەوە نادات. لە رووی ڕێزمانەوە وشـەی «بۆ» چەند سـەربـەخـۆیە لە رسـتـەی «ئەم گۆشـتـە بۆ بارامـە»، وشـەی «هـی»ش هـەر ئەوەندە سـەربەخـۆیە لە رستـەی «ئەم گـۆشـتـە هی بارامـە». ئاشـکرایـە ئەم «هـی، ئی..» هـەر خـۆیەتـی دەبێـتـەوە ئـەمـرازی «اضافـە» و دەگوترێ «برای مـن» واتە ئەمرازە بێ فێڵـەکەی «ی»ی

اضافەش دەبێ بەڕاناو داندرێ ئەگەر «هـی» ڕاناو بێ.

فراوانکردنـی واتای «ڕاناو» تا ئەو ڕادەیەی باوەش بە ئـەمرازێکی عـادەتـی بێ هـێـزی وەک ئـەمـرازی اضـافـەدا بگرێ، ئـەوەنده سنوورانه دەبەزێنێ لە دەستووراتی ڕێزماندا پێویست نەهێڵێ به مـانەوەی سـنووری نێـوانـی دوو بەشـی ئاخـاوتنی وەک «ناو، ئاوەڵناو» وەیا «ناو، ئاوەڵکار».

که سرنج ڕاگرین دەبینین ئەو شتەی وای کردووه وشەکانی «خۆ، هی، کە» بە راناو دانرێت هەر ئەوەیە ئەم وشانە لە بەکارهێناندا پێـوەندییـان لەگـەڵ ناودا هەیە. با ئێـمـه هەر لە وەندەوە لێی نەبڕێنەوە و نەخـتـێکی تریش بە دەور و پشـتـی نـاودا بنـۆڕین دەبینـین کـار «فـعل»یش پێـوەندی بە ناوەوە هەیە و لە ئـاخـاوتندا ئەرکەکـانی ناو جێبەجێ دەکا، فـیعل لە وجـوودادا، نەک هـەر لە ڕێزمـاندا، پەیدا نابێ ئەگەر ئەو شتانە نەبن کـە پێیـان دەگوترێ «ناو». بەو پێـیـە چاکـتـر ئەوەیە زاراوێک بۆ فـیـعل دابنرێت کـە پێوەندیی بە ناوەوە دیار خات وەک «ئەرکە ناو...».

لە ئینگلیزیدا ڕاناوی «تملک» لە ڕاناوی کەسـییەوە وەردەگـرێت. لەوێدا وشـەی «...our, his, your, my» ڕاناون بەقـەدەر «..we, he, you, I» بەڵام لە کوردیدا «هـی من» هەرگیز ئەو «my»ەی ئینگلیزی نیـیـه. «هـی» کـوردی بێ زیاد و کـەم «of»ی ئینگلزی و «de»ی فرەنسییە. هەروەها «هـی» دەکەوێتە بەرانبەر «s»ی بۆردار – وەک Dara's book.

دەمڕاستی لیژنە]

ڕاناوی پرسیاری:

لە ڕووی زاراوەوە:

مامۆستا سەعید سدقی ڕاناوی پرسیار بە (أدوات استفهام) لە لاپەڕە (٥١)ی کتێبەکەیدا دەداتە قەڵەم دەڵێت:

أدواتی استفهام – چەند لفظیکن سؤالیان پێ دەکرێت بعضی لەوان ئەمانەن، (کێ، چی، کەی، کوا، کوێ، ئاخۆ، ئا، ئایاکو، کام، کامەتە، کامەیە، چۆن، چلۆن، چەن).

مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردیدا دەڵێت: بۆناوی پرسی ئەو بۆناوانەن کە پرس ئەکەن، لەبەر ئەم خاسیەتەیان پێیان دەڵێن بۆناوێکن کە لە شوێن شارەکەیان دەگەڕێن، وەکو: کێ هات؟ مامۆستا وەهبی ئەمانە بە ڕاناوی پرسی دادەنرنێت:

| بۆ ئینسان | بۆشت | بۆجێ |
|---|---|---|
| کێ | چی | کوێ |
| چەند | چەند | |
| کام | کام (کامە). | |

لە دەستووری زمانی فارسیدا دەڵێت: ئەو وشانەی بۆ پرسیار بەکار دێن، جارێک راناون، جارێک ئاوەڵناو. ڕاناوی پرسیار ئەوەیە کە دەبێتە جێنشینی ناو. بەڵام ئاوەڵناوی پرسیاری هەمیشە لەگەڵ ناودا دێت و لە چۆنیەتی یا ئەندازە یا جنس یا زمان یا مکان یا نیسبەتی ناو دەپرسێت، وەک:

چ کتێبێکت خوێندەوە؟ (ئاوەڵناو)

دوێنێ کێ هات بۆماڵی ئێوە؟ (ڕاناو)

چ دەکەی؟ (ڕاناو)

ئەم وشانە بەلای ئەندامانی لیژنەوە بەم جۆرەن:

بەلای مامۆستا هەژارەوە هیچیان ڕاناو نین، نە ئەمانە و نە ئەوانی پێشتر پێیان گوترا ڕاناوی خۆیی و هەیی... هتد.

مامۆستا س. بەهائەدین و د. ن. فەخری دەڵێن ئەم وشانە (کوا، کا، کوانێ، کانی، کانێ، کێ، کی، کام، کامە، کێهە، کیشک – کیژان، کەی، کەنگی، کەنگێن، چەند، چەن، چ، چی، چە، چۆن، چلۆن، چتۆن، کلۆن، چتۆ، چاوا، کوو، ئا، ئەئا، ئایا، ئاخۆ، داخۆ، داخوا، ئەرێ، هەرێ، کوێ، کیرێ، چو – لە چوزانمدا –) هەموویان ڕاناون. بەڵام مامۆستا س. بەهائەدین گەڕایەوە و گوتی «ئایا، ئاخۆ،

ئەرێ» و ئەو وشانەی کە لە بری «هل»ی عەرەبی بەکار دێن ڕاناونین.

د. ن. فەخری ئەمەش دەخاتە سەر قسەکانی خۆیەوە: کە هاتوو ئەمرازێک کەوتە پاڵ یەکێک لەو ڕاناوانەی بۆ پرسیار بەکار دێن و لەوەدا مەبەستێکی نوێ هاتە ناو ڕستەوە، ئەوسا ئەمرازەکە و ڕاناوەکە بەیەکەوە دەبنە ڕاناوێکی لێکدەر:

| ڕاناوی سادە | ڕاناوی لێکدراو |
| --- | --- |
| چی دەکەیت | بۆ چی وا دەکەیت |
| کوێ خۆشە | لە کوێ بوویت تا کوێ چوویت بۆ کوێ چوویت |

مامۆستا ن. ع. ئەمین دەڵێت:

ئەو وشانەی لای سەرەوە هەموویان (وشەی پرس)ن. ئەم وشانە:

١- ئەگەر لە ڕستەدا لە بری ناوێک بەکار هێنران و پرسیاریان پێ کرا پێیان دەگوترێت (ڕاناوی پرسیاری) وەک:

کێ لە دەرگا دەدات (کێ)

پیاوەکان چەندیان گەیشتنەجێ (چەند)

٢- ئەگەر لە ڕستەدا لەگەڵ ناو هاتن، واتە بوونە هاورێی ناو و لە چۆنیەتی وەیا میقدار وەیا جنس وەیا نیسبەت دوان پێیان دەگوترێت «ئاوەڵناوی پرسیاری - صفة» وەک:

چ گۆانییەکت پێ خۆشە؟ (چ)

لە کام شارەوە هاتوویت؟ (کام)

بە چ شاخێکدا هەڵدەگەڕێت؟ (چ)

چەند کەست دیوە؟ (چەند)

٣- ئەگەر لە ڕستەدا جێی ئاوەڵکاری (ظرف) زەمانی یا هەر ئاوەڵکارێک کە وەسفی فیعلەکە بکات بگرێتەوە پێی دەگوترێ (ئاوەڵکاری پرسیاری) وەک:

منداڵەکان کەی هاتن؟ لێرەدا (کەی) ئاوەڵکاری پرسیارییە چونکە تەحدیدی واتای کاری (هاتن) دەکات و جێگەی ئەو کاتە دەگرێت کە منداڵەکانی تێدا هاتوون.

ئایا سـوارەکـان گـەیشـتنەجێ؟ (ئـایا) لێرەدا ئاوەڵکاری پرسـە چونکە لە بارەی گەیشتنە جێی سوارەکانەوە دەپرسێت.

٤- هـەندێ جـار هـەندێ وشـەی پرسـیـار بۆ «تعـجب» بەکـار دەهێنرێت وەک لەم رستانەی خوارەوە بەدی دەکرێت:

بۆ چ درەنگ هاتیت (پرسیار)؟

چ درەنگ هـاتیت (تعجب)!

فەرق لە نێوان رستەی پرسیار و «تعجب» وەیا وشەی پرسـیار و «تعجب» ئەوەیە لە پرسیاردا چاوەڕێی وەرام دەکرێت، بەڵام لە «تعجب»دا چاوەڕێی وەرام ناکرێت.

[ڕوونکردنەوە:

١- ئـایـا، وەی، ئەرێ، ئـەئا.. ئەم وشـــانـە لە هـیـچ ڕوویێکـەوە نابنە ڕاناو وەیا نـاو وەیا ئاوەڵناو وەیا هـەر بەشـێکی تری ئاخـاوتن کە بوونی سەربەخۆی هەبێت.

٢- لەوەندەی تا ئێـسـتـا گـوتوومـە دیار دەکـەوێت هـیـچ کـامێـک لەم وشـانـەی سـەرەوە پێـیـان گـوترا ڕاناوی پرسـیـار راناونین و زۆربەیان بەرتعریفی (ناو) دەکەون، تەنانەت ئەو بێ تەحدیدییە کە لە وشـەی وەک (کێ)دا هـەستی پێ دەکـرێت، لە وشـەی وەک (خۆراک، پۆشـاک، سووتەمەنی، چەک) و هـەموو ئەوانەی پێیان دەگـوترێ (اسم جنس) لەوێشـدا هـەسـتی پێ دەکرێ هەر وەک (کێ) دەلالەتی (هـەرکـەسێـک) دەگەیەنێ (خـۆراک)یش دەلالەتی (هـەرخـواردنێک)ی هـەیە، پۆشـاکیش (هـەرجلکێک) دەگرێتەوە هەرچەند پرسیشی تێدا نەبێ.

من لێـرەدا نـامەوێ بڵـێم بە پێی تەعریفی من ئەمـانە ڕاناو نین، چونکە من لەوە بوومـەوە کـە وا هـەر (من، تۆ، ئەوان...) ڕاناون [لێرەشـدا مـەعلوومـە من زاراوەی ڕاناو پەسند ناکـەم چونکە ئەم وشـانـەی «من، تۆ، ئێمـە...» یەکی لەسـەر ئەوە نـەکەوتووە خـزمـایەتیی لەگـەڵ نـاو هەبێ یا نەبێ چـونکە ئەوان لەوەوە

هاتوون که وا کەسی یەکەم و دووەم و سێیەمن وەیا قسەکەر و قسەبۆ کراو و قسە لێکراو]. من دەمەوێ بڵێم ئەمانە ڕاناونین بە گوێرەی سروشتیان چونکە بەر مەفهوومی ناو دەکەون و هیچ لە سروشتیان ناگۆڕێ کە بەبەریانەوە هەیە شوێنی ناوێکی تر دەگرنەوە چونکە گەلێک ناوی سەریحی بێ دەمەتەقەش جێی ناوێکی تر دەگرێتەوە. ئەگەر لە د. نەسرین بسەلمێنین (بۆچی، بۆ کوێ) ڕاناوی لێکدراون دەبێ ئەویش لە ئێمە بسەلمێنێ (بۆ دارا، بۆ بەغدا) ناوی لێکدراون.

دەمڕاستی لیژنە]

ڕاناوی نادیار (مبهم):

لە رووی اصطلاحەوە:

١- مامۆستا سەعید سدقی، (ادواتی مبهم)ی بۆ بەکار هێناوە و بەم جۆرە لە کتێبەکەیدا تەعریفی دەکات و دەڵێت: ادواتی مبهم ئەو لفظانەن کە بە شکل و ڕەنگێکی غیر واضح شخص وەیا شت پیشان بدەن وەکو ئەمانە کە بعضیکن لەوان (کەس، هیتر، هێندێ، هین).

٢- مامۆستا توفیق وەهبی، (بۆ ناوی موبهەم)ی بۆ بەکار هێناوە و بەم جۆرە لە کتێبەکەیدا تەعریفی دەکات و دەڵێت: بۆناوی موبهەم ئەوانەن کە جێی کەسێ یان شتێک بە تایبەتی ناگرنەوە، ئەمانە شاریان دیار نابێ؛ وەکو، یەکێ لە دەرگا ئەدا

| بۆناوی موبهەمی رووت | بۆناوی موبهەمی لێکدراو |
|---|---|
| کەس، کام، پیاو | کەسێ، هیچ کەس، هەر کەسێ، هەچ |
| چی، هیچ، کابرا، یەک | کەسێ، هەموو کەسێ، هینێ، هینەکە |
| فلان، کێ، هەموو | کابراکە، هەر کابراکە، هەر کابرایێ |
| هین، زۆر، کەم. | هەندێ، گەلێ، فلانەکەس، نەختێ، پیاوێ. |

٣- د. ن. فەخری (ڕاناوی نادیار)ی بۆ بەکار هێناوە.

٤- له کتێبی قوتابخانەکاندا (ڕاناوی نادیار)ی بۆ بەکار هاتووە.

٥- مامۆستا ئایەتوڵا مەردوخ اصطلاحی (ناو گەنگ)ی بۆ بەکار هێناوە لە فەرهەنگەکەیدا.

ڕای مامۆستا هەژار ئەوەیە ئەو وشانەی کە ناویان بە (ڕاناوی نادیار) هێنرا ڕاناونین، ئەم ڕایەشی لە سەرەتای باسی ڕاناوەوە روون بووەتەوە. بە ڕای د. ن. فەخری و مامۆستا سادق و نووری عەلی ئەوانە هەموویان ڕاناون، بەڵام نووری عەلی دەڵێت ئەم وشانە هەروەک دەبنە ڕاناو لە رستەدا، دەشبنە ئاوەڵناو و ئاوەڵکار، وەک:

هەموو هاتن (- هەموو - لێرەدا ڕاناوە).

هەموو ڕۆژێ دەچن بۆ سەر جووت (- هەموو - لێرەدا ئاوەڵناوە).

باران زۆر دەبارێت (- زۆر - لێرەدا ئاوەڵکارە).

بە بیروڕای مامۆستا س. بەهائەدین و د. ن. فەخری و ن. ع. ئەمین راناو دەکرێت بەم بەشانەی خوارەوە:

١- ڕاناوی کەسی. ئەمیش دوو جۆرە:

أ- ڕاناوی کەسی جودا.

ب- ڕاناوی کەسی لکاو.

٢- ڕاناوی پرسیاری.

٣- ڕاناوی لێکدەر.

٤- ڕاناوی ئیشاری.

٥- ڕاناوی خۆیی.

٦- ڕاناوی هەیی.

٧- ڕاناوی نادیار.

پاش لێکۆڵینەوە س. بەهائەدین و هەژار و د. ن. فەخری گەیشتن بەو ڕایە کە موبهەمی رووت هەیە و موبهەمی استفهامیش هەیە.

[روونکردنەوە:

لە زووەوە دیار کەوتووە کە من ئەم وشانەی (ڕاناوی نادیار -

مبهم) به ڕاناو دانانێم. پێم بڵێن فەرق چییە لە نێوان دوو وشەی وەک (هەر کەسێک، هەر خۆراکێک)؟ یاخود بۆ چی بە وشەی وەک (فلان) نەڵێین (ناوی مبهم)؟ لە بارەی ئەو وشانەی «پرس»یان تێدایە دەڵێم ئاشکرایە (ابهام، نادیاری) هەیە ئەگەر نەبا بۆ پرسین بەکار نەدەهاتن چونکە پرسین بۆ زانینی شتی نەزانراو دانراوە.

دەبێ ئەوەش بگوترێ هەندێک لەو وشانەی بە ڕاناو دانراون لە ناوەڕۆکدا واتای نەفیان تێدایە وەک هیچ کەس. تەنانەت وشەی «کەس» بە تەنیاش لە بنەڕەتدا بۆ نەفی هاتووە. تۆ دەڵێی (کەس نەهات). تەنیا لە حاڵی پرسیاردا دەبێتە وشەیێکی بێ تەرەف لە نێوان (نفی و ایجاب)دا وەک کە بڵێی (کەس هات؟) چونکە پرسیار بە ئەسل بێ تەرەفە، بەڵام بە هۆی ئەوەوە وشەی (کەس) لە بنەڕەتدا بۆ (نفی) هاتووە لە پرسیاریشدا وا دەبێ بەلای (نفی)دا دەشکێتەوە وەک (کەس گوتوومەتی زەوی ناخولێتەوە؟ کەس هەیە بوێرێ دەنگ بکات؟).

دەمڕاستی لیژنە]

## ٣

# ئاوەڵناو "الصفه"

١- ئاوەڵناو لە رووی زاراوەوە:

نووسەرانی کورد هەتا ئێستا ئەم زاراوانەیان بۆ کار هێناوە:

١- مامۆستا سەعید سدقی: صفة.

٢- مامۆستا توفیق وهبی: ئاوەڵناو.

٣- مەردۆخ: ناونیشانە.

٤- رشید کورد: رەوش.

٥- جگەرخوێن: پەسن.

٦- کوردوییێف: خەسیەتناف.

لیژنە جارێ (ئاوەڵناو) پەسەند دەکات تا زاراوەیەکی باشتری بۆ دەدۆزرێتەوە، هۆی پەسەندکردنی زاراوەکەش ئەمەیە:

١- چونکە لەلایەن بەشێکی زۆر لە نووسەرانەوە بەکار هاتووە، تەنانەت لە کتێبی قوتابخانەکانیش هەر بەوە ناوەوە ڕۆییوە.

٢- گونجان هەیە لە نێوانی واتای زاراوەکە و ئەو مەبەستەی کە لە ئاوەڵناو هەستی پێ دەکرێت.

٢- ئاوەڵناو لە رووی تەعریفەوە:

بۆ تەعریفی ئاوەڵناو

١- مامۆستا سەعید سدقی دەڵێت: اسمێکە حاڵ و شأنی اسمەکەی پێش خۆی بەیان دەکا و بەو اسمە دەڵێن (موصوف) بە هەردووکیان دەڵێن:

(ترکیبی توصیفی)، وەک:

کاغەزی سپی.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی دەڵێت: سیفەت کەلیمەیەکە بۆ تەواوکردنی مەعنای ناو یان بۆ ناو بەکار ئەهێنرێ.

٣- آیةالله مردوخ. لە لاپەڕە (١٨، ١٩)ی جزمی یەکەمی فەرهەنگەکەیدا، باسی (صفة) لە نێوان باسی ناودا دەکات و جارێکیان لە بەشی سێیەمی ناو پێی دەڵێت: اسم صفە، لە شەرحدا دەڵێ (بۆ ناسین نیشانە دانریاگە، ئەوە پێی ئێژن ناونیشانە، وەک پانی، درێژی، کۆتایی...)..

هەروەها لە بەشی هەشتەمی ناودا لە ژێر عینوانی صفە مبالغەدا هەندێ ئاوەڵناوی لە میسالدا نووسیوەتەوە، وەک (گرینۆک، ئاودار). لە بەشی نۆیەمی ناویش لە ژێر عینوانی صفە مشبهەدا کە پێی دەڵێ (ناونیشاندار)، وشەکانی وەک (درێژ، کۆتا، گەورە، پان، گوشاد، دوور، نزیک)ی بە نموونە هێناونەوە.

٤- کوردوییێف دەڵێت: خاسیەتناف ئەو ناوەیە کە جۆر و رەنگ و چۆنیەتی ناو دیار دەکات.

٥- لە دەستووری زمانی فارسیدا بەم جۆرە ئاوەڵناو تەعریف کراوە:

سیفەت وشەیە کە کە ڕوونکردنەوەیەک لە مەعنای اسم زیاد دەکات بەو هۆیەوە سەر بە اسمە.

٦- لە دەستووری زمانی ئینگلیزیدا بەم جۆرە تەعریف کراوە: ئاوەڵناو ئەو وشەیە کە وەصفی ناوێک یان راناوێک دەکات.

لەدوای موناقەشەیەکی زۆر و بەراوردکردنی تەعریفەکانی پێشوو لەگەڵ واتای سیفەتدا لیژنە بە هیچ تەعریفێ لەو تەعریفانە ڕازی نەبوو، چونکە هیچ کامێکیان تەواوی واتای سیفەتیان نەدەگرتەوە، سەرەڕای ئەوە کە هەندێک لە تەعریفەکان لەگەڵ سروشتی سیفەتدا رێک نەدەکەوتن، ئیتر ئەمە لیژنەی خستە سەر تێفکرین بۆ دۆزینەوەی تەعریفێک، کە تەواوی واتا و سروشتی سیفەت بگرێتەوە و نەهێڵێت واتای هیچ بەشێکی تر لە بەشەکانی ئاخاوتنی بێتە ناو.

لەبەر ئەوەی ئەندامانی لیژنە رێک نەکەوتن لەسەر تەعریفێک، بۆیە هەریەکە تەعریفێکی تایبەتی خۆی پێشنیاز کرد بەم شێوەی خوارەوە:

١- مامۆستا سادق بەهائەدین دەڵێت: ئاوەڵناو وشەیەکە وەصفی موصوفەکەی خۆی دەکات موصوفەکەی ناو بێت یا ڕاناو یا هەر شتێکی تر بێت.

٢- د. نەسرین فەخری دەڵێت: ئاوەڵناو ئەو وشەیەیە کە لە خۆیدا (وصفیة) هەیە بۆیە جۆر و چۆنیەتی (موصوف) دیار دەخات لە رستەدا و بەمەدا لە ناو جودا دەکرێتەوە، هەروەها توانای ئەوەیە هەیە جێگای ناو بگرێتەوە ئەگەر هاتوو بوو بە صفەتێکی دیار یان هەمیشەیی لە مەوصوفدا، یان وەک ناو بەکار دێت بەمە هێزی وسفیتەکە دەردەکەوێت و بەمانەش لە ناو جودا دەکرێتەوە.

٣- مامۆستا هەژار دەڵێت: ئاوەڵناو وشەیەکە لە خۆیدا مانای (وصفیة)ی هەیە و لە رستەدا چۆنیەتی موصوف دەردەخات.

٤- مامۆستا نووری عەلی ئەمین دەڵێت: ئاوەڵناو وشەیەکە گوزارەی (وصفیة)ی تێدایە و بۆ تەواوکردنی واتای ناو یا ڕاناو یا ئاوەڵناوێکی تر بە کار دەهێنرێت، هەندێ جاریش لە سنووری خۆی تێ دەپەڕێت و لە رستەدا وەک ناو یا ئاوەڵکار یا تەواوکەری فیعلی مساعد بەکار دەهێنرێت وەک:

نازدار هات (نازدار بووە بە ناو)

بارام باش دەڕوات (باش بووە بە ئاوەڵکار بۆ وشەی دەڕوات)

پەروین جوانە

٥- بیروڕای مەسعوود محەمەد: وا دیارە هەموو ئەندامان لەسەر ئەوە ڕێک کەوتوون کە ئاوەڵناو وشەیەکە (وصفیة)ی تێدایە. من ئەوەش دەخەمە سەر (وصفیة) و دەڵێم وشەکە دەبێ بە کاتیشەوە نەبەسترابێتەوە. بەمەدا دەتوانین بڵێین (ئاوەڵناو ناوێکە وصفی تێدا بێ) چونکە ناو بە کاتەوە نەبەستراوەتەوە. ئەم تەعریفە بەشی (ناو) ناگرێتەوە چونکە واتای (وصفیة) لە (ناو)دا نییە، بەو پێیە تەعریفەکە بۆ تەنیا بەشی (ئاوەڵناو) دەمێنێتەوە کە ئەمەش مەبەسێکی بنجییە لە دانانی تەعریفەکە.

لێرەدا دەمەتەقە هەڵدەستێ لەسەر ئەمە ئایا کە وشەیێکی ئاوەڵناوی بێ گومانی وەک (جوان، تێر، ئازا...) لە فەرهەنگدا ئیشارەی بۆ کرا کە (ئاوەڵناو)ە، کەچی لە رستەدا جێگەی وەسفکردنی کار (فعل)ی گرتەوە وەک کە بگوترێ (تێرم خوارد، جوان ڕۆیشتم..) ئایا وشەکان لە (ئاوەڵناوی) دەکەون و دەبنە شتێکی تر؟ ئەو کەسانەی کە دەڵێن هەر ئاوەڵناو دەبن، لەسەریانە بیروڕای خۆیان دەربارەی گەلێ باری ڕێزمانی کوردی بگۆڕن، واتە ناشێ پێ داگرن لەسەر ئەوە کە هەرچی وەسفی

(فعل) بکا ئاوەڵکارە (ظرف)، چونکە دەبینین وشەیێکی کە لە فەرهەنگدا بە (صفة) لە قەڵەم درا بۆ وەسفی (فعل) بەکار دێت، وەک (زۆرم خوارد). پێداگرتن و سووربوون لەسەر هەڵوەست کارێکی یەکجار ئاسانە و چی تێ ناچێ وەک ئەوەی هەندێک کەس هەن تا ئێستاش ناسەلمێنن زەوی بە دەوری ڕۆژدا دەخولێتەوە، بەڵام چ سوود لەم اصرارکردنەدا نییە، ئازاییشی تێدا نییە. ئازایی لەوەدایە کە ڕاستی دۆزرایەوە دەرلەحزە بسەلمێندرێ با دژی بیروباوەڕی تایبەتی مرۆڤیش بێ.

قسەم لێرەدا لەگەڵ تێکڕای نووسەران و زمانزانانی کورد و کوردییە، مەبەسیشم لە ئازایی ئەوەیە حورمەتمان بۆ شتی قەرارداده وەیا چاولێکەریی ڕێزمانانی بێگانە چاومان لە ڕاستی تازە دۆزرایەوە و هەڵەی لێرە بەپێشەوە نەنووقێنێت.

لە بارەی بەکارهێنانی وشەی ئاوەڵناوی بێ گومان وەک (جوان) بۆ وەسفی کار (فعل) دەتوانین بڵێین لەو تەرزە جێگەیەدا (موصوف)ێکی قرتاو هەیە کە وەسفەکە دەلالەتی لێ دەکا. بە نموونە کە گوتمان (زۆرم خوارد) لێرەدا بە ئەصل (خواردنێکی زۆرم خوارد) بووە و وشەی (خواردن) قرتاوە کە (زۆر) دەلالەتی لێ دەکا و فیعلی (خوارد)یش ئیشارەی بۆ دەکا. کە سرنج بگری دەبینی وشەی (زۆر) بە تەواوی لە جێگەی (مفعول) دانراوە، مەفعوولەکەش قرتێنراوە. فەرموو مەفعوولەکە بگەڕێتەوە ناو ڕستە و وصفەکە لادە و بڵێ (خواردنم خوارد، نانم خوارد) دەبینی مەفعوولەکان دەگەڕێنەوە جێگەی ئاساییی خۆیانەوە کە لە ڕستەی (زۆرم خوارد) وشەی (زۆر) گرتبوویەوە.

لە ئینگلیزیدا وشەیێکی (Adjective – صفة) بێ کە بوو بە (Adverb – ظرف) داڕشتنەکەی دەگۆڕێت. وشەی (Wise) کە (صفە)یە دەبێتە (Wisely) کە بکرێتە Adverb، هەروەهاش هەموو (صفە)یێکی تر.

لە کوردیشدا وشەیێکی (ئاوەڵکار) کە لە مادەی وشەیێکی (ئاوەڵناو)ەوە وەرگیرێت داڕشتنێکی تایبەتی بۆ بەکار دێت. بە نموونە لە وشەی (جوان) کە ئاوەڵناوە (بەجوانی) دەگوترێ بۆ ئاوەڵکار، هەروەها (ئازایانە، مەردانە..) ئاوەڵکارن لە (ئازا، مەرد) وەرگیراون. سەیری ڕێژەی ئاوەڵکار، هەرگیز بۆ وصفی ناو وەیا راناو وەیا

ئاوەڵناو بەکار نایەت چونکە لە بنەڕەتا بۆ وصفی کار داڕێژراوە تەنیا لەو شوێنانە نەبێ کە وصفی ناوەکە بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕەفتارەی کە لە ناوەکە دەفامرێتەوە وەک (جلوبەرگی پیاوانە، خواردنی کوردانە..)، لەم جێگایانەدا ڕەفتارەکە وەیا ئەو کارەی کە لە موصوفەکەوە چاوەڕوان دەکرێت دێتەوە بەر هەست و زیهنی گوێگرەوە. جل و بەرگ و پۆشاک (لەبەرکردن)ی لێ دەفامرێتەوە خۆراک و نان و پاتیش (خواردن)ی تێرا دەخوێنرێتەوە دەنا ڕێژەی ئاوەڵکاری بۆ بەکار نەدەهات. تۆ هەرگیز نالێی (ئەم بەردە دوشمنانەیە، ئەم ئاوە پیاوانەیە، من ئازایانەم) چونکە لەم رستانەدا (بەرد، پیاو، من) تصورێکی کار و ڕەفتاریان بەدوادا نایەت.

بە نیسبەت ئەوەوە کە بگوترێ ئاوەڵناو لەوانەیە ببێتە ناو وەک (زانا هات)، لێرەدا هیچ سروشت و تایبەتیێکی ئاوەڵناو دەخلی بەسەر رستەکەوە نییە چونکە (زانا) بووەتە (ناوی تایبەتی - اسم علم) هەروەک (فعل)یش دەشێ ببێتێ وەک (خوادای ئامۆزامە). دەتوانین وشەی بێ واتاش بکەینە (اسم علم) وەک ئەوەی یەکێک کوڕی خۆی ناو بنێ (ئەبجەد).

درێژەی قسە زۆری بەبەرەوە هەیە لێرەدا بەمەندە لێی دەبڕمەوە و دەڵێم: یا دەبێ بگوترێ لە کوردیدا وشەکانی ئاوەڵناو دەست دەدەن وصفی کار (فعل)یش بکەن و هەر بە ئاوەڵناوی بمێننەوە، یاخود لەو رستانەدا کە ئاوەڵناو وصفی کار دەکات وشەیێکی قرتاو هەیە ئەو خاوەنی ئاوەڵناوەکەیە، یاخود ئاوەڵناو (حالاتی جودا)ی هەیە کە هەر جارە جێگە و فەرمانی پێ دەگۆڕێت. لە عەرەبیدا ئەم دیاردەیە هەر جێگەی گومان لێکردن و دەمەتەقەش نییە. وشەی (عاقل) کە (اسم فاعل وصفی)یە دەشێ ببێتە (صفة) وەک (الرجل العاقل) دەشبێتە (حال) وەک (تصرف في الأمر عاقلا) جێی (مبتدأ)یش دەگرێتەوە لە رستەدا (العاقل لايؤتى من مأمنه) دەشبێتە (مفعول به وەیا خبر) و دەشبێتە (تمییز) و چەندین شتی تریش. تفصیلاتی تر لە شوێنی خۆیدا دێت.

دەمڕاستی لیژنە]

دوای دەربڕینی ڕای جوداجودای ئەندامانی لیژنە بڕیار درا ئەم تەعریفەی خوارەوە بۆ ئاوەڵناو پەسند بکرێت:

ئاوەڵناو وشەیێکە (وصفیة)ی تێدایە و بەکاتەوە نەبەستراوەتەوە.

[تێبینی:
سرنجێکی دوای موناقەشە دەمخاتە سەر ئەو باوەڕەوە کە شتێکی تریش لەم تەعریفە زیاد بکرێت بۆ ئەوە لە (ئاوەڵکار)ی جودا کاتەوە چونکە وشەکانی (ئاوەڵکار)یش سەرلەبەریان (وصفیة)یان تێدایە و بە کاتیشەوە نەبەستراونەوە. من ڕایەکی تایبەتیم لەم باسەدا پەیدا کردووە بەڵام لێرەدا نای هێنمە ناو نووسینەوە چونکە مەودا نییە هەڤاڵانی لیژنە موناقەشەی بکەن.
دەمڕاستی لیژنە]

ئاوەڵناویش وەک ناو دوو فۆرمی هەیە:

١- سادە: وەک (جوان، ئازا، رەش، بڵند)

٢- ناسادە: وەک (بەجەرگ، پارەدار، بەهرەوەر، رەشپۆش).

دیسانەوە ئەندامانی لیژنە نەگەیشتنە یەک ڕای دەربارەی (فۆرمی ئاوەڵناو)ەوە، لێرەشدا هەر یەکەیان بیروڕای خۆی روون کردەوە.

١- س. بەهائەدین دەڵێت ئاوەڵناو لە رووی فۆرمەوە وەکو (ناو) بەش بکرێت:

آ- سادە: کە لە وشەیێکی واتادار پێک هاتبێ.

ب- ناسادە: کە لە وشەیێک و زیادی پێک هاتبێ.

ناسادەش بەش بکرێ بە دوو بەشەوە:

آ- لێکدراو: کە لە دوو وشەی واتادار (بەلای کەمەوە) پێک هاتبێت.

ب- داڕێژراو یاخود دروستکراو: کە لە وشەیێکی واتادار و زیادی پێک هاتبێت.

٢- بە بیروڕای ن. ع. ئەمین ئاوەڵناو لە رووی فۆرمەوە دەبێت بکرێت بە سێ بەشەوە:

آ- ئەگەر ئاوەڵناوەکە لە تەنیا وشەیێکی سادەی رووت پێک هاتبوو، پێی بگوترێت (ئاوەڵناوی سادە)، وەک: رەش، سوور، هەشت، چ (چ پیاوێ).

ب- ئەگەر ئاوەڵناوەکە لە دوو وشەی سادەی واتادار پێک هاتبوو، وەک: دڵ تەنگ، باوک مردوو، دەنگ گەورە، ڕەش پۆش یا دوو وشەی سادەی واتادار و مورفیمێکی مقیّد پێک هاتبوو، وەک: دەست لەسەر سنگ، گوڵ بەدەم، چاو بەکل، پێی بگوترێت (ئاوەڵناوی لێکدراو).

جـ- ئەگەر ئاوەڵناوەکە لە وشەیێکی سادەی واتادار و پێشگرێک یا پاشگرێک پێک هاتبێت پێی بگوترێت (ئاوەڵناوی داڕژاو)،

وەک:

| سادە | داڕژاو |
|---|---|
| یەک | یەکەم - یەکەمین |
| هەشت | هەشتەم - هەشتەمین. |
| گەورە | گەورەتر - گەورەترین. |
| پارە | بێ پارە. |
| مرد | مردوو. |
| نووس | نووسەر، نووسیار. |

٣- د. ن. فەخری دەڵێت:

أ- ئاوەڵناو سێ بەشە (سادە، لێکدراو، دروستکراو)، هەروەها دەڵێت ئەو وشانەی پاشگر و پێشگریان دەچێتە سەر، واتە ئاوەڵناوی دروستکراو بەیاریدەی پاشگر و پێشگر، ناو دەنێم (ئاوەڵناوی دروستکراو) چونکە ئەمانە نە ئەو سادەیەن کە هەیە چونکە زیادییەک چووەتە سەر ئەو سادەیە، وە نە لێکدراوە چونکە ئەو بەشە زیادە واتای نییە.

ب- ئاوەڵناوی دروستبوو لە وشەیەک و ڕەگێک یان ڕەگ و پاشگر.

ئەوەی لە وشە و ڕەگ پێک دێن بە لێکدراو دادەنێم چونکە ڕەگ بە واتادار دادەنێم، ڕەگ و پاشگر بە دروستکراو دادەنێم: ڕەگ وەک وشەیێکی واتادار و پاشگر بێ واتا. تەنیا ئەوەندە هەیە کە ئەم ئاوەڵناوە فیعلییانە (اسم الفاعل، اسم المفعول) کورترین ڕواڵەتی ئەم ناوانەن.

٤- بە ڕای م. محەمەد ئاوەڵناویش هەمان دابەشکردنی ناو هەڵدەگرێت کە لە کاتی باسی (ناو) لێی دواین و تۆمارمان کرد، تەنیا لە یەک جۆر خۆی لە ناو جودا دەکاتەوە کە ئەویش (اسم فاعل مرکب)ە لەو ڕووەوە کە (ناو) ئەم ڕێژەیەی نییە و لێی تصور ناکرێ.

ئەم ڕێژەیەی (اسم فاعل مرکب) درێژەی هەیە لێرەدا ئەم کورتەیەی لە بارەوە دەنووسم:

(اسم فاعل مرکب - ناوی کارای لێکدراو) بریتییە لە ڕەگی کار (فعل) و زیادییەک، وا دەبێ زیادییەکە وشەیێکی واتادار دەبێ واش دەبێ واتای تەواوی نابێ وەک (نانخۆر، نەخۆر). ئەم ڕەگی کارە هەرچەند خۆی لە خۆیدا واتای تەواوی نییە بەڵام بە هۆی ئەو هێزەی کە تێیدایە و وای لێ کردووە لەگەڵ زیادی بێ واتاش واتای تەواو ببەخشێت دەشێ مامڵەتی وشەی واتاداری لەگەڵدا بکرێت. بەو پێیە کە هات و لەگەڵ وشەیێکی واتادار ڕێژەی (اسم فاعل مرکب)ی پەیدا کرد دەبێ پێی بگوترێ (لێکدراو). کە زیادییەکەش واتای تەواوی نەبوو وەک (نەخۆر، لێ خۆڕ) تەرکیبەکە دەبێتە ئاوەڵناوی داڕێژراو. بەلای منەوە ناشێ بڵێین ڕەگی فیعلەکە بە تەنیا واتای تەواوی هەیە چونکە بە ڕاستی واتای تەواوی نییە. تۆ کە گوتت (خۆر، شۆر، کەر، کوژ) کەس تێت ناگا مەبەست چییە تا نەڵێی (نانخۆر، جلشۆر، تێکەر، مارکوژ). ڕێژەی ئیسمی فاعیل کە لە دوو کەرتی واتاداری تەواو پێک هاتبێت ئەمانەن (نان خواردوو، جل شۆریوو، کار کردوو، مار کوشتوو..).

ئەوەی پێی دەگوترێ (اسم مفعول مرکب) وەک گوشت خوراو، ماڵ دزراو، سەربڕاو، کە لە دوو وشەی واتادار پێک دێن چ گرفتێکی تێدا نییە چونکە بەر تەعریفی (لێکدراو) دەکەون بەڵام ڕێژەی ئەم (اسم مفعول و اسم فاعل)ەی کە لە فیعلی خاوەن پێشگرەوە وەردەگیرێ وەک (لێهاتوو، تێگەیشتوو، لێکوژراو، تێپەستراو) دەبێ تێبینیی ئەوەی تێدا کرابێ کە ئەم جۆرە ڕێژانە لەو فیعلانە وەردەگیرێن کە پێشگریان بەسەرەوەیە، دیارە چ زاراوەیێک بۆ ئەم جۆرە فیعلانە دابنرێت، دەبێ هەمان زاراوە بۆ ڕێژەی (اسم فاعل و اسم مفعول)ەکەش دابنرێت. بۆیە من لێرەدا ناویان نانێم هەرچەند لە تێکڕای بیر و باوەڕەکانیشەوە ناوێک خۆ بە دەستەوە دەدات چونکە دەشێ لە کاتی باسی فیعلی خاوەن پێشگردا بە

(اسثناء) زاراوەیێکی تایبەتی بۆ دانرێت. کورتەی ڕای من ئەوەیە ئاوەڵناو وەک ناو دەبێتە

١- سادە ٢- ناسادە. ئاوەڵناوی ناسادەش دەبێتەوە بە ١- لێکدراو ٢- دارێژراو.

لێرەدا بیروڕای م. محەمەد کۆتایی هات.

تێبینی:

ئاوەڵناوی سادە هەڵدەگرێت لێکۆڵینەوەی تێدا بکرێت، ئاخۆ ئەویش دەبێت یا نابێت بە دوو بەشەوە:

١- سادە لە بنەڕەتدا وەک: جوان، درێژ.

٢- سادەی داهاتوو، وەک: نووستوو، نووسەر.

٣- ئاوەڵناو لە رووی گوزارەوە:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە مختصری صرف و نحوەکەیدا، ئاوەڵناو دەکات بە دوو جۆرەوە:

آ- ئاوەڵناوی سماعی، وەک: رەش، گەورە، سوور.

ب- ئاوەڵناوی قیاسی، وەک: تەنەکەچی، راوچی، شاخەوان، چڵکن، کافرۆش.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردیدا، ئاوەڵناو لە رووی گوزارەوە دەکات بە (٥) بەشەوە:

آ- ئاوەڵناوی چۆنی، وەک: پیاوی (بەد).

ب- ئاوەڵناوی نیشانی، وەک: ئەم باخە (ئەم...ە).

جـ- ئاوەڵناوی ژمارەیی، وەک: چوار هەنار (چوار).

د- ئاوەڵناوی موبهەم، وەک: هەندێ هەنار (هەندێ).

هـ- ئاوەڵناوی پرس، وەک: چەند پیاوێ (چەند...).

٣- لە ڕێزمانی قوتابخانەکاندا، ئاوەڵناو کراوە بەم بەشانەی خوارەوە:

١- ئاوەڵناوی فرمانی: ئەمیش دەکرێت بە سێ بەشەوە:

١- بکەر، وەک: نووسەر، بکوژ.

٢- کراو، وەک: نووسراو، هەڵکەندراو.

ناوی فرمان، وەک: گریە، پرسە، ترس.

٢- ئاوەڵناوی ئیشاری:
آ- ئیشاریی دیار، وەک: ئەم - ئەو
ئەمە - ئەمانە
ئەوە - ئەوانە
ب- ئیشاریی نادیار، وەک: گەلێک، هیچ، فلان، هین.
٣- ئاوەڵناوی چەندی، ئەمیش دەکرێت بە دوو جۆرەوە:
١- ئاوەڵناوی چەندیی دیار، وەک: دە، بیست، هەشت.
٢- ئاوەڵناوی چەندیی نادیار (هیچ میسالی بۆ نەهێناوەتەوە).
٤- پلەکانی ئاوەڵناو: دەیکات بە سێ بەشەوە:
١- پلەی چەسپیو: گەورە، رووت.
٢- پلەی بەراوردی: گەورەتر، رووتتر.
٣- پلەی بالا: جوانترین، گەورەترین.
بیروڕای ئەندامانی لیژنەش ئەمەیە:
مامۆستا سادق بەهائەدین دەڵێت ئاوەڵناو بکرێت بەم بەشانەوە:
١- ئاوەڵناوی وەسفی، وەک: سەوز، گەورە، پان.
٢- ئاوەڵناوی نیسبی، وەک: تەنەکەچی، باخەوان.
٣- لە رووی پلەشەوە سیانە (گەورە، گەورەتر، گەورەترین).
د. نەسرین فەخری دەڵێت ئاوەڵناو دەکرێت بەم بەشانەی خوارەوە:
١- هەموو وشەیەک کە ئەو وەسفیەتەی تێدایە، وەک (رەش، تاڵ، باش...).
٢- ئەوانەی کە بەنیسبی دانراون، من ئەوانە ناو دەنێم صفاتی اسمی، چونکە لە ناو دروست دەکرێن، وەک:
نانەوا، پینەچی، باخەوان.
٣- لە رووی پلەوە دیسان دەکرێت بە سێ بەشەوە، وەک (ئازا، ئازاتر، ئازاترین).
نووری عەلی ئەمین دەڵێت دەبێت ئاوەڵناو بکرێت بەم بەشانەوە:
١- ئاوەڵناوی جۆری (خەبەری)، وەک: گەورە، رەش، سوور.

٢- ئاوەڵناوی ئیشاری، وەک:

ئەم..ە (ئەم پیاوە)

ئەو..ە (ئەو پیاوە)

جودایی لە نێوان راناوی ئیشاری و ئاوەڵناوی ئیشاری ئەوەیە، کە هەرچی ئاوەڵناوی ئیشارییە دەبێت موشاروئیلەهیەکەی ناو ببرێت وەک:

ئەم (دار)ە بەرزە.

ئەو (کوڕ)ە ژیرە.

بەڵام لە راناوی ئیشاریدا پێویست ناکات موشاروئیلەهیەکەی دەربخرێت، وەک:

ئەمە پیاوێکی باشە.

ئەوە ئەسپێکی جوانە.

٣- ئاوەڵناوی نیسبی، وەک: ژنانە، هەڵەبجەیی، شێرانە.

٤- ئاوەڵناوی ژمارەیی، وەک: هەشت، چوار، دوو، ئەمیش دەکرێت بە چوار بەشەوە:

أ- ژمارەی بنجی، وەک: حەوت، چوار.

ب- ژمارەی تەرتیبی، وەک:

یەک (یەکەم - یەکەمین)

دوو (دووەم - دووەمین)

جـ ژمارەی دابەشکراو، وەک:

چوار چوار، شەش شەش.

د- ژمارەی شکێنراو (کەرتی)، وەک: چواریەک، پێنجیەک.

٥- ئاوەڵناوی نادیار (موبهەم)، وەک: هەندێ، تۆزێ، زۆر، کەم، هەموو...

هەندێ منداڵ

تۆزێ پاقلە

زۆر جار

کەم پیاو

هەموو رۆژێ

٦- ئاوەڵناوی پرسیار، وەک: چ کتێبێ دەخوێنیتەوە (چ)؟ کێ هات بۆ ئێرە؟ (کێ).

٧- ئاوەڵناوی کاری، دەکرێت بە دوو جۆرەوە:

١- ئاوەڵناوی بکەر، وەک: نووسەر، مردوو، دارتاش.

٢- ئاوەڵناوی کراو، وەک: دەست شکاو، باوک مردوو، سەر گیراو.

٨- ئاوەڵناوی پلەیی، دەکرێت بە سێ بەشەوە:

| پلەی چەسپیو | پلەی بەراوورد | پلەی باڵا |
|---|---|---|
| گەورە | گەورەتر | گەورەترین |
| ئازا | ئازاتر | ئازاترین |

[ڕوونکردنەوە:

لە کاتی لێکۆڵینەوە لە باسی (ئاوەڵناو لە ڕووی گوزارەوە) من بیروڕای خۆم خستە پاش بەو ئومێدە کاتێک لەلایەن ئەنجوومەنی کۆڕەوە تێکڕای باسەکان سەرلەنوێ موناقەشە دەکرێن، یەکجارەکی، ڕای خۆم دەربڕم. لە گەلێک باسی تریشدا من ئەم خۆ گرتنەم کردبوو لە دەربڕینی بیروڕا، بۆ ئەوە کاتی لیژنە نەکوژم بە دەمەتەقە، لە حاڵێکدا من ڕێم هەیە دواتر لەگەڵ ئەنجومەنی کۆڕ لێکدانەوەی خۆم ڕوون بکەمەوە. بەڵام ئەم پێشدەستیکردنە لە بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوەکانی لیژنە ناچاری کردم هەموو ئەو ڕایانەم بێنمە ناوەوە کە هەڵم گرتبوون بۆ موناقەشەی ئەنجومەنی کۆڕ.

بە نیسبەت ئەم باسەوە هەڵوەستی من لە تەعریفی ئاوەڵناوەوە مەعلووم دەکرێت: هەر وشەیێکی (وصفية) تێدا نەبێ ناشێ نە من بە ئاوەڵناوی دانێم نە ئەو کەسانەش بە ئاوەڵناوی دانێن کە بوونی (وصفية) لە وشەدا بە مەرج دەگرن بۆ (ئاوەڵناو). واتای (وصفية)یش زۆر ئاشکرایە و لەوانە نییە ژێر لێو بخرێ بە هۆی بزریەوە. وشەی (ئەمە، ئەوە) کە بۆ ئیشارەی ڕووتن بە هیچ

تەئویلێک نابێتە ئاوەڵناوێک کە (وصفیة)ی تێدا بێ. وشەی (دوو، سێ، ملیۆن) لە رووی (وصفیة)وە فەرقیان نییە لەگەڵ داروبەرد، تەحدیدی ژمارەش (وصف) نییە شتێکی ترە. (چەند پیاو هات) بەهیچ بۆرە تەوجیهێک ناچێتەوە سەر (وەصف). کە بێین و ئەمانە بە (صفة) دانێین دەبێ تەعریفی (ئاوەڵناو) لە سەرەتاوە بگۆڕین یاخود تەعریفێک بۆ (وصف) دانێین ئەوەندە پەڕاوێزی واتاکەی فرەوان کاتەوە تا باوەش بە (کێ، چەند، بیست، ئەمە..)دا دەگرێت.

وشە کە (وصف)ی تێدا بوو هەڵدەگرێ پلەی خوارو ژووری بۆ دیار کرێت وەک: گەورە، گەورەتر، گەورەترین یاخود هەرە گەورە – کە ئەمەش هەر صیغەی (Superlative)ە. لە وشەی وەک (یەکەم)دا پلەی خوارو ژوور بە (دووەم، سێیەم، چوارەم) دەردەکەوێت، تەنانەت کە دەگوترێ (یەکەم، یەکەمین) مەبەس بەرەوژوورتربردنی (وصف)ەکەیە لە مقارنەی (یەکەم) لەگەڵ دووەم و سێیەمدا نەک یەکەم لەگەڵ خۆیدا کە مقارنە هەڵناگرێ. دابەشکردنی ژمارە بۆ (بنجی و تەرتیبی و دابەشکراو) باسێکە سەر بە ژمارە خۆیەوە، نەک بەندە بەو کە ژمارە (صفە)بێ. دەبینی (شەش شەش و حەوت حەوت) لە حەقیقەتدا ئاوەڵکارن، چونکە کە گوتت (ئێمە دوێنێ شەش شەش هاتین) بەم ژمارەیەی (شەش شەش) وەسفی هاتنەکەت کرد. تۆ ناتوانی بڵێی (ئێمەی شەش شەش، ئێوەی نۆ نۆ) تا بڵێین ئەمانە وەسفی ئێمە و ئێوە دەکەن.

ناوی (حرفە، کەسابەت) هەر ئەوەندە دەبێتە (صفة) کە (وصف)ی تێدا بێ دەنا لە دیارکردنی جۆری کەسابەت چ (وصف)ێک پەیدا نابێ. تۆ کە گوتت (شوانێک هات) چ وەسفێکت دەرنەبڕی، کاتێک (شوان) دەبێتە (صفة) کە مقارنە هەڵگری وەک کە بڵێی (دارا شوانترە لە زانا) یاخود (دارای شوان هاتە لام نەک دارای جلدروو). بێ گومان جۆری پێکهاتنی ناوی (حرفە) کار دەکاتە

سـەر(صــفــە) بـوون و نەبوونـی وشــەکـەوە وەک بڵـێـی (دارتاش، جلدروو، جلشـۆر..) کـە ئەمـانە (وصف)ێکی ئاشکرایان تێـدایە، بەڵام وشەی (چەتیم) با بۆ (حرفە)ش بێ (وصف)ی تێدا نییە.

لـەو وشــــانەی ن. ع. ئـەمـین بە ئـاوڵـنـاوی کــاری (فــعـلی) داناون فـەرقـێک نیـیـە لە نێـوانـی (مـردوو، بـاوک مـردوو)ەوە هەر دوویان جۆری (بکەر)ن.

لەم بـابەتـە تێــبــینـی و تصـــورانـەوە شــتێ تـرم هەیە دەربارەی (ئاوەڵناو - صفة)ەوە، بۆ ئەو کـاتەیان هەڵدەگرم کە ئـەنجومـەن لە باسـەکەوە دەدوێت.

[دەمڕاست لیژنە]

٤

# کار "فعل"

کار له ڕووی زاراوەوە: بۆ (فعل) زمانەوانەکانی کورد، ئەم زاراوانەیان بەکار هێناوە:

١- مامۆستا توفیق وەهبی: فیعل.

٢- مامۆستا سەعید سدقی: فیعل.

٣- مامۆستا شیخ محەمەدی خاڵ: کردار.

٤- نووری عەلی ئەمین: فرمان.

٥- مەردوخ: کردار.

٦- مامۆستا کوردوییێف: فێل.

٧- مامۆستا ڕەشید کورد: پشک.

٨- مامۆستا جگەرخوێن: کرن.

٩- مامۆستا جەلادەت بەدرخان: کردێر.

کار له ڕووی تەعریفەوە: هەتا ئێستا ئەم تەعریفانە لەلایەن نووسەرانی کوردەوە بۆی دانراوە:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردیدا دەڵێ:

فیعل کلمەیەکە کار و حاڵی کەسێ یا شتێک لە دەمێکدا باس دەکات، وەک (ئەخوا، دانیشتووە).

٢- مامۆستا سەعید سدقی لە صرف و نحوکەیدا دەڵێ:

فیعل کلمەیەکە سەربەخۆ دەلالەت بکات لە پەیدابوونی ئیشێ لە زەمانێکا (خوێندی، کردی، دەخوێنێ).

٣- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکانیدا دەڵێ:

فرمان ئەو واژەیەیە کە خەبەری پێ لە کەسێ یا شتێ ئەدرێ لە تافێکا، وەک (شێوا، دەچم، گرتی).

٤- لە دەستووری زمانی فارسی بۆ پۆلی یەکەمی قوتابخانە ناوەندییەکان دەڵێ: فیعل وشەیەکە دەلالەت لەسەر کردنی کارێک یا رووداوێک یا بوونی حاڵەتێک دەکات کە لە زەمانی رابردوو یا ئێستا یا ئایندەدا بێت وەک: دەچم، دێم.

٥- لە ڕێزمانی ئینگلیزیدا، لە کتێبی:

«An English Grammar Book, by: Evan Penglis»

دەڵێت:

A verb is that part of speech which arrests or predicates something

٦- لە زمانی عەرەبیدا زۆر تەعریفی بۆ دانراوە ڕەنگە ئەمەیان ناوەرۆکی تێکڕایان بگرێتەوە «الفعل لفظ یفید حدثا مقترنا بأحد الازمنة الثلاثة».

لیژنە بڕیاری دا بەرانبەر زاراوەی «فعل، Verb» زاراوەی «کار» بەکار بێنێت لە ڕێزمانی کوردیدا، لەمەشدا پەیڕەوی کۆڕی زانیاری کوردی کرد.

لە دوای لێبوردبوونەوە لە سروشتی «کار» و هەڵسەنگاندنی ئەو تەعریفانە کە لە کوردیدا وەیا لە زمانەکانی تردا بۆ «کار» دانراون لیژنە ئەم تەعریفەی خوارەوەی پەسند کرد:

«کار وشەیەکە رووداو و کاتی تێدایە» وەک: خواردی، دادەبەزێ، راوەستە.

لیژنە لە زۆر ڕووەوە ئەم تەعریفەی پەسند کرد، بۆ نموونە چەند ڕوویەک لەو ڕووانە دەهێنینە بەرچاو:

١- وشەی «رووداو» هەروەک «رووداو - حدوث» دەگرێتەوە «کردن، فعل»یش دەگرێتەوە بەڵام وشەی «کردن، فعل» رووداو ناگرێتەوە، واتە ئەوەی پێیان دەگوترێ «افعال المطاوعة» هەموویان بەر ئەم تەعریفە دەکەون.

٢- ناتەواویی هەندێک لە تەعریفەکان، وەک هی مامۆستا وەهبی و نووری عەلی ئەمین کە کاری فەرمان و ئاوات «الامر والتمنی» و هەموو رستەی ئینشائی کە

فیعلیان تێدا بێت بەریان ناکەوێت، ئەو ناتەواوییە لەم تەعریفەی لیژنەدا نییە. بە نموونە کە گوتت «کاغەز بنووسە - نەکەن بڕۆن - خوا بتان پارێزێ - خۆزی زەویەکەم کیلابایە» بەر تەعریفی لیژنە دەکەون بەڵام بەر هی مامۆستا وەهبی و نووری عەلی ئەمین ناکەون.

٣- کە سروشتی کار لێک بدرێتەوە، ئەم دوو بنگەی «روودان و کات» جودای دەکەنەوە لە هەموو بەشەکانی تری ئاخاوتن. بە نموونە، رەچاوکردنی «کات» لە تەعریفەکەدا ناهێڵێ «چاوگ، مصدر» بەر تەعریفەکە بکەوێت چونکە لە چاوگیشدا وەک کار «روودان» هەیە بەڵام کات نییە. هەروەها رەچاوکردنی «روودان» هەموو ئەو وشانە لە تەعریفەکە دەرداوێ کە لە بەشی «ناو»دان و کاتیان تێدایە وەک «ڕۆژ، ساڵ، مانگ، هەفتە، نیوەشەو، پار، دوێنێ، بەهار، پایز..هتد» چونکە لەمانەدا روودان نییە.

بە پێی باوەڕی لیژنە ئەم تەعریفە «جامع و مانع»ە.

کار لە رووی هێز، وەیا «تەئسیر» وەیا «کار تێکردن»ەوە:

مەبەست لەمە، تۆژینەوەیە لەبارەی دابەشکردنی کار بۆ (لازم - متعدی، Transitive - Intransitive، تێ نەپەڕ - تێپەڕ) یا هەر زاراوەیێکی تر کە لە کوردی و غەیری کوردیدا بەکار هاتبێت.

دوای موناقەشە و لێکۆڵینەوەیەکی دوور و قووڵ لیژنە جارێ زاراوەی (هێز)ی پەسەند کرد و سەرەباسەکەی بەم جۆرە دارشت:

دابەشکردنی کار لە رووی هێزەوە:

زمانەوانانی کوردی کاریان لە رووی هێزەوە بەم جۆرە باس لێ کردووە. هەرچەند ناوی هێزیشیان نەهێناوە:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە لاپەڕە (٤٤)ی صرف و نحوی کوردیدا دەڵێت:

فعل دوو بەشە:

أ- لازم.

ب- متعدی.

لازم: فعلێکە دەبێ لازمی فاعلەکەی بێ و لێی جوێ نەبێتەوە و محتاج بە مفعول

نەبێ وەکو:

حسێن هات.

حسێن ڕۆیشت.

متعدی: فعلێکە لە فاعلەکەی جوێ ببێتەوە و احتیاجی ببێ بە مفعول وەکو:

حسین نانی خوارد.

حسین دەرسی خوێند.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (٤١)ی دەستووری زمانی کوردیدا دەڵێت:

فعل دوو صنفی هەیە:

١- فعلی متعدی - کارێ بەیان ئەکا کە لە باس لێکراوەوە تەجاوزی کەسێ یاشتێکی تر بکات، وەکو (پیاو گوشت ئەخوا).

٢- فعلی لازم - کارێ یا حاڵێ بەیان ئەکا کە لە باس لێکراوەوە ڕاستەوخۆ تەجاوزی کەسێ یاشتێکی تر نەکا، وەکو (قەل ئەفڕێ).

٣- مەردۆخ لە لاپەڕە (٩)ی فەرهەنگەکەیدا (بەرگی یەکەم) دەڵێت:

کار دوو جۆرە:

أ- یا بو دروسبوونی یەک چت بەسە، اوە پی ایژن (کار یک لائی)، وەک (بون، روین، هاتن، خەفتن).

ب- یا بو دروسبوونی یەک چت بەس نییە، تا دو چت نەوی دروس ناوێ. وەپێ یژن (کاری دولائی).

تێبینی:

لە پەراوێزی فەرهەنگەکەی ئیشارەی داوە، کە مەبەست لە (یەک لائی) لازمە و مەبەستیش لە (دو لائی) متعدییە.

٤- لە ڕێزمانی پۆلی شەشەمی سەرەتایی لاپەڕە (٥٦) بەم جۆرە باس کراوە:

أ- فرمانی تێ نەپەڕ: ئەو کارەیە کە بە تەنیا لە رستەدا مانایەکی تەواوی هەیە و ئەنجام بە دەستەوە دەدات، وەک: فەرهاد هات.

ب- فرمانی تێپەڕ: ئەو کارەیە کە بە تەنیا لە رستەدا مانایەکی تەواو نادات بە

دەستەوە و پێویستی بە وشەیەکی ترە ماناکەی تەواو بکات، وەک:

فەرهاد گەنم دەچێنێت.

٥- کوردوییێف لە کتێبەکەیدا (مافی کوردی) لاپەڕە (٨٢) بەم جۆرە لە لازم و متعدی دەدوێت:

آ- فێلێد دەرباز بووین: وان فێلادا دبێژن فێلێد دەرباز بووین، یەدکوو نیشان دکن مەریکی یانێ ژی تشتەکی یانێ ژی تشتەکی سەر شوغلەکی، یانێ ژی خەباتەکێ دەخەبتە ئو کرنا وان دەربازی سەر شوغل دبە مەسەلە:

ئەز کتێبی دنڤیسم.

تو نامێ دشینی.

ب- فێلێد نەدەرباز بووین: وان فێلادا دبێژن فێلێد نەدەرباز بووین، یەدکوو نیشان دکن بووین و قەوماندنا تشتەکی یانیژی مەریکی. ئەو ئەیان دکن کو کرنا مەریکی یان (تشتەکی) سەر مەری تشت، خوە خوە تێ کرنێ ئو دەربازی سەر کەسەکی (تشتەکی) دنێ نابا مەسەلە:

ئەز دچم.

تو دترسی.

٦- نووری عەلی ئەمین لە کتێبی قواعدی ڕێزمانی کوردی لاپەڕە ١٣٤دا دەڵێ:

أ- لە (تێ نەپەڕ)دا، ئەسەری کار لە (مسنداليه = فاعل) جوێ نابێتەوە بۆ کەسێ یا شتێکی تر، وەک سوارەکە گلا.

ب- لە (تێپەڕ)دا، ئەسەری کارەکە لە (منسداليه = فاعل) جوێ دەبێتەوە بۆ کەسێ یا شتێکی تر، وەک: دارا نەمامەکەی ناشت.

٧- لە ڕێزمانی فارسیدا، زاراوەی (لازم و متعدی) بەکار هاتووە (دستور پارسی لاپەڕە - ١٩٥ - هي ذو النور) دەبێژێ:

أ- لازم فعلی است کە بە فاعل ئیسناد دادە شود، احتیاج بە مفعول ندارد.

ب- متعدی فعلی است کە فاعل روی مفعول واقع شود.

تێبینی:

بۆ لازم و متعدی هەندێ کتێبی تری دەستووری زمانی فارسی تەعریفی تریان

داناوه، که ئەوانیش له مەعنای سەرەوه دەرناچن.

وەک ئاشرایه له قەواعیدی عەرەبیدا - که سەرچاوەی ڕێزمانی گەلێ له زمانەکانی ڕۆژهەڵاته - لازم و متعدی بەکار هاتووه، ئەم باسەش له عەرەبیدا هێند بڵاوه، لیژنه به پێویستی نەزانی لێرەدا دووبارەی بکاتەوه.

٨- له ڕێزمانی ئینگلیزیدا بۆ لازم Intransitive و بۆ متعدی Transitive بەکار هاتووه و له کتێبەکان و فەرهەنگەکانی ئینگلیزیدا تەعریفی جۆرجۆریان بۆ هاتووەتەوه، کەوا پێویست نەدیترا کاتی لیژنەی پێ بکوژرێ و هەرهێنده دەگوترێ که ئەو تەعریفانەش له پەراوێزی تەعریفەکانی تر دەرناچن.

وا دەردەکەوێت له کوردیدا هەتا ئێستا ئەم زاراوانه بەکار هاتوون بۆ جۆری کار له رووی هێزەوه:

١- لازم و متعدی (سعید سدقی، توفیق وهبی).

٢- هنگیف و نەهنگێف (رشید کرد).

٣- دەرباز و نەدەرباز (کوردوییف).

٤- یەک لائی و دوو لائی (مەردوخ).

٥- تێپەڕ و تێ نەپەڕ (نووسەرانی تری کورد).

لیژنه بۆ مەبەستی بەسەر نەبردنی کات و یەک نەکەوتنی لێکۆڵینەوەکانی جارێ زاراوەی (تێپەڕ و تێ نەپەڕ)ی پەسند کرد، هەرچەند بەلای هەندێ له ئەندامەکانیەوه ئەم زاراوەیه لەگەڵ دەوری فیعلەکان ڕێک ناکەوێت، بەو پێیه لیژنه زاراوەی (تێ نەپەڕ) بۆ (لازم) و (تێپەڕ)ی بۆ (متعدی) قبووڵ کرد.

[ڕوونکردنەوه:

بەلای منەوه دوو زاراوەی «تێپەڕ، تێ نەپەڕ» لەگەڵ واتا و سروشتی کارەکان ڕێک ناکەون چونکه وشەی «تێپەڕ» وا ڕادەگەیەنێ که تاوی کارەکه له فاعیلەوه بۆ مەفعوول تێپەڕی بێت، لەمەشدا هەر دەڵێی فاعیلەکه بۆ خۆی مەفعووله. کارەکەش لێی تێپەڕیوه وەک له مەفعوولێکەوه بۆ مەفعوولێک تێپەڕی بێت، کەچی ئەوەی مەبەسته له فیعلی تێپەڕ چوونی تاوی فاعیلەکەیه بۆ سەر

مەفعوولەکە. بەو پێیە دەبێ زاراوەیێک بدۆزێتەوە کە وا رابگەیێنێ «فیعلێکە تاوی فاعیل بۆ سەر مەفعوول دەبات». تۆ سەیری، زۆربەی نووسەران کە تەعریفی تێپەڕ دەکەن دەڵێن: «فیعلێکە لە فاعیلەوە تێ دەپەڕێ بۆ مەفعوول». ئەم تەعریفە هەر دەڵێی بۆ ئەو فیعلانە داندراوە کە دوو مەفعوولیان پێ دەوێت. کە هەر بلکێین بە وشەی تێپەڕ، وا باشترە لە «تێپەڕاندن»ەوە زاراوەکە داتاشین، ئەوسا کە گوترا فیعلی «تێپەڕێن» بیر بۆ لایە دەڕوات کە فیعلەکە تاوی فاعیلێک دەپەڕێنێتەوە بۆ شتێکی تر. لە «تێ نەپەڕێن»یشدا دیسانەوە ئەوەمان بە بیردا دێت کە فیعلەکە تاوی فاعیل ناگوێزێتەوە بۆ شتی تر. دەبێ بزانین فیعل خۆی لە خۆیدا کاریگەر نییە، نەخێر وجوودیشی نییە، ئەگەر فاعیل نەبێ هیچ فیعلێک پەیدا نابێ. لە «تێپەڕ» و «تێ نەپەڕ»دا کە دوو وشەی زمانی کوردین مەبەست لە واتاکەیان ئەوەیە کە فاعیلەکە، یاخود تەئسیری فاعیلەکە، تێپەڕە یا تێپەڕ نییە نەک فیعلەکە، کەچی لە بەکارهێناندا تاو و تەئسیرەکە بۆ فیعلەکە دەچێتەوە، ئەمەش پێچەوانەی راستی و مەبەستە.

مەسعوود محەمەد]

کاری تێ نەپەڕ:

بێ ئەوەی تەعریفێک دابنرێت بۆ کاری تێ نەپەڕ، ئەم راستییە دەمێنێتەوە کە لە زمانی کوردی و لە هەموو ئەو رێزمانانەی زمانی تر دێنە بەر چاو یەک لە تایبەتییە بنجییەکانی کاری تێ نەپەڕ ئەوەیە کە وا مفعول (بەرکار)ی ناوێت، بەو واتایە کە ڕاستەوخۆ[1] تاوی کارا (فاعل) ناچێت بۆ سەر هیچ وشەیەک لە دەرەوەی وشە و واتای کارەکە خۆی - مەبەستیش لە ڕاستەوخۆ ئەوەیە کە گوێزانەوەی تاو بە هۆی ئامرازەوە کار ناگۆڕێت لە تێ نەپەڕەوە بۆ تێپەڕ، وەک کە (هاتم) بە دوا ئەودا دەستەواژەی (بۆ لای تۆ)ی پێوە بلکێنێت، کارەکە هەر بە تێ

(١) مامۆستا توفیق وەهبیش بەر لە لیژنە ئەم (ڕاستەوخۆ)یەی بەکار هێناوە بۆ هەمان مەبەست.

نەپەڕی مایەوە، هەرچەند بە هۆی ئامرازی (بۆ) جۆرێک لە تاوی کارەکە (یاخود کارایەکە) گوێزایەوە بەرەو (لای تۆ).

بەپێی سەرنجدان و وردبوونەوە کاری تێ نەپەڕ لە زمانی کوردیدا وەک لە زمانەکانی تریشدا لە رووی هێزەوە دەبێت بە دوو جۆر: جۆی یەکەمیان دەشێت پێی بگوترێت (تێ نەپەڕی ئاسایی، یاخود ئیرادی یاخود هەر زاراوەیێکی تر کە روونکردنەوەی مەبەست دای بنێ) لەم کارانەدا دەوری کارا (فاعل) شتێکی ئاشکرا و ئیرادییە وەک کە بگوترێت (ڕۆیشت، فڕی، هات...).

جۆری دووەمیان هەڵدەگرێت زاراوەی (لا ئیرادەی، روودان) یا هەر زاراوەیێکی تر کە لەگەڵ مەبەست رێک بکەوێت بۆی دابنرێت. لەم جۆرە کارانەدا کار (فاعل) دەورێکی تایبەتی خۆی نییە بەو واتایە کە کارەکە بەبێ خواهیشتی کارا دێتە دی، وەک:

پووشەکە سووتا

داوەکە پسا

پشیلەکە خنکا... هتد

لە عەرەبیدا ئەم دوو جۆرەی کاری تێ نەپەڕ لە یەکتر جودا کراونەتەوە بە هۆی ئەوەوە کە کاری تێ نەپەڕی روودانیان ناو ناوە (أفعال المطاوعة).

ئیستیقرا دەری دەخات کە لە زمانی کوردیدا زۆربەی کاری وقوع (روودان) لە چاوگی ئەلفییەوە وەردەگیرێن، وەک:

سووتان، برژان، خنکان، پسان، دڕان، خلیسکان، رمان، رووخان... هتد.

ئەو مطاوعەی کە لە شێوەی خوارووەدا بە (ئەلف) دەبێت لە شێوەی ژووروودا بە (یا) دەبێت، وەک:

بزدیان، پرچیان، وەریان، دڕیان، هوڕیان، ڤەمریان... ئەم کارانەی کە ناومان نان «کاری روودان – مطاوعة» لە موزاریعدا ئەلفەکەیان دەبێتە (ێ) و بۆ هەموو کەسەکەنیش دێتەوە.

| | |
|---|---|
| دەسووتێم | دەسووتێین |
| دەسووتێیت | دەسووتێن |
| دەسووتێیت | دەسووتێن |

[روونکردنەوە:

دەرکەوتنەوەی ئەم «ێ»ە لە هەموو حاڵێکی موزاریعدا تایبەتیێکی کاری روودانە، لە کاری تێ نەپەڕی ئاساییدا تەنیا بۆ کەسی سێیەمی تاک دێت وەک:

هەڵستا    هەڵدەستێت

هەڵستام   هەڵدەستم

هەڵستان   هەڵدەستن

ئەم «ێ»ە کە لە کاری تێ نەپەڕی عادەتیدا وەها بێ، دیارە لە کاری تێپەڕدا چاوەڕوانی هاتنەوەی ناکرێ لەگەڵ غەیری کەسی سێیەمی تاکدا وەک:

کێڵای    دەکێڵێت

کێڵام    دەکێڵم

کێڵایان   دەکێڵن

مەسعوود محەمەد]

سەرنج دەری دەخات لە ئاخاوتنی کوردیدا هەمان بێ هێزیی کە لە کاری رووداندا هەیە لە کاری بینامەجهوولیشدا خۆ دەنوێنێ و بووەتە هۆی ئەوە کە صیغەی بینا مەجهوول لە کوردیدا لە چاوگی ئەلفییەوە وەرگیرێت و ئەویش ئەلفەکەی لە موزاریعدا ببێتەوە (ێ) و بۆ هەموو کەسەکانیش دیار بکەوێت، وەک:

نووسرام    دەنووسرێم

دیترایت    دەدیترێیت

گیراین    دەگیرێین

بەڵام لە کاری بینا مەجهوولدا بیژووک (شاذ) نییە وەک لە کاری ڕووداندا هەیە؛ نموونەی بیژۆک لە کاری رووودان:

(مرد) چاوگی ئەلفی نییە و کاری رووودانیشە.

هەروەها کاری (گەرا) ئەمیشیان چاوگی ئەلفییە و وەک کاری رووودان گەردان

دەکرێت و لە موزاریعدا «ێ»ە کە بۆ هەموو کەسەکان دێتەوە، بەڵام کاری روودان نییە و ئیرادییە. بێ گومان کاری تر لەو بابەتانەی بیژووک لە زمانەکەدا هەیە ئیستیقرا دەریان دەخات.

[روونکردنەوە:

دەشێ لە بنەڕەتدا کاری «گەڕان» بۆ ئەو شتانە بەکار هاتبێ کە لە خۆوە دەگەڕێن وەک بگوترێ «سەعاتەکە گەڕا، مەکینەکە گەڕا» مەبەسیش دەست بە سووڕانەوە کردن بێ کە تەواوی کارێکی روودانە و چ ئیرادەی تێدا نییە، بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی کات و فرەوانبوونی زمان و مەبەستەکانی ئاخاوتن قسەکەری کورد ناچار بووبێ کارەکەی کردبێتە تێ نەپەڕی ئیرادی.

کاری «سووڕان» تا ئێستا بە زۆری هەر لە شکڵی «روودان» بەکار دێت، ناوناوەیێک نەبێ کە بەواتای «سەماکردن» بگوترێت. بەڵام کە گوتت «سووڕانەوە - سووڕامەوە، سووڕایەوە...» بە تەواوی دەبێتە ئیرادی هەرچەند گەردانەکەشی هەر هی کاری روودانە. ئەم تێکەڵبوونەی بابەتی لە یەک نێزیک دیاردەیێکی ئاشکرایە لە هەموو زمانێکدا هەرچەند پێویستی بەشیکردنەوە و لێکۆڵینەوەی هەبێ و هەیەتی.

مەسعوود محەمەد]

تێبینی:

لە زاری کرمانجی سەروودا صیغەی بینا مجهول دارشتنێکی تایبەتی خۆی هەیە بەر ئەم قاعیدەی مطاوعەیە ناکەوێت، دەگوترێت:

| چاوگ | کاری ڕابردوو | کاری ئاینده (داهاتوو) |
| --- | --- | --- |
| هاتنە کوشتن | هاتە کوشتن (کوشتنێ) | دەهێتە کوشتن |
| هاتنە خارن | هاتە خارن (خارنێ) | دهێتە خارن |

لەبەر تیشکی ئەم شیکردنەوە و لێکۆڵینەوەیەدا لیژنە ئەم تەعریفەی

خوارەوەی دانا بۆ کاری (تێ نەپەڕ):

کاری تێ نەپەڕ ئەو کارەیە کە پێویستی بە بەرکاری راستەقینە (صریح، حەقیقی) نییە، وەک:

حەسەن هات.

ئازاد نوست.

دوو کیلۆمەتر ڕۆیشتم.

مانگێک بە ڕۆژوو بووم.

کاری تێپەڕ:

ئەم کارە لە کوردیشدا وەک زمانەکانی تر تایبەتییەکی بنجی تێدایە، ئەو تایبەتیەش بریتییە لەوەی کە پێویستی بە بەرکار (مفعول) هەیە بۆ تەواوکردنی واتاکەی، وەک:

| | |
|---|---|
| خواردم | نانم خوارد |
| گرتیان | مەلیان گرت |

کاری تێپەڕیش لە رووی هێزەوە لە کوردیدا دەبێت بە دوو جۆر:

جۆری یەکەم: ئەو کارەیە کە پێویستی بەیەک (بەکار) هەیە و تاوی نارِوا بۆ دووەم، وەک:

کاغەزی نووسی

دەرسمان خوێند

جۆری دووەم: ئەو کارەیە کە پێویستی بە پتر لە بەرکارێک هەیە، وەک:

پارەت دەدەمێ

ئەحمەد پارە دەداتە مەحموود

بەردم گرتە چۆلەکەکە

[روونکردنەوە:

ئەم ڕێژە «صیغە»ی وەک (پارەت دەدەمێ، بەردێکت دەگرمێ، پاش کەمێکی تر دەتگەمێ) لە ئاخاوتنی ئێستاکەی سلێمانیدا بزر بووە.

خەلقی سلێمانی دەڵێن (پارەت پێ دەدەم، بەردێکت تێ دەگرم، پێت دەگەم). بەڵام لە چەرخی نۆزدەمدا شاعیرێکی وەک نالی گوتوویەتی:

فەرمووتە کە ماچت نەدەمێ ڕووڕەشی توو بم

ئەمساڵە بەجێ دێ ئەسەری وەعدەیی پاری

دیارە لێرە بە پێشەوە سلێمانیش وەک شوێنانی تری کوردەواری ئەم ڕێژەیەی بەکار هێناوە، یاخود هەرنەبێ لە باری تایبەتیدا بە چاولێکەری وەیا شارەزایی لە خەلقی تر لەوێشدا ڕێژەکە ناوناوە کەوتووەتە سەر زمانەوە. بە هەمە حاڵ ئەم ڕێژەیە کوردیی پەتی و ڕەسەنە و هۆی دەوڵەمەندکردنی زمانەکەشە.

تێکڕاییی لەهجەکانی کوردی لە کاتی ڕابردوودا ئەم ڕێژەیە بەکار دێنن: چوومە هەولێر، بەردم گرتە نیشانە، پارەم خستە گیرفانمەوە، نواڕیمە باغەکە. بە سرنج دەردەکەوێ ئەم ڕێژەیە کە لەگەڵ کاری تێ نەپەڕدا بەکار بێت وای لێ دەکا پێویستی بە بەرکار هەبێ، کە بۆ کاری تێپەڕیش بوو دوو بەرکاری بۆ پەیدا دەکات واتە یەکێکی لێ زیاد دەکات. من لە گوتاری (بەکارهێنانی «ی» لە ڕێزمانی کوردیدا) نەختێک بە درێژیی لەسەر ئەم باسە ڕۆیشتووم، خوێنەر دەتوانێ سەیری ئەو گوتارە بکات.

مەسعوود محەمەد]

لەبەر تیشکی ئەم لێکدانەوە وشکردنەوەیەدا، لیژنە ئەم تەعریفەی خوارەوەی بۆ کاری تێپەڕ دانا:

کاری تێپەڕ ئەو کارەیە کە پێویستی بە بەکاری ڕاستەقینە (صریح، حقیقی) هەیە، وەک:

پشیلە گۆشت دەخوات.

قادر دەستی خۆی بڕی.

دارەکە مەشکێنە.

تێبینی:

لیژنە لە بەکارهێنانی تێپەڕ و تێ نەپەڕدا دوو زاراوەی باوی بەکار هێنا بێ ئەوەی لەوەدا مەبەستی تێپەڕێن و تێ نەپەڕینی تاوی فیعل لە فاعیلەوە بۆ مەفعوول بێت.

لە کاتی وتووێژدا دەربارەی دۆزینەوەی وشەی موناسب بۆ زاراوەکانی (فاعل) و (مفعول) لیژنە زاراوەی (کارا) بۆ (فاعل) و (بەرکار) بۆ (مفعول) کە کۆڕ دایناوە پەسندی کردن.

[ڕوونکردنەوە:

پێشتر شتێکم روون کردەوە لە بارەی واتا و سروشتی فیعلەکان و گونجان و نەگونجانیان لەگەڵ واتای تێپەڕ و تێ نەپەڕدا.

بۆ ئەوە خوێنەر لە تێکەڵ پێکەڵی ئەم تێپەڕین و تێ نەپەڕینی تەئسیری کار رزگار بێت تەعریفەکەی لیژنە بۆ کاری تێپەڕ و تێ نەپەری خۆی لە دوو وشەی (تێپەڕین و تێ نەپەڕین) دزیوەتەوە کە لە راستیدا پێویست نییە بێنە ناو تەعریفەوە.

مەسعوود محەمەد]

چۆنیەتی کاری تێ نەپەڕی بۆ تێپەڕ

لیژنە بۆ چوونە بنج و بناوانی باسەکە بە دوا بیروڕای زمانەوانانی کورددا گەڕا، وەک لای خوارەوە لێی دواون:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە کتێبەکەی خۆیدا لەم باسە نەدواوە.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردی لاپەڕە (٨)دا، دەڵێ:

ئەتوانرێ فیعلێکی لازم بکرێت بە متعدی لەو فیعلە متعدییانەی وا دروستبوون باس لێکراو و کاروحاڵی فیعلە لازمەکە بە تەواوکەرێکی سەربەخۆ دێنێتە مەیدان وەکو (من دارەکەم سووتاند) لێرەدا فیعلی (سووتان) دارەکە کردی بەلام باس لێکراوی (من) پێی کرد، لە کۆمەڵی یەکەم و دووەمدا (اندن) دەخرێتە دوای رەگەوە:

| کۆمەڵ | فیعلی لازم | ڕەگ | فیعلی متعدی |
|---|---|---|---|
| ١ | نووستن | نوو | نواندن |
| | بزووتن | بزوو | بزواندن |
| ٢ | چەقین | چەق | چەقاندن |
| | لەوەڕین | لەوەڕ | لەوەڕاندن |

٣٩٩. متعدی ئەم فیعلی لازمانەی خوارەوە وان:

| کۆمەڵ | فیعلی لازم | ڕەگ | فیعلی متعدی |
|---|---|---|---|
| ١ | کەوتن | کەو | خستن |
| | هاتن | | هێنان |
| | مردن | مر | مراندن |
| | گەیین | گە | گەیاندن |
| | ڕۆیین | ڕۆ | ناردن |

٤٠٠. لە کۆمەڵی سێیەما (دن = Din) ئەخرێتە دوای مەسدەرەوە، وەکو:

| فیعلی لازم | فیعلی متعدی |
|---|---|
| سووتان | سووتاندن |
| قڵیشان | قڵیشاندن |
| گەڕان | گەڕاندن |

بۆ زیادەی مەعلومات تەماشای دەستوورەکەی بکرێت.

٣- نووری عەلی لە قواعدی زمانی کوردی لاپەڕە (١٣٥)دا دەڵێ:

بۆ گۆڕینی فرمانێکی تێ نەپەڕ بۆ تێپەڕ، ئەشێ بەر لە هەموو شتێ (ڕەگی فرمانەکە) لەو فرمانەی کە ئەویسترێ بکرێ بە متعدی، دەربهێنرێ، ئنجا:

أ- لە مازیدا، ئامرازی (اند) ئەلکێنرێ بە دوایەکەیەوە (یەعنی بە دوای ڕەگەکەوە) و لەپاشا ئەخرێتەوە جێی، وەک:

| فرمانی تێ نەپەڕ | ڕەگی فرمان | فرمانی تێپەڕ |
| --- | --- | --- |
| سوارەکە گلا | (گلا + اند) | سوارەکەم گلاند |
| منداڵەکە خەوت | (خەو + اند) | منداڵەکەم خەواند |
| گەڵاکە وەری | (وەر + اند) | گەڵاکەم وەراند |

ب- لە موزاریعدا، ئامرازی (ێن) ئەلکێنرێ بە دوایەکەیەوە (بە دوای ڕەگەکەوە) و لەپاشا ئەخرێتەوە جێی خۆی، وەک:

| فرمانی تێ نەپەڕ | ڕەگی فرمان | فرمانی تێپەڕ |
| --- | --- | --- |
| سەگەکە ئەوەڕێ | وەڕ + ێن | سەگەکە ئەوەڕێنم |
| شووشەکە ئەشکێ | شک + ێن | شووشەکە ئەشکێنم |

٤- کوردوییڤ لە کتێبی ڕێزمانی کوردی چاپی مۆسکۆ ١٩٦١ لە لاپەڕە (٧٥، ٥٨)دا باسی (اند) دەکات بە شێوەیێکی زۆر کورت کە لیژنە نەیتوانی سوودێکی لێ وەربگرێت، چونکە کە دەڵێ (ناڵێن و ناڵاندن) وە (ناڵاندن) بە تێپەڕ دادەنێت، لە ڕاستیدا خۆی تێ نەپەڕە. هەروەها کە دەڵێت (نقیساندن) ئەمیش لە «نقیسین»ەوە وەری گرتووە کە تێپەڕە.

(ئەم شەرحە دکتۆر نەسرین کردی کە خۆی رووسی دەزانێ و نووسینەکەی مامۆستا کوردوییڤیش بە رووسییە).

٥- مەکەنزی لە کتێبی لێکۆڵینەوەی زارەکانی کوردی

Kurdish Dialect Studies–1 ساڵی ١٩٦١ لاپەڕە ١٤٩دا دەڵێ:

تێپەڕ لە تێ نەپەڕەوە بەم جۆرە دروست دەکرێت:

برژانن، کولانن، سووتانن، شکانن، تۆقانن.

٦- مەردوخ لە فەرهەنگەکەیدا هەر باسی لازم و متعدی دەکات.

٧- ر. ذوالنور لە دەستووری پارسی ١٩٦٩ لاپەڕە ١٥٩دا لە لازم و متعدی دەدوێت دەڵێ لازم بە ئامرازی (اندن، آنیدن) دەکرێت بە متعدی لە فارسیدا، وەک:

سوزاند سوزانید

خنداند خندانید

٨- دیاره لە زمانەکانی تریش وەک عەرەبی و ئینگلیزی کە ئێمە شارەزاییمان لێیان هەیە، دارشتنی جۆرجۆر هەیە بۆ گۆڕینی لازم بە متعدی. سەرنج و ئیستیقرا دەری دەخات کە لە زمانی کوردیشدا وەک زمانەکانی تر گۆڕینی کاری تێ نەپەڕ بۆ تێپەڕ یەکێکە لە دەستووره بنجییەکانی ڕێزمانەکەی، بەڵام ڕێبازی گۆڕینەکەی یەک جۆر نییە.

لە کوردیدا گۆڕینی دەستووری و گۆڕینی بیژۆک هەیە.

گۆڕینی دەستووری بێ دەمەتەقە بەکارهێنانی پاشگری (اندن)ە بە دوا کاری تێ نەپەردا وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

| چاووگ | کاری تێ نەپەڕ | کاری تێپەڕ |
|---|---|---|
| چوون | چوو | چواندن |

نموونەیێکی تر کە لە «ناو»ەوە سەری هەڵداوە:

| | | |
|---|---|---|
| نەخش | نەخشان | نەخشاندن |
| خمڵ | خمڵان | خمڵاندن |

چۆنیەتی پێوەلکاندنی (اندن) بە کۆتاییی کارەوە:

یەکەم - ئەو کارە رابردووانەی کە کۆتاییان بە (ا) دێ، وەک: (خلیسکا، چەسپا، شکا..) بە پێی ئەوەی کە دوو پیتی بزوێن بە دوا یەکتردا نایەن، دەبێ یەکێ لە دوو ئەلفی کار و سەرەتای (اندن) بە ناچاری تێ بچێت و یەک (ا) بمێنێتەوە ئیتر بەم جۆرەی خوارەوە تێ نەپەڕ دەکرێت بە تێپەڕ:

| | |
|---|---|
| چەسپا | چەسپاندی |
| خلیسکا | خلیسکاندی |
| شکا | شکاندی |
| ترسا | ترساندی |
| قڵیشا | قڵیشاندی |

دووەم - ئەو کارانەی کە لە رابردوودا کۆتاییان بە پیتی «ت» دێت وەک (کەوت، نیشت، گەیشت، نووست، خەوت، ڕۆیشت، پشکووت، بزووت، سرەوت، هات) ئەم

دەستوورانەیان لێ هەڵدێنجرێت:

أ- لەو کارانەی کە دەنگی «و» هەیە وەک (کەوت، نووست، خەوت، بزووت، ڕۆیشت، پشکووت) بە زۆری پاشگری «اند - اندن» بە دوای دەنگی «و»دا دێت و دەنگەکانی تر دەقرتێن و کارەکان دەبنە (کەواندن، نواندن، خەواندن، بزواندن، پشکواندن).

لە نێوان ئەم کارانەدا کاری «کەوتن» ڕێژەیێکی تریشی هەیە بۆ تێپەڕاندن، ئەویش «خستن»ە. هەروەها کاری «بزووت» ئەویش سیغەیێکی تری هەیە کە «بزاوتن، بزافتن»ە.

١- لیژنە لە بارەی جۆری تێپەڕاندنی کاری «سرەوت»ەوە کەوتە سەر لێکدانەوە، لە ئاکامی موناقەشەدا گەیشتە ئەو باوەڕە کە کاری «سرەوت» بەر دەستووری تێپەڕاندن بەهۆی «اندن»ەوە ناکەوێ و نەبیستراوە گوترابێ «سرەواندی وەیا سرەوتاندی».

[ڕوونکردنەوە:

هەرچوار ئەندامی لیژنە بەیەکەوە بۆ ماوەیێکی باش لەم کارەی «سرەوت» دوان. هەرچەند لە نێوان ئەندامەکاندا دەنگێک ناوناوە دەیگوت ڕەنگە بیستبێتم «سرەواندی، بی سرەوێنە»، بەڵام کۆتاییی دەمەتەقە بەوە هات کە هیچ کامێک لە ئەندامان نەیانبیستووە گوترابێ «سرەواندی، سرەوتاندی».

من لێرەدا بە زیادەوە دەڵێم وشەی «سرەوتن» خۆی لە خۆیدا سروشتێکی «زاتی، ناوەکی» ئەوتۆی هەیە کە ڕێگە نەدات بەوە لە لایەن کەسێکی غەیری ئەو کەسەی خۆی «دەسرەوێت» سرەوتنەکە بەسەر یەکێکی تردا بسەپێ. سرەوتن حاڵەتێکە لە دەروونی مرۆڤ، لە ناخی، لە نەستییەوە هەڵدەقوڵێ و ناشێ لەلاوە بۆی پەیدا بکرێ. تۆ دەتوانی یەکێکی تر «بخەوێنی وەیا بشێوێنی» بە هۆی ئەو ئەمرازانەوە کە خەوتن و شێوان پەیدا دەکەن بەڵام ناتوانیت لە دەروونی هەمان کەسدا «سرەوتن» پەیدا کەیت چونکە سرەوتنەکە لەلاوە نایەت بۆی، لەم حاڵەتەدا دەتوانیت بڵێیت

«هێـورم كـردەوە» چونكە لە هێـوركـردنـەوەدا تۆ هۆی نارەحـەتی دەرەوێنیتەوە كە لە لاوە بۆ كەسەكە هاتووە.

مەسعوود محەمەد]

٢- مـامـۆسـتـا مـەسـعـوود دەڵێت لـە هـەندێ ناوچـەدا كـاری «قـەڵشت» بە واتای «قڵیشـا، قەڵیشـەوە» دێت كە هەردوویان تێ نەپەڕن. ئەم كارەی «قـەڵشت» دوو جۆر تێپەڕاندنی هەیە: یەكەمیان بە «اندن» كە چاوگەكەی دەبێتە «قەڵشاندن». دیارە لێـرەدا دەنگەكـەی «ت»ی كـە لـە كـۆتاییی «قـەڵشت - قـەڵشـتن»دا هـەیە سـواوە هەروەك لە زۆر جـێگەدا ئەم دەنگە تـێ دەچێ وەك «دەست، مـەبەست» دەبنـە «دەس، مـەبەس». جـۆری دووەمی تێـپـەڕاندنی «قـەڵشت» بە هۆی سـیـغـەیێكی تایبـەتیـیـەوە دەبێ كـە «قـەلاشتن»ە. هـەر لەم وشـەیەوە وشـەی «قـەلاشكەری» وەرگیـراوە بۆ ئەو داری سووتاندنەی كە بە هۆی بیورەوە پارچە دەكرێ ئەوجا دەكرێتە بارەدار.

٣- مـامۆسـتـا سـادق بەهائەدین دەڵێ ئەم كارەی «قـەڵشت» كە لە زاری سـەروودا دەبێتە «كەلشت» كارێكی تێپەڕە بۆ كەسەكانی یەكەم و دووەم، بەلام بۆ كەسی سێیەم دەبێتە تێپەڕ و تێ نەپەڕ، بۆ وێنە:

من كەلشت

مە كەلشت

تە كەلشت

وە كەلشت

دارای دار كەلشت

وان دار كەلشت

كە ئەمانە هـەمووی تێپەڕن.

بەلام كە دەڵێین: «دار كەلشت - ئەو كەلشتن» لەمانەدا كارەكە بوو بە تێ نەپەڕ.

هەروەها مامۆستا سادق بەهائەدین روونی كردەوە لە زاری كرمـانجی سەروودا لەو تاقـمـە فـیـعلەی كـۆتاییـیـان بە پیـتـی (ت) دێ و واویان تێـدایە، وەك (كـەوت، نووست، خەوت، ڕۆیشت، پشكووت...) دوو كاری (خەوت و ڕۆیشت) وجوودی نییە.

بۆ تێپەڕاندنی (کەوتن)یش تەنیا سیغەی (خستن) هەیە، واتە (کەواندن) نییە، بەڵام (نووستن، پشکووتن)، وەک زاری کرمانجی خواروو، بە پاشگری (اندن) دەبنە تێپەڕ (نڤاندن، بزڤاندن، پشکڤاندن).

ب- لە فیعلە تائییەکاندا:

١- گەیشتن: بە تێکرایی لە کرمانجی خوارووودا تێپەڕاندنی ئەم کارە (گەیاندن)ە، کە لە بنەڕەتدا لە (گەیین)ەوە وەرگیراوە. بەڵام لە هەندێ ناوچەدا سیغەی (گەیشتاندن) هەیە تەنیا لە رابردوودا کە بە واتای (انضاج = پێ گەیاندن) دێت. بەڵام (گەیاندن) لەو ناوچەنەدا بۆ دوو واتای (ایصال و انضاج) بەکاردێ. موزاریع و ئەمری (گەیشتاندن) لە (گەیاندن)ەوە وەردەگیرێت و دەبێتە (دەگەیێنێ) و (بگەیێنە).

لە زاری سلێمانیدا بەرانبەر بە (گەیشتاندن) پێ گەیاندن هەیە، وەک:

پێم گەیاند و پێی دەگەیەنم

مامۆستا سادق بەهائەدین دەبێژێ کاری (گەیشتن) لە کرمانجی سەروودا (گەهشتن)ە و تێپەڕاندنی (گەهاندن)ە. کاری (گەیین)یش لە زاری سەروودا نییە.

٢- نیشتن: لە زاری سلێمانیدا تێپەڕاندنی ئەم کارە بە (اندن) نەبیستراوە.

لە دەوروبەری هەولێر و کۆیە و شوێنانی تر دەگوترێت (نیشتاندن) وەک کە بڵێی:

دام نیشاند و دام نیشتاند.

لە ئایندەدا دەبێتە: (دای دەنیشێنم).

لە ئەمردا دەبێتە: (دای بنیشێنە).

لە زاری کرمانجی سەروو و سلێمانیدا تێپەڕاندنی (دانیشتن) هەر بە (دانان) دەبێت. هەروەها لە زاری کرمانجی سەروودا (نیشتن) لیسیانە، وەک:

مریشک لیسیا.

[روونکردنەوە:

کاری «هات - هاتن» نەختێک درێژەی هەیە.

تێپەڕاندنی «هات» بەر دەستووری «اند» ناکەوێت چونکە لە کەس

نەبیستراوە «هاتاندی» و تەنیا صیغەی «هێنای» هەیە. ئەم وشەیە «هات» کە لەگەڵ پێشگریشدا بەکار دێت دیسانەوە تێپەڕاندنەکەی بە هۆی «هێنان»ەوە دەبێت وەک:

بەڵام وشـەی «هەڵهـات» کـە بە واتای بەزین و فـیـرازکـردن بێت صیغەی تێپەڕاندنی نابێتە «هەڵی هێنا» بەڵکو «بەزاندی» بۆ بەکار دێت.

وشەی «لێ هاتن»یش سێ واتای هەیە:

یەکەمیان: «لێ وەشانەوە» کە تێپەڕاندنی دەبێتە «لێی وەشاندەوە» نەک «لێی هێنا».

دووەمـیـان: بە واتای گەیشـتنی نێرینەی ئاژەڵ بە مێیینەی. لەم حاڵەدا وشەی «لێهاتن» وەک خۆی دەمێنێتەوە و دەگوترێ «لێی هات».

سێیەمیان: بە واتای نەخۆشی و دوومەڵ دەرکردن. لە مەدا وەک خۆی دەمێنێتەوە و دەگوترێ «سەندانی لێ هات، کوانی لێ هات» بەڵام ناوناوە وا دەبێ لە ڕێی قیاسەوە خەڵک دەڵێ «سەندانی لێ هێنا» کە راستییەکەی «سەندانی گەیاندێ»یە. بە نیسبەت «کوان، دوومەڵ» دەشێ بگوترێ «ئاوە پیسەکە کوانی لە دەستی هێنا».

دەگوترێ «خـوێنی لێ هێنا» کە ئەمە تێپەڕاندنی «خوێنی لێ هات»ە.

کاری «ڕۆیشتن» ئەویش نەختێک روونکردنەوەی دەوێ:

ڕۆیشتن تەنیا بە پێی لەکارهێنانی دەستووری دەبێتە «رواندن» وەیا «ڕۆیشـتـناندن» دەنا هەرجارە بە پێی داخوازیی جێگە لە قسەکردندا دەبێتە «ناردن - هەناردن» وەیاخود «دەرکردن».

ڕۆیشـتنی عـادەتی بە تێپەڕاندن دەبێتە «ناردن، هەناردن» بە نموونە:

دارا ڕۆیشت بۆ بازاڕ.

دارام ناردە بازاڕ، هەناردمە بازاڕ.

بەڵام لە حاڵەتێکی تردا دەبێتە «دەرکردن» بە نموونە:

دارا لە خۆوە نەڕۆیشت، کاکی دەری کرد.

وشەی «رواندن» لە «روان»ەوە دەبێتە تێپەڕ، ئەو روانەی بە واتای شینبوونی درەخت و گیایە.

رواندن بە واتای (هەناردن) تەنیا بۆ شتی مەعنەوی دەست دەدا وەک:

کارەکەم رواند. کەس نەیگوتوە: دارام رواند.

مەسعوود محەمەد]

سێیەم: ئەو کارانەی لە رابردوودا کۆتاییان بە (ی) دێ:

ئەمانە لیستەیەکن لە نموونەی ئەو کارانە (وەری، گەیی، وەڕی، باری، فڕی، خزی، رزی، گەنی، لەرزی، تەزی، مەیی، بەزی، تەپی، پەڕی، کۆکی، پژمی، تەقی، پێکەنی«کەنی»). ئەم کارانە دەستوورێکی گشتیی تێپەڕاندن هەیە کە بریتییە لە قرتاندنی (ی)ەکە و لکاندنی (اندن) بە کۆتاییی کارەکەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| وەری | وەراندی |
| مەیی | مەیاندی |
| بەزی | بەزاندی |

یان یەکسەر بە لادانی (ین) لە چاوگی تێ نەپەڕەوە و خستنەسەری (اندن) لە کۆتاییی رەگی چاوگ، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| وەرین | وەر | وەراندن |
| مەیین | مەی | مەیاندن |
| بەزین | بەز | بەزاندن |

تێبینی: لەم کارەدا...

آ- کاری (کەنین) لە زاری کرمانجی سەروودا بۆ تێپەڕاندنی دەگوترێت (کەناندن) بەڵام لە زاری خواروودا دەگوترێت (هێنانە پێکەنین و خستنە پێکەنین).

ب- کاری (فڕین) له زاری کرمانجی سەرووا تێپەڕاندنی به (فڕاندن) دەبێت، بەڵام له زاری کرمانجی خوارووا دەبێته (هەڵفڕاندن). که ئەمه له هەمان کاتدا تێپەڕاندنی «هەڵفڕین»یشه.

[ڕوونکردنەوە:
کاری «خشین» له تێپەڕاندندا نابێته «خشاندن» بگره دەبێ بگوترێ «خشکه پێکردن». وەک «خشین» کاری «خشان» ئەویش نابێته، لەوێشدا دەبێ بگوترێ «له یەکتر خشاندن».
هۆی ئەم تەرزه له کار هێنانه و دروست نەبوونی دەستوور بنجییەکه، ئەویش له بابەتی ئەو تەعلیلەیه که لەگەڵ کاری «سرەوین»دا باس کرا. ئەم کارانه بەو بگرەو به پێی سروشتیان لێیان بکۆڵەوە.
دەمڕاستی لیژنه]

چوارەم – له کاری تێ نەپەڕی دالی: ئەوەی هاتبێته بەر سرنج هەر کاری (مرد) هەیه، تێپەڕاندنی ئەویش به قرتاندنی دالەکه و لکاندنی (اندن) دەبێت و دەگوترێت (مراندن).

[ڕوونکردنەوە:
وشەی «ڕابردن» به ڕواڵەت وا پێ دەچێ وشەیێکی لێکدراو، وەیا داڕێژراو بێ، له پێشگری «ڕا» و کاری «برد - بردن» پێک هاتبێ.
بردنەکەش هەر ئەوەبێ که دەزانین کارێکی تێپەڕە به واتای «ذهب به»یه.
ئەم ڕواڵەته درۆزنه.
وشەی «ڕابردن» لەو وشانەیه بێ پێشگرەکەی «ڕا» بەکار نایەت وەک «ڕاچڵەکین، ڕاپسکووتن» له واتاشدا زۆر جودایه له کاری «بردن» چونکه بردنەکەی «ڕابردن» له بنەڕەتدا تێ نەپەڕە هەر بۆیەیشه لەگەڵ پێشگرەکەش به تێ نەپەڕی دەمێنێتەوە. بەڵگەی

بۆ ئەمە کە «رابردن» لە وشەی «بردن»ەوە وەرنەگیراوە زۆر بە ئاشکرایی لە تصریفدا دەردەکەوێت:

بردن: بردی، بردم، دەبات، دەبەم، بردمان، دەبەین.

رابردن: رابرد، رابردم، رادەبرێت، رادەبرم، رابردین، رادەبرین.

چەند بەرچاوە تصریفی «بردن» هی متعدییە، تصریفی «رابردن»یش هی لازمە و لە موزاریعدا بە تەواوی لێک دەترازێن، ئەگەر «بردن» لە وشەی «رابردن»دا متعدی با دەبوو تصریفەکەی وەهابێ:

| | |
|---|---|
| ئەو رای برد | ئەو رادەبات |
| من رام برد | من رادەبەم |
| تۆ رات برد | تۆ رادەبەیت... |

وا پێ دەچێ لە کۆنەوە فیعلەکەی «رابردن» دەنگێکی تری تێدا بووبێت و بە تێپەڕینی کات سوابێ و لەگەڵ «بردن» بە شێوە یەکیان گرتبێتەوە وەیاخود «بردن» سوابێ و لەگەڵ «رابردن» یەکیان گرتبێتەوە، وەک ئەوەی «بوردن» بووبێت کە ئێستاش لە فاسیدا «بُردَن – بوردەن» ماوەتەوە.. ئەگەر ئەم گریمانەی دوایی راست بێ تارادەیێک تێمان دەگەیەنێ بۆچی لە موزاریعدا وای لێ دێ:

«دەبەم» هەر دەڵێی بزوێنەکەی «و» لە وشەی «بوردن»دا خۆیەتی لە موزاریعدا پەیدا دەبێتەوە و دەیکاتە «دەبەم».

بەم لێکدانەوەیە روون دەبێتەوە ئەو وشەی «رابردوو» کە نووسەران بە کاری دێنن بە واتای «ماضی» جێی خۆی نییە، راستییەکەی «رابردوو»وە چونکە رابردن بە واتای «بەسەرچوون، تێپەڕین» دێت. وشەی «بووردن» بە واتای «عەفوکردن، بەخشین» دێت. چ پێوەندیی بە «ماضی، تێپەڕیو، رابردوو»وە نییە.

هەر بەمەشدا ساغ دەبێتەوە، ئەوەی کە پێشتر لە لاپەڕە

(٢٦٥)دا[١] گوتم له بارەی نەگۆڕانی تێپەڕ و تێ نەپەڕ بە هۆی پێشگرەوە رایەکی راستە چونکە دەرکەوت «بردن» متعدییە «رابردن»یش بە ئەصل لازمە نەک بە هۆی پێشگری «را» بووەتە لازم.

سەیری تصریفی «راکردن، هەڕاکردن» بکە دەبینی لەوێدا فیعلەکەی «کردن» هەر بە تێپەڕی تصریف دەکرێ:

رام کرد رات کرد راتان کرد

رام گرت رات گرت راتان گرت

رام وەشاند رات وەشاند راتان وەشاند

ئەگەر «کردن»[٢] لە هەڕاکردندا بوویانە لازم دەبوو ئەویش وەک «رابردن»ی لێ بەسەر بێ:

رابردم

راوەستام

راهاتم

«راکردن» کەچی دەگوترێ رام کرد وەک تێپەڕ.

شتێکی تریش بەمەدا روون دەبێتەوە: ئەم فیعلەی «رابردن» دووەم

---

(١) ئەم بەشە نووسینە کە لە گۆڤارەکەی کۆڕ (بەرگی سێیەم - بەشی دووەم)دا بڵاو کرایەوە پێشەکییەکی لەگەڵدا بوو، لەو پێشەکییەدا روونم کردبووەوە کە پێشگر فعلی تێپەڕ و تێ نەپەڕ وەک خۆی دەهێڵێتەوە. کاتێک نووسینەکە (لێکۆڵینەوەکانی لیژنەی زمان و زانستەکانی) خرانەوە سەر یەک لە شکڵی کتێبدا پێشکەکییە کە هەڵبواردرا. ئەم لاپەڕەیەی (٢٦٥) کەوتووەتە ناو پێشەکییەکەوە بۆیە لێرەدا نایەتە بەرچاو. مەسعوود محەمەد.

(٢) لەم پێشەکییەدا روونم کردبووەوە کە وشەی (راکردن) کورتکرایەوەی (هەڕاکردن)ە. بەو پێیە ئەو (را)یە پێشگرە مەشوورەکەی (راهاتن، راوەستان، راپەڕین....) نییە بگرە وشەیێکی واتادارە وەک (غار، بەزین) بۆیە فعلەکە لە واتادا بۆتە تێ نەپەڕ وەک (غارکردن). قیاسی ئەم وشەیە لە (گریان کردن) بکە کە ئەویش لە واتادا بووەتەوە تێ نەپەڕ چونکە گریان تێ نەپەڕە. مەسعوود محەمەد

نموونەیە لە پاش فیعلی «مردن» کە فیعلێکی «دالی»یە و لازمیشە، لەم دوو فیعلە بترازێ هەموو فیعلەکانی تری دالی تێپەڕن. چی لە لاپەڕە (١٨٧) بەشی یەکەمی بەرگی سێیەمی گۆڤاری کۆڕدا لە گوتارەکەی «بوژاندنەوە..» نووسراوە لە بارەی «زند» کە فیعلێکی «دالی»یە و تێ نەپەڕە هەڵەیە، وشەی «زندوو»ش نابێتە بەڵگە کە «زند» فیعلە و زیندوو لەوەوە هاتووە چونکە ئەم «و»ە دەچێتە دوای گەلێک وشەوە کە فیعل نین وەک «سەروو، ژێروو»، لە بەکارهێنانیشدا کەس ناڵێ «من زندم، تۆ زندیت، ئەو زند». چ تۆژینەوەی مێژوییشمان نەبیستووە ساغی کردبێتەوە پێش چەند هەزار ساڵ فیعلی «زند» بەکار هاتووە. ئەگەر ئەمە ساغ بووەوە ئەوسا دەیسەلمێنین.

[مەسعوود محەمەد]

پێنجەم - لە کاری تێ نەپەڕی واوی بە لابردنی نوونی چاوگ و لکاندنی پاشگری (اندن) بەو وشەی کە دەمێنێتەوە کاری تێپەڕ دروست دەبێت، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| چوون | چوو | چواندن |
| بوون | بوو | بواندن |

شەشەم- پاشگری (اندن)ی بێ تێپەڕاندن: هەرچەند لە بنەڕەتدا (اندن) بۆ تێپەڕاندنە بەڵام لە زاری کرمانجی خوارووودا کۆمەڵێک کار هەن، کە ئەم پاشگرەیان پێوەیە و چ واتای تێپەڕاندنیشیان تێدا نییە، بۆ نموونە: زیڕاندی، بۆڕاندی، ناڵاندی، جریواندی، حیلاندی.

ئەوەی سرنج رادەکێشێ لەو فیعلانەدا ئەوەیە کە زۆربەیان یا هەموویان دەنگی سروشتین لە ڕێی بەکارهێنانی (اندن)ەوە لە کۆتاییدا دەبن بە (کاری تێ نەپەڕ).

تێبینی:

١- د. نەسرین فەخری دەڵێت:

زۆربەی ناوی دەنگەکان بە تایبەتی ناوی دەنگە سروشتییەکان بە یاریدەی (اندن) دەبن بە چاوگ و کاری تێ نەپەڕ. هەندێکیش لەم ناوانەی دەنگ نەک بە

یاریدەی (اندن) بگرە بە یەکێ لە نیشانەکانی تری چاوگ دەبن بە چاوگ و کاری تێ نەپەڕ، لەم حاڵەتەدا (اندن) بەشێک لەوانە دەکات بە تێپەڕ، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| تەقین | تەقەتەق | تەقاندن |
| گریان | گریە | گریاندن |

٢- مامۆستا مەسعوود دەڵێ:

هەرچەند (اندن) لەو کارانەدا پێویستی بە مەفعوول نییە و لەو رووەوە فیعلەکان بە لازم حیساب دەکرێن، دیسان هێزی خۆی دیار خستووە بەوەدا کە هەر خۆی بە قەدەر (کردن) تاوی هەیە لە واتا و ناوەرۆکی کارەکاندا. کە دەڵێی (زیراندی) وەک ئەوەیە بڵێی (زیرەی کرد)، حیلاندی (حیلەی کرد). کورتەی قسە ئەمەیە لەم کارانەدا هێزێکی (اندن) هەر دیار دەکرێ چەنداوەکو کارەکان لە هێزدا نەگەیشتبنە رادەی تێپەڕاندن. بەلای باوەڕی منەوە بۆ دیاردانی هێزی (اندن) لەو کارانەدا ئەوەندە بەسە کە کۆمەڵێک ناوی دەنگی کردووە بە (کار).

لە بارەی «گریان و تەقین»ەوە رای من ئەوەیە ئەم دوو کارە لە ناوی سروشتییەوە وەرنەگیراون: «گریە» ناوی چاوگە وەک «ترس، مەترسی، لەرز» نەک دەنگی سروشتی، تەقینیش لەگەڵ «تەقە» خزمە نەک تەقەتەق. تۆ ناڵێی «تەقەتەقم بیست، کە دیتم خەڵقەکە تفەنگ دەتەقێنن». تەقەتەق بۆ چەقچەقەی منداڵ و شتی ئەوتۆیی بەکار دێت کە تەقینی تێدا نییە، بەڵام کە گوتم «تەقەم بیست، دەرکەوت بارام دەمانچەی تەقاندبوو» کەس سەیری بە قسەکەم نایێ چونکە تەقە و تەقین یەک شتن تەنیا ئەو جوداوازییە هەیە لە نێوانیاندا کە «تەقین» چاوگە و «تەقەش» ناوی چاوگ کە لەوێدا روودان «حدوث» مەبەس نییە بگرە واتای «مجرد» مەبەسە.

٣- مامۆستا سادق بەهائەدین دەڵێ:

لە زاری کرمانجیی سەروودا ئەم جۆرە کارانە نایەنە بەر چاو، بە هۆی بەکارهێنانی (کردن) بە دوا دەنگەکاندا کارەکان پەیدا دەبن، وەک:

کرە قیڕی، زیرزیر کر.

٤- لەو کارانەدا کە پاشگری (ەوە)یان بە دوادا دێ، وە بە هۆی (اندن)ەوە کراون بە متعدی یا لە دەنگەوە بوونەتە کار، (اندن) لە پێشەوە دێ، ئەوجار پاشگری (ەوە)، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| سووتاندنەوە | کوژاندنەوە | رازاندنەوە |
| سووتانەوە | کوژانەوە | رازانەوە |

لیژنە ئەم لیستەیەی پێک هێنا بۆ ئەو کارانەی تێپەڕیان هەیە بە بێ پاشگری (اندن):

| تێ نەپەڕ | تێپەڕ |
|---|---|
| ١- کەوتن | خستن |
| ٢- هاتن | هێنان، هانین |
| ٣- چوون | بردن |
| ٤- ڕۆیشتن | ناردن |
| ٥- رژان | رشتن |
| ٦-گۆڕان | گۆڕین |
| ٧- گەڕان | گێڕان |
| ٨- سڕانەوە | سڕینەوە |
| ٩- پچڕان | پچڕین |
| ١٠- بزووتن | بزاوتن |
| ١١- سوان | سوین (سوون) |
| ١٢- قەڵشتن | قەلاشتن |
| ١٣- قڵیشان | قەلاشتن |
| ١٤- مانەوە | هێشتنەوە، هێڵانەوە |
| ١٥- مان | هێشتن، هێڵان |
| ١٦- کشانەوە | کێشانەوە |
| ١٧- هەڵستان | هەڵگرتن |

تێبینی:

سێ کارەی خوارەوە:

١- دڕان     دڕین
٢- بڕان     بڕین
٣- گیران    گرتن
لێکۆڵینەوەیێکی تایبەتی دەوێت:

بۆ ساغکردنەوەی لایەنی (مبنی للفاعل و مبنی للمفعول)بوونیان ئەو کات و دەرفەتە لە چنگ لیژنەدا نییە بڕیار بدات ئاخۆ ئەو سێ فیعلەش دەچنە ناو لیستەی سەرەوە یا صیغەی یەکەمیان (دڕان، بڕان، گیران) لە حەقیقەتدا بۆ (بناء للمفعول)ە بەڵام نەختێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە، تا ڕادەیەک گومان لە فیعلی (گۆڕان) و (گۆڕین)یش دەکرێت، کە وا وەک ئەم سێ کارەی سەرەوە بن، بەڵام ئەمیشیان کاتێکی زیاتری دەوێت لەوەی کە لە بەر چنگی لیژنەدایە بۆ ساغکردنەوەی.

[ڕوونکردنەوە:
دەبێ لە پێشەوە ئەوە بڵێم، لە لیستەی کارەکانی سەرەوەدا کارێک هەبوو کە لیژنە بە تێ نەپەڕی دانابوو من لەلای خۆمەوە سڕیمەوە بێ ئەوە پرس بە ئەندامانی لیژنە بکەم، هۆی پرس نەکردنیش دووریی ئەندامەکانە لێمەوە. کارەکە «بووردن» بوو کە لە لیستەکەدا وا دانرابوو تێ نەپەڕە و تێپەڕاندنی بە «بواردن» دەبێت.
ئەم بووردنە لێکۆڵینەوەی دەوێت:
بووردن لە بارێکی سەیردایە: لە لایێکەوە کە دەڵێی «بمبووره، دەتبوورم...» کردت بە تێپەڕ، کەچی لە تصریفدا وەک تێ نەپەڕ تصریف دەکرێت: «بووردین، بووردن، بوورد، بووردیت...» ئەگەر تێپەڕ با دەبوو بگوترێ: «بووردمان، بووردیان، بووردی، بووردت...». بەڕاستی «بووردن»ە و تێپەڕ بوون و نەبوونی لێکۆڵینەوەیێکی تایبەتی دەوێت، بەڵام دەبێ ئەوەندە بڵێم ئەگەر بەلای سەلیقەوە خۆی بە تێ نەپەڕ نواندبا دەبوو لیژنە کاتی خۆی بووردنیشی خستبا دوای «مردن»ەوە بە ناوی ئەوە کە ئەمیش

وەک مردن کارێکی تێ نەپەڕە لە کارەکانی دالی. دوور نابینم بە تێپەڕینی کات تصریفیشی وردە وردە بەرەو هی تێپەڕ بڕوات و بگوترێ «بووردمان، بووردت، بووردیان...».

ئەوجار بابێمە سەر تێبینییە تایبەتییەکانی خۆم.

کات و دەرفەت لە دوور رووەوە تەنگ دەبێتەوە بۆ لیژنە: یەکەمیان ئەوەیە کە بەجێهێنانی فەرمان داوای خێرایی دەکا لە چالاکیدا، کە ئەمە راستەوخۆ دژی درێژەکێشانی لە رادە بەدەرە. دووەمیان ئەوەیە کە دەمەتەقەی نێوانی ٤ کەسی ئەندامی لیژنە ئەگەر سنووری بۆ دانەندرێت لەوانەیە کۆتایی نەیەت.

من لێرەدا کە قسەکانم بەر دەمەتەقەی لیژنە ناکەوێت، چ زیانێک بەکار وەیا بیرورای ئەندامانی ناگەیەنێت، بۆیە بە کورتی رای خۆم دەردەبڕم:

١- «دڕا» بە ڕاستی کارێکی تێ نەپەڕە و صیغەی روودان «مطاوعة»یە وەک «سوتا، برژا، پسا...). ئەگەر بڵێین لەوانەیە صیغەی «بناء للمجهول» بێ دەبێ کورتکرایەوەی «دڕرا» بێت و لە کاری «دڕین»ەوە وەرگێرابێ. ئەگەر ئەمە راست با صیغەی «مبنی للمجهول» بە هۆی «اند»ەوە بکرێتە تێپەڕ و ببێتەوە «مبنی للمعمول». تۆ کە گوتت «کوژرا» صیغەی «مبنی للمجهول»ە لە «کوشتی»یەوە وەرگیراوە، هەرگیز بە بیرتدا نایەت بڵێی «کوژراندی» سەرلەنوێ بووەوە بە صیغەی «مبنی للمعلوم» و بە واتای «کوشتی» دێت.

٢- «بڕا» نەختێک جودایە لە «دڕا».

وشەی «بڕا» دەشێ دوو واتای جوداوازی لێ وەربگیرێت:

یەکەم: بە واتای «تەواو بوون، کۆتایی هاتن» وەک کە دەڵێن «هەر خواردم تا هەموو نانەکە بڕا، بە زیانە گەورەکەی پار پارەکەی بڕا». لەم جۆرە بەکارهێنانەدا وشەی «بڕا» فیعلێکی «مبنی للفاعل»ی روودان «مطاوعة»یە، تێپەڕەکەشی بە پێی دەستوور بە

هۆی «اند» دەبێتـــە «براندی» وەک کـــە بڵـێـی «نانەکـــەت براند، پارەکەت براند، هەموو شەکرەکە بە جارێ مەبڕێنە..»».

دووەم: بە واتای «انقطاع»ی عـەرەبـی، وەیا ئەو واتایەی کـە لەوەوە نێـزیکە بە پێی جـێگە. لـەم حـاڵـەتەدا وشـەی «بڕان» بێگومـان صـیـغـەی «مـبنی للمـفـعـول»ە و لە کـاری «بڕین»ەوە هاتووە، بەڵام نەختێک سوان و لێقرتانی بەسـەردا هاتووە. دەزانین کاری «بڕین، بڕی» وەک هـەموو کارێکی تری تێپەڕ صیغـەی بنا للمفعولی هەیە «کـوشـتـی، کـوژرا - خـواردی، خـورا - دیـتی، دیتـرا...». بە پێی دەستووری داڕشتنی کاری مبنی للمفعول «بڕی» دەبێتە «بڕرا» بە لادانی دەنگی «ی» لە کۆتاییی وشەکەوە و هێنانی «را»ی صیـغەی بنا للمـفـعول، وەک «نووسی، نـووسرا - دزی، دزرا». ئەوەی لەگەڵ «بڕرا»دا کراوە هەر ئەوەیە کە لەبەر قورسـاییی هاتنی دوو دەنگی «ر» بە دوای یەکتـردا دەنگە «ر»ەکەی لاواز سـواوە. هەندێک کەس لە گەلێک ناوچەکانی کوردسـتـان بۆ ڕزگار بوون لەم قـورسـاییـیە دەڵێن «بڕدرا». نموونەی وەک «بڕا، بڕرا، بڕدرا» لە کوردیدا زۆرە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| کڕی | کڕرا | کڕدرا | کڕا |
| سڕییەوە | سڕرایەوە | سڕدرایەوە | سڕایەوە |
| دڕی | دڕرا | - | دڕا |

٣- گـیـرا: ئەم وشـــەیە مـــەیلە و لێـڵـە. وا پێ دەچێ بە درێژاییی مێـژوو لە ئاکـامی بەکـارهێنانی دەسـتـووری و بیژۆکـدا گـۆڕان و شێوانێکی بەسەردا هاتووە کە ئێستا ڕاستییەکەی لە ئێمەوە دیار نییە.

لە ناوچەی پژدەر، زۆر جـاران و لەلایەن گـەلێ کەسـەوە بە تایبـەتی خـەلقی لادێ، دەگوترێ «گیرەرا، دەگـیـرەرێ» کە ئەمـە صیـغەیەکە ڕاستەوخۆ بە شێوەی مبنی للمـجـهول هـاتووە بەڵام چ صـیـغەیێکی مبنی للمعلوم نییە لەوە بچێ کە «گیرەرا»ی لێ کەوتبێتەوە. هەموو ئەو کەسـانەی «گـیـرەرا» بەکـار دێنن لە حـاڵی بەکـارهێنـانی مـبنی

للمعلومدا دەگەڕێنەوە بۆ «گرتی، دەگرێ». بەڵام صیغەی «گرا، دەگرێ»ش بەکار دێنن بە واتای «گیرا».

ناوچەکانی تری کوردستان کە دەڵێن «گیرا، دەگیرێ» ئەوانیش هەر «گرتی، دەگرێ» بەکار دێنن بۆ مبنی للمعلوم.

بەلای منەوە «گیرا» لە حاڵ و شێوەی ئێستاکەیدا صیغەیێکی «مبنی للمجهول»ە بە واتای «گرترا» کە ئەمیش صیغەیێکی زیندووە و زۆر کەس بەکاری دێنێ. بەڵگە بۆ ئەمەی کە «گیرا» مبنی للمجهولە، سەرەڕای واتاکەی کە هەستی پێ دەکرێ، لەوەوەش دێتە دەست کە ئەگەر مبنی للمجهول نەبێ دەبێ فعلی «روودان، مطاوع» بێ. ئەوساش دەبوو وەک هەموو فیعلێکی تری روودان بە هۆی «اند»ەوە بکرێ بە «تێپەڕ» و بگوترێ «گیراندی» کە ئەمە کەس نەیبیستووە.

وادەزانم لەمەدا گومان نییە، واتە «گیرا» کارێکی مبنی للمجهولە بە واتای «مُسِكَ، لُزِمَ»ەی عەرەبییە. لە حاڵی ئێستادا مبنی للمعلومی «گیرا» هەر «گرتی» هەیە هەرچەند رواڵەتی پێ ناچێ کە خۆی سەرچاوەی «گیرا» بێ وەک کە «خواردی، دیتی، شووشتی» سەرچاوەی «خورا، دیترا، شوورا»یە. لەو شوێنانەدا کە «گیرەرا» بەکار دێنن و لە هەمان کاتیشدا «گرا» دەڵێن نەختێک جوداوازیی واتا دەخەنە نێوانیانەوە. لەو شوێنانەدا هەر دەڵێی «گرا» کورتکرایەوەی «گرترا»یە و لە گرتنەوە وەرگیراوە. بەو پێیە رێی تێ دەچێ «گیرەرا، گیرا» لە فیعلێکی ترەوە هاتبێ کە نزیکی «گرتن»ە بەڵام بە جۆرێک لەو جۆرانەی وشە تێ دەچێ و نامێنێ ئەویش نەماوە و شوێنەواری کوێر بووەتەوە.

بەدوا ئەم لێکۆڵینەوەیەدا تێبینییەک دەمێنێتەوە کە پشتگوێ ناخرێ:

هەندێ شێوەی بەکارهێنانی «گیرا – گیران» هەیە نایباتەوە سەر «مبنی للمجهول» وەک وشەی «دەزگیران – دەستگیران» وەیاخود

شــوێنێکی ســەخت هەیە پێی دەڵێن «لغــاوگــیــر». لەم بابەتە بەکــارهێنانــە وشــەی تر زۆرن «شــێــخی دەســتگیــر، فــلانــەکــەس یەکجار گیرە، گیروگرفت، لاگیرە... هتاد». رەنگە بگوترێ هەندێ وشە لە رێی تاوێ زمانی فارسی بۆ سەر کوردی پەیدا بووبن وەک «شــێــخی دەســتگیــر»، چونکە لە فــارســیــدا صــیـغــەی ئاینده «مضارع»ی کاری «گرفت، گرفتن» دەبێتە «مـی گیرد» اسم فاعیلە لێکدراوەکانیش لەم صیغەی «می گیرد»ەوە هەڵدەهێنجرێن، بەڵام زۆربەی وشــەکــانی تر پێوەندییــان بە فــارســیــیــەوە نییــە. ئەم بەکــارهێنانە بیــر بۆ هێندێ دەبات کــە «گـیــرا» کــارێکی مـبنی للمعلوم بێت چونکە دارشتنی وەک «دەزگیران، لغاوگیر، لاگیرە» لە مبنی للمجهولەوە نایەت، واتای وشـەکانیش فاعلیەتیان تێدایە نەک مەفعوولیەت.

ئەم تێبینیەش تیشکێکە بۆ سەر باسەکە نەختێک لە یارمەتیدانی خوێنەر زیاد دەکات.

٤- گۆڕا: لە بەکارهێنانی ئێستاکەیدا کاری «گۆڕا» وەک کارێکی مبنی للمعلوم لە شکڵی کاری روودان بەکار دێت بە واتای «تبدل». کە ویسـترا مـبنی للمـجـهول ئەم کـارە بگوترێ زۆربەی خـەلق لە دەرەوەی ناوچەی سلێمـانی دەڵێن «گۆڕدرا» بە واتای «بُدِّلَ» کە لە «گۆڕین»ەوە هاتووە. ئەمە شـتێکی ئاشکرایە بەڵام سـەیر لەوەدایە کە «گـۆڕا» وەک کـارەکـانی تر بە هۆی «اندن» ناکـرێتـەوە تێـپـەڕ، تاکـە صـیـغـەی تێپـەڕی هەر «گـۆڕی - گـۆڕین»ە و کـەس ناڵێ «گـۆڕاندی». نەبوونی صـیـغـەی «گـۆڕاندن» وا دەکا زیـهن بۆ ئەوە بڕوا «گـۆڕا» مبنی للمـجـهول بێت، کە ئەمەش هۆیەکی گـەورەیە بۆ گومانکردن.

[مەسعوود محەمەد]

## فعل مبنى للمعلوم و مبنى للمجهول Active and Passive
## کاری کارادیار و کاری کارابزر

زمانەوانەکانی کوردی کاریان لە رووی کارادیار بوون و کارابزر بوونەوە بەم جۆرە باس کردوە:

یەکەم – مامۆستا سەعید سدقی لە لاپەڕە (٤٣)ی صرف و نحوی کوردیدا، دەڵێت فعل دوو نەوعە (١) معلوم (٢) مجهول.

معلوم – فعلێکە فاعلەکەی دەبێ ذکر بکرێ، وەکو (ئەحمد بەخشی، عەلی نووسی...).

مجهول – فعلێکە فاعلەکەی نەناسرێ و نەبێژرێ بگرە مفعولەکەی لە جێگای فاعلەکەی دادەنرێ. فعلی لازم لەبەر ئەمە کە مفعولی نییە لە جێگای فاعلەکەی دابنرێ مجهولی لێ دروست ناکرێ.

دووەم – مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (٢٣)ی دەستووری زمانی کوردیدا دەبێژێ:

بنای مجهول هەمیشە لە فعلی متعدی دروست دەکرێت. بۆ دروستکردنی (ران) ئەخرێتە دوای (ڕەگ)ی بینای مەعلومەوە، وەکو:

| بینای مەعلوم | ڕەگ | بینای مەجهول |
|---|---|---|
| فرۆشتن | فرۆش | فرۆشران |
| پۆشین | پۆش | پۆشران |
| دروون | دروو | دروووران |
| لەوەڕاندن | لەوەڕین | لەوەڕێنران |
| هێنان | هێن | هێنران |

هەندێکیش بێ قاعیدەن، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| گرتن | گر | گران |
| خستن | خە (خ) | خران |
| کردن | کە (ک) | کران |

سێیەم – نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەی خۆیدا لاپەڕە (١٥٦): دەڵێ فعل دوو جۆرە:

١- فرمانی مەعلوم – ئەو فرمانەیە کە (بکەر – مسندالیە)کەی لە رستەدا دەرئەکەوێ، وەک (باخەوانەکە گوڵ ئەوەرێنێ).

٢- فرمانی مەجهول – ئەو فرمانەیە کە (مسندالیە)کەی لە رستەدا دەرناکەوێ، تەواوکەر (مفعول)ەکەی جێی مسندالیەکەی دەگرێ، وەک (گوڵ ئەروێنرێ).

چوارەم – مامۆستا کوردوییێف لە کتێبی (گرامەتیکا زمانی کوردی) لاپەڕە (١٦٠) لە جیاتی بناء للمجهول ئەمانەی باس کردووە:

١- تەحەرێ هات کرنێ:

دبت بەبەکارهێنانی کاری یاریدە (hatin – هاتن)، وەک:

| | |
|---|---|
| ئەز هاتم دیتنێ | ئەم هاتین دیتنێ |
| تو هاتی دیتنێ | هون هاتن دیتنێ |

٢- تەحەرێ دان کرنێ:

دبت بە بەکارهێنانی کاری یاریدەر (دان)، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| من دا نڤیسینێ | مە دا نڤیسینێ | تە دا نڤیسینێ |
| وە دابو نڤیسینێ | من دابو نڤیسینێ | مە دابو نڤیسینێ |

پێنجەم – مەردۆخ لە لاپەڕە (٢٣)ی فەرهەنگەکەیدا دەڵێ:

(برێ لە کردارگەل هەن...) مەبەستی ئەوەیە کە فیعلی بێ فاعل و بە فاعل هەن و فیعلی بێ فاعل بنا مجهولە و ناوی ناوە (کرداری بێ بکەر)، وە دەشڵێ ئەمانە لە کرداری دوولایی (فعل متعدی=کاری تێپەڕ) دروست دەبن، وەک: قەڵەمەکە شکیا.

شەشەم – لە دەستووری زمانی فارسی پۆلی یەکەمی ناوەندی تألیفی دکتۆر (پرویز ناتل خانلوی) لاپەڕە ٨٤دا دەڵێ:

فعل معلوم – فعەلی است بە فاعل نسبت دادە شود.

فعل مجهول – فعەلی است کە بە مفعول نسبت دارد.

حەوتەم – لە ڕێزمانی ئینگلیزیدا Active بۆ بناء معلوم و Passive بۆ بناء مجهول داناوە.

هەشتەم – زمانی رووسیش بە رێبازێکی وەک رێبازی زمانی ئینگلیزیدا رۆییوە و ئەمانەی بۆ بەکار هێناوە:

(Passive) – ستراداتێلنییێ

(Active) – دێیستفیتێلنییێ

لیژنە وەک تێبینییەکی سەرەتایی بەر لەوە بچێتە بنج و بناوانی باسەکەوە، پێویست دەزانێت کە بڵێت لە زمانی کوردیدا ئەم لاباسە دەچێتە ژێر باسی کاری تێپەڕەوە چونکە لە کاری تێ نەپەڕدا صیغەی تایبەتی (بناء للمجهول) پەیدا نابێت، کە ئەو واتایانەی (مجهول، Passive، البناء للمجهول أو المفعول، فعلی مجهول) بگرێتەوە. بە نموونە لە عەرەبیدا صیغەی بناء للمجهول لە فعلی لازمیش وەردەگیرێت و ئەداتی لەگەڵ بەکار دێت، وەک:

حتي بلغت سماءً لايطارُ لها

على جناح و لا يسعى على قدم

کە دەگوترێت (Active) هەردوو کاری تێپەڕ و تێ نەپەڕ دەگرێتەوە. دیارە لە کوردیدا نابێت لەم لاباسەدا تێپەڕ تێ نەپەڕ یەک بگرنەوە، واتە لە مەبحەسی کاری کارابزرادا، چونکە تێ نەپەڕ کاری کارابزر (مبنی للمجهول، Passive)ی نییە.

زاراوەی کارادیار و کارابزر

لە تەقەلای دۆزینەوەی زاراوەیەک بۆ ئەم تەرزە کارانە، لە پێشەوە سەرنجی لیژنە بۆ ئەوە رۆیی کە دوو کەس لە ئەندامان لەمەوپێش هەریەکەیان زاراوەیەکیان بەکار هێناوە.

یەکەم – د. نەسرین فەخری وتەی (ناسراو) و (نەناسراو)ی بەکار هێناوە بە مەبەستی ناسران و نەناسرانی کارا (فاعل)ە، خۆیشی ئەم زاراوەیەی بە زاراوەیێکی نهائی دانەناوە.

دووەم – نووری عەلی ئەمین زاراوەی (ئاشکرا) و (ون) و ناو ناوەش هەر (معلوم) و (مجهول)ەکەی عەرەبی بەکار هێناوە و لەو باوەڕەدایە کە پێویست بە دۆزینەوەی زاراوەیەکی لەبارتر هەیە.

سێیەم – دەرکەوت جگەر خوێنیش لە کتێبی (ئاواو دەستووری زمانی کوردی)دا

سالّی ١٩٦١ زاراوەی (پەندی) و (نەپەندی) بە واتای پەنهان و نەپەنهان بەکار هێناوە، کە دیارە ئەویش هەر لە عەرەبییەوە وەری گرتووە.

لەبەر ئەوە کە لیژنە یەکێک لەو زاراوانەی نەدیت بگونجێت لەگەڵ واتا و سروشتی ئەم جۆرە کارانەدا هیچ کامێکیانی نەکرد بە زاراوە لە نووسینی خۆیدا و جارێ بە شێوەیێکی سەرەتایی و بە گوێرەی تصوری خۆی لەجیاتی معلوم و مجهول و Passive و Active زاراوەی کاری (کارابزر) و کاری (کارادیار)ی دانا بە زاراوە، یەکەمیان بۆ (مجهول) و دووەمیان بۆ (معلوم). لەگەڵ ئەمەشدا کە هات و ئەنجومەنی کۆڕ بۆ واتای (معلوم) و (مجهول) لە جێگەی دوو وشەی (بزر) و (دیار) وشەی تری پەسەند کرد ئەوسا بەو پێیە زاراوەکان دەبێ بگۆڕێن.

چۆنیەتی داڕشتنی کاری کارابزر:

یەکەم – لە زاری کرمانجی خوارووداː بە استقرا و سەرنجدان ئەم راستییانەی خوارەوە دەردەکەون:

١– چاوگی واوی:

آ– لە رابردوودا نوونی چاوگ دەقرتێ و نیشانەی (را)ی مجهولیەتی پێوە دەلکێت، وەک:

| چاوگ | رابردووی کاری کارابزر (الماضی المبنی للمجهول) |
|---|---|
| دروون | درووڕا |
| گروون | گرووڕا |
| فەرموون | فەرمووڕا |
| هەنوون | هەنووڕا (تێ هەڵسون) |
| سوون | سووڕا |

ب– لە ئایندەدا نیشانەی مضارعە لە پێشەوە دێت و نیشانەی (را) دەکرێت بە (رێ)، وەک:

دە دروو ڕێم ( دە – دروو – ڕێ – م)

دە گروو ڕێم (دە – گروو – ڕێ – م)

دە هەنوو ڕێم (دە – هەنوو – ڕێ – م)

تێبینی:

له پێشەوه گوترا که ئەم کارانەی کارابزر وەک کاری مطاوعەیان بەسەر دێت، لەمەوە وەک بەڵگەنەویست (بەدیهی) دەزانرێت که وا کارەکان دەبنه لازم و راناوی لازمیان بۆ بەکار دێت و تصریفیشیان له رابردووەوه بۆ رانەبردوو بەر قاعیدەی کاری مطاوعه دەکەوێت.

٢- چاوگی ئەلفی:

آ- له رابردوودا نونی چاوگ و ئەلفەکه فڕێ دەدرێت و نیشانەی (را)ی تجهیلی پێوه دەلکێت، وەک:

| چاوگ | رابردووی کاری کارابزر |
|---|---|
| کێڵان | کێڵرا |
| شێلان | شێلرام |
| پێوان | پێورا |
| لێدان | لێدرایت |

ب- له ئایندەدا وەک گوتمان به پێی قاعدەی مطاوعه (را) دەکرێت به (رێ) و دەگوترێت:

دەکێڵرێت (ده - کێڵ - رێ - ت)

دەپێورێم (ده - پێو - رێ - م)

دەشێلرێین (ده - شێل - رێ - ین)

٣- چاوگی یائی:

آ- له رابردوودا دیسان (ین) له چاوگەکه لا دەبرێت و نیشانەی تجهیل (را)ی دەخرێتەسەر، وەک:

| چاوگ | رابردووی کاری کارابزر |
|---|---|
| نووسین | نووسرام |
| چنین | چنرام |

| | |
|---|---|
| دزین | دزرایت |
| کڕین | کڕرایت |

تێبینی:

له هەندێ شێوەدا (د) دەکەوێتە میانی (ڕ)ی ئەسڵی فعلەکەو (را)ی تەجهیلەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| کڕین | کڕدرا (کڕ - د - را) |
| بڕین | بڕدرا (بڕ - د - را) |
| گۆڕین | گۆڕدرا (گۆڕ - د - را) |

ب- له ئایندەدا وەک کاری ئەلفی دروست دەبێت (بەر قاعدەی کاری مطاوعە دەکەوێت)، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| نووسرام | دەنووسرێم | (دە - نووس - رێ - م) |
| چنرام | دەچنرێم | (دە - چن - رێ -م) |

٤- چاوگی تائی:

لیژنە بە ئیستیقرا ئەم کارە تائییانەی تێپەڕی لە زمانی کوردیدا دۆزیەوە (ئەنگاوتن، ئاژۆتن، بیستن، پالاوتن، پەستن، پاراستن، خستن، خواستن، رستن «رێستن»، داشتن، چێشتن، قۆستنەوە، کرۆشتن، کوشتن، فرۆشتن، گرتن، گوتن، شوشتن، گلۆفتن، گەستن، گواستنەوە، لێستنەوە «لستنەوە»، مشتن، ویستن، هاویشتن، هێشتن، ناشتن، بێشتن... هەتا دوایی).

بەر لەوەی بچینە سەر باسی دەستووری جۆربەجۆری داڕشتنی صیغەی کاری کارابزر لەم کارانەوە دەبێت ئەوە بڵێین وەک دەستوورێکی گشتی لە زۆر ناوچەکانی کوردستان صیغەی داڕشتنی رابردووی ئەم کارانە بە لابردنی نوونی چاوگ و لکاندنی (را)ی تجهیل پێک دێت، وەک:

| چاوگ | رابردووی کارابزر |
|---|---|
| خستن | خسترا |
| گرتن | گرترا |

| | |
|---|---|
| مشتن | مشترا |
| فرۆشتن | فرۆشترا |
| ویستن | ویسترا |

مەبەست لێرەدا ئەمەیە ئەم کارانە ئەگەر صیغەی تایبەتیشیان هەبێت بۆ رابردووی (کارابزر) دەتوانرێت بە پێی ئەو دەستوورەی تازە باسمان کرد بکرێن بە صیغەی کارابزر، واتە ئەوسا کارەکە دوو صیغەی دەبێت لە رابردوودا، بە نموونە:

| چاوگ | رابردووی کارابزر |
|---|---|
| خستن | خسترا، خرا |
| گرتن | گرترا، گیرا، گرا |
| هاویشتن | هاویشترا، هاوێژرا |

واش دەبێت «کار» هەر ئەو تاکە صیغەیەی دەبێت کە لە دەستوورە گشتییەکەوە وەردەگیرێت، وەک:

| چاوگ | رابردووی کارابزر |
|---|---|
| گوتن | گوترا |
| گلۆفتن | گلۆفترا |
| پەستن | پەسترا |

واش دەبێت بۆ مەبەسی سووک گوتن هەندێ لەو کارانە (ت)کەیان دەسوێت، وەک:

| | |
|---|---|
| پەسترا | پەسرا |
| گلۆفترا | گلۆفرا (هەڵگلۆفرا) |
| فرۆشترا | فرۆشرا |
| ویسترا | ویسرا |

ڕێسترا ڕێسرا

بێسترا بیسرا

لێسترایەوە لێسرایەوە

لە پاش دەرهاویشتنی ئەم کۆمەڵە کارەی سەرەوە لە لیستەی کارەکانی (تائی) چی دەمێنێتەوە لەوانەی دوو صیغەیان هەیە ئەمانەن: (ئەنگاوتن، پالاوتن، پاراستن، بێشتن، چێشتن، خستن، خواستن، شوشتن، قۆستنەوە، کرۆشتن، کوشتن، گرتن، گواستنەوە، مشتن، ناشتن، هاویشتن، هێشتن). ئەم کارانە بەر دەستوورێک دەکەون بۆ دارِشتنی صیغەی کارابزری رابردوو لێیان کە بریتییە لەمە:

صیغەی مضارعیان وەردەگیرێت و نیشانەی مضارعەت و ڕاناویان لێ فڕێ دەدرێت و چی دەمێنێتەوە ئامرازی (را)ی تجهیلی دەخرێتە سەر، وەک:

دەئەنگێوم ئەنگێورام

دەخوازم خوازرام

دەکوژین کوژراین

دەشۆن شۆران

دەهێڵیت هێڵرایت

٥- چاوگی دالی. لیژنە بە ئیستیقرا ئەم کارە دالیانەی تێپەڕی دۆزیەوە:

(بژاردن، بواردن، خواردن، خوێندن، ژماردن، سپاردن، شاردنەوە، کردن، ناردن، هاوردن، هەڵپەساردن، وشاردن).

لە شێوەی سلێمانیدا ئەم کارانەش وەک دوا بەشی کاری (تائی) صیغەی کارابزر بە هەمان دەستوور لە مضارعیانەوە وەردەگیرێت، وەک:

دەبژێرم بژێررام

دەژمێرم ژمێررام

دەسپێرم سپێررام

دەشارمەوە شاررامەوە

بەڵام یەک دوو تێبینیی بچووک هەیە، وەک:

١- کارەکانی «دەکەم، دەبەم، دەخۆم» لەگەڵ نەختێ گۆڕان لە صیغەی مضارعیاندا دەکرێن بە کارابزر لە صیغەی رابردوودا: لە دوو کاری (دەکەم، دەبەم) بزوێنی دوای کاف و بێیە کە نامێنێ و دەبێتە (کرا، برا) کاری خواردنیش کە مضارعەکەی دەبێتە (دەخۆم) واتە واوەکەی کراوەیە، لە صیغەی رابردووی کارابزردا واوەکەی دەبێتە واوی کورت و دەگوترێت (خورا). د. نەسرین فەخری تەعلیلی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئەم گۆڕانە لەم سێ فیعلەدا، هەروەها بە نیسبەت فیعلی (خوێندن)ەوە لەو باوەڕەدایە بە هۆی ئامرازی (اندن)ەوە بووە بە متعدی، هەرچەند صیغەی لازمیشی ئێستا بە بەرچاوەوە نەبێت.

٢- زۆربەی ناوچەکانی تر لەو فیعلانەی کە وا لە صیغەی کارا بزردا دوو (ر) کۆ دەبێتەوە، پیتی (د) دەخەنە بەینیانەوە، وەک:

بوێررا     بوێردرا

بووررا     بووردرا

ژمێررا     ژمێردرا

رای مامۆستا مەسعوود بە نیسبەت کاری (شاردنەوە) ئەوەیە کە ئەم کارە لازمەکەی (شرانەوە)یە و دەگوترێت «شرایەوە، دەشرێتەوە» بەو پێیە دەشێ تێپەڕەکەی «شراندنەوە» بووبێت و گۆڕابێ بۆ «شاردنەوە»،. رەنگە «ژماردن»یش وەک شاردنەوە تێپەڕی «ژمران» بێت کە لە زۆر جێگەدا بەکار دێت. ئەگەر وا نەبێ دەبێ بڵێین: «ژمرا» کورتەی «ژمێررا»یە و «شرایەوە»ش کورتەی «شاردرایەوە». کاری «کردن، بردن» ئێستاش صیغەی «کردرا و بردرا»ی هەر ماوە، تەنانەت لە زۆربەی ناوچەکانی دەرەوەی سلێمانی وشەی «برا» نابیسرێ و هەر «بردرا» هەیە.

گەلێک کاری وەک «خواردن» کە لە مضارعدا دەنگەکەی «ر»ی دەپەڕێ و دەبێتە «دەخۆرم» تا ئێستاش لە هەندێ ناوچەدا ئەم «ر»ەی هەر بەکار دێت و دەگوترێت «دەخۆم» هەروەک دەڵێن «دەشۆرم لە جیاتی دەشۆم» کە لە «شۆردن»ەوە هاتووە. لە پژدەر لە جیاتی «شووشتن، شۆردن، شۆرین» دەڵێن «شردن - جلکم شرد». بێ گومان کارەکانی «دەکەم، دەبەم» ئەوانیش بە تێپەڕینی کات «ر»ەکەیان دۆڕاندووە، دەبێ لە کۆندا «دەکەرم، دەبەرم» بوونێ. هەر بۆیەیە اسم فاعیلی لێکدراویان ئەم

«ر»ەی تێدا ماوەتەوە وەک «کارەکەر، باربەر».

لە گەلێک کەسم بیستووە، لە زۆر شوێنی کوردستان صیغەی کارابزر لە کارەکانی «بژاردن، ژماردن، شاردنەوە» بە پێی دەستووری گشتی دادەڕێژن و دەڵێن «بژاردرا، ژماردرا، شاردرایەوە»، ئەمەش ڕەفتارێکی سوودبەخشە چونکە ڕێ و شوێنی دەستوورێکی بنجی دەپارێزێت.

لە بارەی داڕشتنی صیغەی کارابزر لەو فیعلانەی کە بە هۆی «اندن»ەوە لە فیعلی ڕوودان «مطاوعە» وەرگیراون ڕایێکی تایبەتی خۆم هەیە دواتریش بە کورتی دێتەوە: وادەزانم صیغەی فەرمان «أمر» لەو تەرزە فیعلانە دەبێ لە فیعلەکەی ڕوودان «مطاوعە»وە وەربگیرێت. بە نموونە:

سووتا سووتاندی سووتێنرا دەسووتێنرێ

کە ویستمان صیغەی ئەمری لێ وەرگرین دەبێ بڵێین «بسووتێ» نەک «بسووتێندرێ» چونکە ئەم ئەمرە «بسووتێندرێ» دەبێتە داواکردنی مستحیل لەو ڕووەوە کە ئەو شتەی داوای لێ دەکرێ «بسووتێندرێ» دەبێ یەکێک پەیدا کات کە بۆ جێبەجێکردنی ئەمرەکە بێ و بی سووتێنێ، واتە ئەمرەکە لە مەعنادا داوا لە دووشتان، یاخود دووکەسان، دەکا کە خواهشتەکەی پێک بێن یەکیان ئەوەیە کە ڕووی قسە و ئەمر لەوە، یەکێکیشیان ئەو غائبەیە کە دەبێ کارەکە جێبەجێ بکات و لە فعلی کارادیاردا خۆی فاعل بووە چونکە مەعلوومە سووتێنرا لە «سووتاندی»یەوە هاتووە. لە فعلی وەک «کوشتی، خواردی»دا کە ئەمرەکەی کارابزر دەبێتە «بکوژرێ و بخورێ» بۆیە ناگەڕێینەوە سەر فیعلی ڕوودان «مطاوعە» چونکە ئەم فعلانە لەخۆیانەوە تێپەڕن، وەک «سووتاندن، وپساندن» نین کە لە «سووتان و پسان»ەوە کرابن بە تێپەڕ، واتە «کوشتن و خواردن و نووسین... هتاد» فعلی ڕوودانیان نییە تاکو لە ئەمری کارابزردا ئەو فیعلانە بێنەوە.

بەمە تێبینی مامۆستا مەسعوود کۆتایی هات.

٦- ئەو چاوگانەی لە ڕێی تێپەڕاندنەوە کۆتاییان بە (اندن) دێت:

هەرچەند ئەم چاوگانەش دالیان تێدایە و لە ڕواڵەتدا دەبوو بخرێنە سەر چاوگی دالی بەڵام بە هۆی ئەوەوە کە دالەکەیان ئەسڵی نییە و لێیان زیاد کراوە کران بە بەشێکی سەربەخۆ، سەرەڕای ئەمە استثناش لە داڕشتنیاندا نایەتە بەرچاو، هەروا هەموو جۆرە چاوگێکیشیان تێدایە، واتە (تائی، یائی، ئەلفی، واوی، دالی)

هەموویان (اندن)یان چووەتە سەر.

دارشتنی صیغەی کارابزر لەم کارانەوە:

١- لە ناوچەی سلێمانیدا دەتوانین بڵێین لە دوو ڕێگەوە دەگەین بە دارشتنی صیغەکە:

ڕێگەی یەکەم- لە چاوگەوە بە لابردنی نیشانەی چاوگ (دن) و گۆڕینی (ا)ی (اندن) بۆ (ێ) لکاندنی ئامرازی تجهیلی (را) بە کۆتاییەوە، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| سووتاندن | سووتان - سووتێن | سووتێنرا |
| فڕاندن | فڕان - فڕین | فڕێنرا |
| مراندن | مران - مرێن | مرێنرا |

ڕێگەی دووەم- لە صیغەی مضارعەوە وەربگیرێت بە فڕێدانی نیشانەی مضارعە و ڕاناو و لکاندنی ئەداتی تجهیل (را) پێوەی وەک:

| | | |
|---|---|---|
| دەسۆتێنم | سووتێن | سووتێنرا |
| دەفڕێنم | فڕێن | فڕێنرا |
| دەمرێنم | مرێن | مرێنرا |

٢- لە زۆر ناوچەی تری کوردستاندا دارشتنی ئەم صیغەیە هەر لە کاری ماضی خۆیەوە وەردەگیرێت بە لادانی ڕاناو و لکاندنی ئەداتی تجهیل وەک:

| | |
|---|---|
| سووتاندی | سووتاندرا |
| برژاندی | برژاندرا |

دارشتنی صیغەی مضارعی کارابزر:

ئەم دارشتنە دەستوورێکی گشتی بێ بیژووک (شاذ)ی هەیە، وەک صیغەی کارەکانی ڕوودان (افعال المطاوعة) کە چاوگیان ئەلفییە، ئەم صیغەیەش لە مضارعدا ئەداتی تجهیلی ماضی (را) دەکرێتە (رێ)، ئەداتی (دە)ی مضارعتی دەخرێتەسەر، وەک:

| | |
|---|---|
| کرا | دەکرێ |
| کێڵرا | دەکێڵرێ |
| سووتێنرا | دەسووتێنرێ |

تێبینی:

لەو زارانەدا کە کاری کارابزریان لە رابردوودا ئەلفەکەی ناگۆڕێ بە «ێ» لە داهاتوودا ئەوانیش وەک زاری سلێمانی ئەلفەکە دەکەنەوە بە (ێ)، وەک:

| | |
|---|---|
| سووتاندرا | دەسووتێندرێ |
| برژاندرا | دەبرژێندرێ |

واتە: ناگوترێت (دەسووتاندرێ و دەبرژاندرێ) لەمەشدا هەمان دەستووری تصریفی کاری روودانی بەسەردا دێت کە ئەلفی رابردوو دەکاتە (ێ) لە ئایندەدا.

داڕشتنی صیغەی فەرمان[1] کارابزر:

فەرمان کارابزر لە کاری مضارعی کارابزرەوە وەردەگیرێت بە گۆڕینەوەی (دە)ی مضارعە بە (ب)ی ئەمر، ئەمەش بەر دەستووری تصرفی کارەکانی (مطاوعة) دەکەوێت، وەک:

| مضارعی کارابزر | ئەمری کارابزر |
|---|---|
| دەدیترێم | بدیترێم |
| دەخورێم | بخورێم |
| دەنووسرێن | بنووسرێن |
| دەشوورێت | بشوورێت |
| دەخووسێنرێت | بخووسێنرێت |

١- نووری عەلی ئەمین دەڵێت: وەرگرتنی ئەمری کارابزر لە مضارعی کارابزر یەک دەگرێتەوە لەگەڵ دەستوورێکی تر کە بێین و ئەمری کارابزر لە مضارعی کارا معلومەوە وەربگرێن، وەک:

دەکێڵم (بـ + کێڵ + رێ + م = بکێڵرێم)

دەخۆم (بـ + خو + رێ + م = بخورێم)

---

(١) کاری فەرمان بە دوو جۆری صریح و ناصریحیەوە لە دواتردا باس دەکرێت، ئەمەی ئێرە جۆری ناصریحیەتی.

٢- مامۆستا مسعوود و د. نەسرین فەخری دەڵێن، ئەم دەستووری وەرگرتنی کاری فەرمانی کارابزر (فعل امر مبنی للمجهول) لە کاری مضارعی کارادیارەوە استثنای تێ دەکەوێت، وەک: (دەڵێم) بەم قاعیدەیە ناکرێتە (بگوترێم)، جگە لەم فیعلە فیعلی تریش هەن وەک ئەو بە تەواوی نایەنە ژێر قاعیدەکەوە، بەڵام کە ئەمری کارابزر لە مضارعی کارابزرەوە وەربگیرێت استثنای (ریزپەڕ) بە هیچ جۆرێ نایەتە پێش. لە کاری (دەڵێم)دا مضارعی کارابزر وەردەگیرێ، کە (دەگوترێم)ە، راستەوخۆ (د)ی ئەمری دەچێتە جێی نیشانەی مضارعەت و کارەکە دەبێتە فەرمانی کارابزر، وەک:

دەگوترێم بگوترێم

٣- بە لای مامۆستا مەسعوودەوە خێزانی کارابزر هەر لە چاوگەوە هەتا هەموو صیغەکانی (وحدة البناء)ێک پێک دێن، وەک خێزانی کارەکانی کارادیار.

صیغەی کارابزر هەموو گەردانی (تصریف) کارەکانی تری هەیە وەک «أمری صریح و ناصریح - نهی صریح و ناصریح و صیغەی ئینشائی و ئیخباری» بەڵام وا دەزانم ئەو کارە تێپەڕانەی بە (اندن) بوونەتە تێپەڕ، أمر و نهی صریحیان نییە. بۆ أمر و نهی صریح دەبێ کارە تێ نەپەڕەکە بەکار بێت «سووتاندی - سووتاندرا - دەسووتێندرێ» بۆ أمری صریح دەگوترێ «بسووتێ، بسووتێن» نەک «بسووتێندرێ، بسووتێندرێن» بۆ نهیش «مەسووتێ - مەسووتێن».

٤- بە رای د. نەسرین و نووری عەلی ئەمین دەتوانرێت کاری کارابزر یەکسەر لە بناغە و رەگی چاوگ بە دانانی ئامرازی (را)ی تجهیل بۆ کاری رابردوو، وە ئامرازی (رێ) بۆ کاری رانەبردوو دروست بکرێت.

ئەگەر هەشبوو بەم شێوە دروست نەکرا ئەودەمە بە ئاسانی لە رەگی کاری (مضارع) دروست دەکرێت، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| آ- چاوگ | بناغەی چاوگ | |
| گوتن | گوت | گوترا - دەگوترێ |
| ب- چاوگ | رەگی چاوگ | |
| نووسین | نووس | نووسرا - دەنووسرێ |

جـ- چاوگ　　　رەگی کاری مضارع

کوشتن　　　دە (کوژ)م　　　کوژرا - دەکوژرێ

[روونکردنەوە:

پێشتر د. نەسرین و مامۆستا نووری لە روونکردنەوەی رای خۆیان بووبوونەوە، وا لێرەدا باسی بناغە و رەگی چاوگ و رەگی مضارع هاتە ناوەوە.

من قسەی دوور و درێژم هەیە دەربارەی «بناغە و رەگ» هەڵیان دەگرم بۆ دەرفەت و باسێکی سەربەخۆ بەڵام بەرانبەر ئەم رایە تازەیە ئەوەندە دەڵێم لەم رایەدا دەستوور پەیدا نابێ بە قەدر ئەوەی «تحصیل حاص» پەیدا دەبێ چونکە کە خەڵق زانی رەگ و بناغەکان چین و کام فیعلیش بەر فلاَنە قاعیدە ناکەوێ ئیتر ئەوا لە هەموو گیروگرفتەکە رەها بوون بەر لەوەی رێزمانەکە بخوێنن، واتە ئەم «دەستوور»ە تازەیە لە پێشەوە داوا دەکات خەڵقەکە شتەکە بزانن ئەوجار بادەنەوە سەر دەستوورەکەی کە لە زیمنی زانینی شتەکەدا لێی بوونەتەوە. ئەم هەڵکەوتە قسە مەشوورەکەی رەحمەتیم بەبیر دێنێتەوە کە گوتی «ئێوە کتێبم بۆ تەرجەمە بکەن تاکو منیش تەئلیفی بکەم» بەڵام ئەم دەستوورە داوا دەکا خەڵق کتێبەکە تەئلیف بکەن تا ئەویش بیخوێنێتەوە.

مەسعوود محەمەد]

کاری یاریدەر Oxiliary Verbs

کاری یاریدەر ئەو کارانەن کە لە عەرەبیدا پێیان دەگوترێت (الأفعال المساعدة)، وە لە زمانی ئینگلیزیدا پێیان دەگوترێت Oxiliary Verbs نووسەرانی کوردیش بەم جۆرە باسیان کردووە:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە صرف و نحوی کوردیدا دوو فیعلی (کردن) و

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردیدا دەڵێ:

لە پێش گەردانکردنی فیعلەکاندا ئەبێ هەندێ دەم و صیغەی فیعلی (بوون)ی یاریدەر بناسین، چونکە رابردووی لێکدراو و رابردووی دووری هەموو فیعلێک بە یاریدەی ئەم دەم و صیغانەوە دروست ئەبن، بەڵام فیعلی (بوون) دوو چەشن گەردانی هەیە:

١- گەردانی لازم.

٢- گەردانی متعدی.

لەمانە گەردانی لازمیان بۆ یاریدەی فیعلەکانی لازم و مجهول، وە گەردانی متعدییان بۆ یاریدەی فیعلەکانی متعدی بەکار ئەهێنرێن.

لیژنە لە سەرەتاوە بەراوردێکی زمانی کوردی لەگەڵ زمانەکانی تر کرد لە رووی بەکارهێنانی کاری یاریدەرەوە، لەوەی کۆڵییەوە ئایا زمانی کوردی لە چ رێگەیەکەوەو بە چ جۆرێک کاری یاریدەر دێنێتە ناو رستە؟ چ تایبەتییەک «کار» دەکات بە یاریدەر. ئایا پێویستە کاری یاریدەر فۆرمی بگۆڕێت؟ لەگەڵ گۆڕانی فۆرم واتایەکی تازە دابهێنێت؟

یاخود تەنیا گۆرانی فۆرم، وەیا داهێنانی واتای تازە بەسە بۆ ئەوە فیعل بکات بە یاریدەر؟ بەنموونە دەگوترێت:

دەڵێم بیلێم و ناوێرم
هاتم بنووم و نەیانهێشت
وێرام لە رووبارەکە بپەڕمەوە
ویستم هەڵبستم
توانیم بڕۆم
هێشتم بخوا .

ئەو جۆرە کارانە لە رووی ئەوەوە کە هەر یەکێکیان زاڵ دەبێت بەسەر کارێکی تردا لە هەمان رستە، خۆ جودا دەکەنەوە لە کارێکی ئاسایی وەک «شوشتن، کوشتن، بڕین» بەڵام لە لایەکی تریشەوە رواڵەتی رستەکان لە رستەی ئاسایی

ئیمکانی ئەوەی داوە زاڵ بن بەسەر کارێکی تردا و پێی ناوێ بڵێین کاری یاریدەرن.

کاری «کردن» کە لە کوردیدا لەگەڵ چەندین وشە بەکار دێت و رستەی تازە بەتازە دادەهێنێت، ئایا کاری یاریدەرە یاخود کارێکی ئاساییە بەڵام دەست دەدات بۆ بەکارهێنان لەگەڵ وشەی تردا؟ لەم جۆرە لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەیەوە لیژنە بۆ پشکنینەوەی گەلێ باری زمانەکە سەرنجی خۆی کێشا لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی بگا بە باوەڕێکی یەکگرتوو، وای پەسەند کرد ماوەیەک دانێت بۆ دراسەیەکی زیاتر لە زمانی کوردی خۆی و بەراوردکردنی لەگەڵ زمانەکانی تر لە تەنیا مەیدانی کاری یاریدەردا.

لیژنە بۆ دۆزینەوەی کاری یاریدەر لە زمانی کوردیدا، کەوتە پشکنینی هەردوو شێوەی زمانی کوردیی خواروو و سەروو، بەراوردێکی زۆریشی کرد لە نێوان زمانی کوردی و ئەو زمانانەی کە ڕێزمانیان بە لای لیژنەوە مەعلوومە وەک ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی، تا رادەیەکیش تورکی. بەهۆی ئەوەوە کە وا تا ئێستا لە زمانی کوردیدا تۆژینەوەی فرەوان و قووڵ نەکراوە، دەشێت پەڕاوێزی کاری یاریدەر بە پێی لێکدانەوەی تۆژەرەوە (محقق) فراوان، وەیا تەسک بکرێتەوە. لەوانەیە کارێکی وەک (هاتن، وێران) کە لێیان دێت بچنە سەر کاری تر بەلای هەندێ زمانزانەوە بە یاریدەر حساب بکرێ بە هۆی فراوانکردنی پەڕاوێزی واتا و تایبەتی زاراوەی کاری یاریدەر. یەکێکی تر ڕێی هەیە ئەم جۆرە کارانە بە کاری ئاسایی دابنێت و هاتنیان بۆ سەر فیعلی تر بگێڕێتەوە بۆ سروشتی کارەکان. ئەوەی سرنجی لیژنەی راکێشا بوونی هەندێ کارە لە کوردیی سەروو و خوارووداکە وا هەر تەعریفێک بۆ کاری یاریدەر دابنرێت و بەرەو تەسکیی واتای زاراوەی کاری یاریدەر بڕوات، ئەو کارانە بەر تەعریف دەکەون بۆ نموونە:

لە کرمانجی سەروودا کاری (هات) کە هۆی دروستکردنی صیغەی (کاری کارابزر)ە، بەلای هەموو کەسێکەوە بە کاری یاریدەر دانراوە، هەروەها لە کرمانجی سەروو و خوارووداکاری (بوون) کە صیغەی تایبەتی دروست دەکات لە رابردوو و ئایندە، ئەویش بێ دەمەتەقە «کاری یاریدەر»ە وەک: کردبووم، کردبێتم، دەبوو بمکردایە.. کەواتە دوو کاری یاریدەری بێ دەمەتەقە لە کوردیدا ئەمانەن:

١- کاری (هات) له شێوەی سەروودا بۆ دروستکردنی کاری کارابزر.

٢- کاری (بوون) له هەموو شێوەکانی کوردیدا.

زمانزانانی شێوەی سەروو (وەک مامۆستا کوردۆییف له کتێبەکەی خۆی گرامەتیکا زمانی کوردی، لاپەڕە ١٧٠) هەروەها (رشید کورد له کتێبەکەی ڕێزمانا کوردی، دکتۆر کامەرانیش له کتێبەکەی زمانی کوردیدا که به فەرەنسی دایناوە)، کاری «دان»یش له جۆرێکی تایبەتی بەکارهێنانیدا به کاری یاریدەر دادەنێت، وەک که بڵێیت:

من دا نڤیساندنێ

من دا کرنێ

بەکارهێنانی کاری «دان» بۆ ئەو مەبەسته له شێوەی خوارووشدا باوە وەک که بڵێیت:

جلەکەم دا به دروون.

دزەکەم دا به گرتن.

تێبینی:

بەلای (نووری عەلی ئەمین)ەوە، کاری (دا) لەم میسالانەدا کاری یاریدەر نییە، کارێکی ئاساییە چونکه یاریدەی کارێکی تری نەداوە هەتا به هەرووکیان صیغەیەکی نوێ پێک بێنن. بەلام هەتا ئێستا چ نووسەرێکی کوردی کوردستانی خواروو به نووسین ئەم فیعلەی وەک کارێکی یاریدەر باس نەکردووە، جگه له د. نەسرین فەخری که له اطروحەی دکتۆرای خۆی به رووسی بەکاری یاریدەری داناوە و تا ئێستا اطروحەکه بڵاو نەکراوەتەوە، له دەرسی زمان و ڕێزمانیش له بەشی کوردیی زانکۆ بەغدادا به محاضرە بۆ شاگردەکانی باس کردووە.

[ڕوونکردنەوە:

ڕێژەی (دامه نڤیساندنێ)ی زاری کرمانجی سەروو جوداوازیی هەیه لەگەڵ ڕێژەی (دام به نووسین.. کوشتن.. دروون)ی شێوەی خواروو چونکه ڕێژەکەی سەروو هەر بەکارادیار دەمێنێتەوە و مومکین نییه بخرێته ڕێژەی کارابزرەوە. بەلام (جلەکەم دا به

دروون) دەبێتە (جلەکەم درا بە دروون). لە بەرانبەر کاری وەک (بەکوشتنی دا) کە تێپەڕە (بەکوشت چوو) هەیە کە تێ نەپەڕە کەچی ناگوترێ (بەدروون چوو بە نووسین چوو). تێکڕای فیعلەکان و چۆنەتیی بەکارهێنانییان لێکۆڵینەوەی پتری دەوێت.

دەمڕاستی لیژنە]

فیعلی (کردن) لە زمانی کوردیدا بە جۆرێکی فرەوان بەکار دێت بۆ دروستکردنی (کاری لێکدراو)، هەندێ لە نووسەران وەک (سەعید سدقی، دکتۆر کامەران) بە کاری یاریدەریان داناوە.

سەعید سدقی فیعلێکی لێکدراوی وەک (نوێژکردن)یشی داناوە بە جۆرێک لەکارهێنانی (کردن) وەک یاریدەر.

دکتۆر کوردوییێف، لەگەڵ ئەمیشدا د. نەسرین فەخری، لە هەندێ حاڵی تایبەتیدا «کردن»ی بە کاری یاریدەر داناوە، وەک بەکارهێنانی لەگەڵ ناوی رەنگ، هەروەها لەو شوێنانەدا کە کاری (بوون) تێ نەپەڕ دروست دەکا، کاری (کردن)یش تێپەڕ دروست دەکات لەگەڵ وشەی تردا وەک:

گەورە بوو

گەورەی کرد

بوو بە پیاو

کردی بە پیاو

لە هەندێ استعمالی (کردن)دا صیغەیەکی تایبەتی پەیدا دەبێت، وەک:

«نەکا بڕوا، نەکەی بخۆیت» کە واتای تەحذیر دەبەخشێت، بیر بۆ هەندێ دەڕوات کە بە یاریدەر دابنرێت.

تۆژینەوەیەکی کورت لە زمانی کوردیدا بۆ بینەری دەردەخات کە وا دوو رواڵەت لە کارەکانی کوردیدا هەیە لە رووی رۆڵی کاری یاریدەرەوە:

١- رواڵەتی تێکەڵبوونی هەندێ کار لە داڕشتنی کارێکی تردا، وەک:

خواردبێتم، خواردبووم، دەبوو بمخواردایە. خورابام، هاتە خارنێ، دێتە خارنێ، هاتبا خارنێ.

٢- ڕواڵەتی بەیەکەوە هاتنی کارێک لەگەڵ کارێکی تر یا وشەیەکی تردا بۆ دروستکردنی واتایەکی نوێ، وەیا گۆڕینی واتای کۆن، بێ ئەوە هەردوو وشەکان تێکەڵ بە یەکتر ببن، لەم حاڵەدا هەرچەند تێکەڵبوون نییە بەڵام نەهاتنی ئەو کارەی کە دەشێ پێی بگوترێت (یاریدەر = مساعد) دەبێتە هۆی پەیدا نەبوونی ئەم واتا تازەیە، وەیا ئەم گۆڕانەی کە باسمان کرد، بە نموونە:

دەڵێم بیڵێم و ناوێرم

هاتم بیخۆم و نەیانهێشت

نەموێرا هیچ بڵێم

ئەگەر بۆ کاری یاریدەر ئەو مەرجە دابنرێت کە تێکەڵ بە داڕشتنی (صیغە) بێت، ئەوسا لە کوردیدا لە چەند کارێکی کەم بەولاوە کاری یاریدەر دەست ناکەوێت، چونکە هەر ئەو چەند کارە تێکەڵ بە داڕشتنی کاری تر دەبن، بەڵام لە حاڵێکدا مەرجی (تێکەڵ بوون لە داڕشتن) هەڵبستێ و پەیداکردنی واتای نوێ، وەیا گۆڕینی واتای کۆن ببێتە دیارخەری کاری یاریدەر، ئەوسا بە ئیستیقرا کۆمەڵێک لەو تەرزە کارانە لە کوردیدا دێنە بەرچاو کە وا جووت دێن لەگەڵ کارێکی بنجی و ئەم فەرمانەی واتا گۆڕی، وەیا واتاسازی جێبەجێ دەکەن. بەجۆرێکی سەرپێیی و لەو ماوە کورتەی کۆبوونەوەدا لیژنە لەم جۆرە کارانە ئەمانەی خوارەوەی هاتنە بەر چاو:

١- هاتن: هاتم بیڵێم و نەموێرا.

٢- گوتن: دەڵێم بیڵێم و ناوێرم.

٣- وێران: وێرام بڕۆم.

٤- ویستن: ویستم هەڵبستم، نەیانهێشت.

٥- توانیم: توانیم دوێنێ پێی بگەم.

٦- شیان: لە کوردیی سەروودا بە واتای (توانین) بەکار دێ، وەک:

دەشێم بچم

٧- کارین: ئەمیشیان لە شێوەی بۆتاندا بە واتای (توانین) (شیان) بەکار دێت، وەک:

دکارم بچم (ئەزنکارم بچم - بۆ نەفی)

تێبینی:

لە شێوەی خوارووودا وشەی (شیان) بە واتای (جواز) بەکار دێت و کاری یاریدەریشە، وەک:

دەشێ بباریت (دەشێ نەباریت)

٨- لوان: بە واتای (شیان) لە شێوەی خوارووودا بەکار دێت، وەک:

دەلوێ باش بێت.

٩- هەستان: (تەنیا لە کاتی رابردوودا)، وەک:

هەستام بڕۆم نەیانهێشت.

واش دەبێ لەم بەکارهێنانەدا بە واتای «شروع یاخود ویستن» بێت.

[روونکردنەوە:

کاری «هاتن» دەکەم بە نموونەی روونکردنەوە، لە ئایندەدا دەگوترێ:

دێم بنووم و لێم ناگەڕێن.

صیغەی ئینشائیشی دێتە بەرچاو کە لیژنە زاراوەی «فەرمانی ناصریح»ی بۆ داناوە:

کە بێم بنووسم گوێ نادەمە رەخنە.

بابێم بکەومە سەر شەڕ، ئەوسا دەمبینیەوە.

بێم و بخۆم...

بێم و بکەومە سەر شەڕ...

بێت و ئەوەم لێ بسەلمێنێ زۆری مەمنوون دەبم.

بێ و ئەوەم لێ بسەلمێنێ...

بەلام ئەوەی جێگەی سەرنج لێگرتن و لێکۆڵینەوەی صیغەی فەرمانی صریحە ئایا لەوێدا کاری «هاتن» یاریدەرە یا شتێکی ترە:

وەرە مەمرە لە خەفەتان.

تۆ وەرە ببە سەرۆک ئەوسا قسەی وا قەڵەوم بۆ بکە.

بێ لێوردبوونەوە مەعلووم دەبێ، کاری دوای (هات، دێ، بێ، وەرە.. هاتم، دێم، بێم) کە لە شێوەی یاریدەردا بەکار بێت هەمیشە لە صیغەیێکی ئینشائیدا دەبێت لەو صیغانەی لیژنە پێی دەڵێ «فەرمانی ناصریح»، هەروەها کە بەدوا کارەکانی تریشدا بێت وەک (هەستام، وێرام، لوام، شیام، توانیم، دەڵێم...). وەک کە لە نموونەکاندا بۆمان دەرکەوت (هەستام بڕۆم، وێرام بکەم، دەلوێ باش بێت...) ئەگەر صیغەی ئیخباری بە دوا کارەکاندا بێت ئەوسا بە هیچ جۆرێک ناشێ پێیان بگوترێت یاریدەر وەک:

هاتم نانم خوارد، هەستام چوومە بازاڕ، دەڵێم زستان ساردە.

بەڵام هەندێک لەو کارانە هەرگیز ناکەونە پێش صیغەی ئیخبارییەوە وەک (وێران، شیان، لوان، کارین، ویستن..) مەگەر خۆیان ئینشائی بن وەک: بۆی بلوێ دەڕوات.

ئەم دیاردەیەی نەهاتنی هەندێک لەو کارانە لە پێش رستەی ئیخباریدا لەوانەیە زیهن بۆ ئەوە ببات کە سروشتی واتای کارەکان بەبەریەوە هەیە تاویان ببا بۆ سەر کاری تر، هەر بۆیەیە هەمیشە صیغەی ئینشائی بەدوایاندا دێت ئەگەر وا نەبا و کارەکان یاریدەربان دەبوو حاڵەتێکیشیان هەبێ بکەونە پێشی فیعلی ئیخبارییەوە وەک کە دیتمان (هاتن، گوتن، هەستان) کەوتنە پێش ئیخبارەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا دەشێ پێچەوانەی ئەمەش بگوترێ و دیاردەکە بکرێتە بەڵگەی یاریدەربوونی ئەو کارانە. باسی ڕێزمانی کوردی جارێ زۆر ساوایە گەلێک قۆناغی فراوانی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە و بە دوادا گەڕان و هەڵێنجانی لەپێشە.

لەم تێبینییانەدا من نەختێک لە بیروڕای لیژنە دەترازێم.

مەسعوود محەمەد]

١٠- خواستن: وا دەبێت کاری (خواستن)یش بە واتای (ویستن) بەکار دێت، وەک:

خواستم بڕۆم ڕێیان نەدام.

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ لە بەکارهێنانی ئەم کارانەدا چەند شتێکە:

١- تێیاندا هەیە تەنیا لە یەک کاتدابەکار دێن، وەک (هەستان) کە لە ڕابردوودا بەکار دێت.

٢- وا دەبێت ڕابردوو و ئایندەیان دەبێت، وەک:

شیا - دەشێ.

٣- بە دەگمەن نەبێت لە فەرماندا بەکار نایەن.

٤- ئەم کارانە لە ڕستەدا دەشێ بکەونە پاڵ کارێکی بنجییەوە.

٥- ئەم کارانە هەروەک بەکاری یاریدەر بەکار دێن، دەشێ لە ڕستەدا سەربەخۆ بن.

٦- دیارە لە حاڵێکدا کە یاریدەر بن پێویستە لە ڕستەدا کارێکی بنجی هەبێت.

٧- هێنانەوەی نیمچە ڕستە بە واتای یەکێ لەو کارە یاریدەرانە نایکات بە کارێکی یاریدەر، بە نموونە کە بمانەوێ (هەستام بڕۆم) بگۆڕێن بە (هاتە خەیاڵم بڕۆم) یاخود (بەدڵمدا هات بڕۆم) ئەم دوو بەدیلە (هەستان)ەکە ناکات بەکاری یاریدەر واتە (هاتە خەیاڵم، بە دڵمدا هات) جێی کارە یاریدەرەکە ناگرنەوە.

چوارەم- کار لە ڕووی زەمانەوە (کاتەکانی کار)

نووسەرانی بە جۆری خوارەوە لە بارەی کار لە ڕووی زەمانەوە دواوون:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە صرف و نحوی کوردیدا (کار = فعل) لە ڕووی زەمانەوە دەکات بە سێ بەشەوە:

آ- ڕابردوو (ماضی)، وەک: نووسیم.

ب- ئێستە (حال)، وەک: وادەنووسم.

جـ- لەمەوپاش (استقبال)، وەک: دەنووسم.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (٦)ی دەستووری زمانی کوردیدا کار (فعل) بە پێی دەم (زەمان) دەکات بە دوو بەشەوە:

آ- دەمی موزاریع.

ب- دەمی رابردوو.

هەروەها دەڵێت لە فیعلی (بوون) و (هەبوون) لێکدراو، وە لە سیغەی دوولایی (٣٧٣)، وە فیعلی متعدی (١٤٥- ٤) دەمێکی کەش هەیە کە پێی دەڵێن «دەمی ئێستا».

٣- مامۆستا سادق بەهائەدین دەڵێ: (فعل) لە کرمانجیی ژووروودا دەکرێ بەم بەشانەوە:

یەکەم - بووریی (رابردوو):

ا- کاتی بووری سادە وەک:

ئەز هاتم، ئەم هاتن، وی خار، وان خار.

ب- کاتی بووریی نزیک وەک:

ئەز هاتمە، ئەم هاتین، وان خارییە، تەخارییە.

ج - کاتی بووریی درێژ وەک:

ئەز هاتبووم، ئەم هاتبوون، وان خاربوو، تەخاربوو.

د- کاتی بووریی درێژتر وەک:

ئەز هاتبووبووم، ئەم هاتبووبوون، وان خاربووبوو، تە خاربووبوو.

ه- کاتی بووریی خوزی وەک:

هەکە ئەز هاتبام، هەکە ئەم هاتباین، هەکە ئەم بهاتان (بۆتانی).

و- کاتی بووریی بەرچاڤ (استمراری)، وەک:

ئەز دهاتم

ئەم دهاتن (دهاتین).

من دخار.

مە دخار (دخارن).

دووەم - دەمی نهو (حازر = موزاریع):

أ- بەرچاڤ (استمراری)، وەک:

تویێ دخۆی.

هونێ دچن.

ب- نهو (ئێستا)، وەک:

تو دخۆی

هون دچن

سێیەم - دەمی پاشی (ئایندە = مستقبل):

ئەم دەمە لە زاری کرمانجیی ژووروودا دوو جۆرە:

أ- موستەقبەلی نزیک، وەک:

ئەزێ دێ چم.

ئەوێ دێ خوت.

ئەمێ دێ خوینن (دێ خوینین).

هونێ دێ بارکەن (دێ بارکن).

ب- موستەقبەلی دوورتر، وەک:

ئەز دێ چم (دێ بچم).

ئەو دێ خوت (دێ بخوت).

ئەم دێ خوین (دێ بخوین).

٤- لە دەستووری زمانی فارسیدا، دانانی ر. ذوالنور (کار) لە رووی زەمانەوە دەکات بە دوو بەشەوە:

آ- کاری رابردوو (گوزەشتە) - ئەمیش دەکات بە پێنج بەشەوە:

١- ماضی مطلق، وەک: ڕۆیی.

٢- ماضی استمراری، وەک دەڕۆیی.

٣- ماضی نقلی، وەک: ڕۆیشتووە.

٤- ماضی بعید، وەک: ڕۆیشتبوو.

٥- ماضی التزامی، وەک ڕۆییبێت.

ب- کاری حال و ئایندە: صیغەیەکی تایبەتیی نییە کە حال لە ئایندە جودا بکاتەوە، تەنیا بە پێی واتای ڕستە دیار دەکەوێت، مەبەس لە کارەکە حالە، یا ئایندە، وەک:

١- چ دەخوێنیتەوە؟ مەولەوی دەخوێنمەوە.

٢- کەی دەچیت بۆ هەولێر؟ سبەی دەڕۆم بۆ هەولێر.

تێبینی:

ئەو دەستوورە لە رووی کاتەوە بە تایبەتیی باسی ئەمر ناکات، بە تێکڕایی زەمان دەکات بە دوو بەشەوە:

آ- ماضی.

ب- مضارع (حال و ئایندە).

لە دوای چاو پێداخشاندن بەو باسانەی کە لەسەر زەمانی (کار) نووسراوون لە کوردیدا، پاش هەندێ لێکۆڵینەوە و موناقەشە لەلایەن ئەندامانی لیژنەوە، وا پەسەند کرا هەر ئەندامە بیروڕای خۆی لە بارەی (کات) لە کاری کوردیدا بنووسێت:

١- مامۆستا هەژار دەڵێت: (فعل) لەمەڕ کاتەوە دوو بەشە:

آ- رابردوو (رابراو) وەک: نووسیم.

ب- رانەبوردوو (رانەبراو) وەک: دەنووسم.

لە زاری کرمانجیی سەروودا فەرق بە صیغە بۆ ئێستا و ئایندە هەیە، بەڵام لە شێوەی کرمانجیی خواروودا صیغەی جوداواز بۆ حاڵ و مستقبل نییە و تەنیا بە وشەی دەوروبەری دەردەکەوێت وەک:

ئێستا دەچم (حاڵ).

بەیانی دەچم (مستقبل).

٢- نووری عەلی ئەمین.. تەئیدی مامۆستا هەژار دەکات لە دابەشکردنی کاتی (کار)ەوە واتە (کار) دوو دەمی هەیە (رابردوو، رانەبوردوو).

٣- مامۆستا مەسعوود دەڵێت: کار لە سروشتدا ئەم سێ جۆرەی خوارەوەی تێدایە:

آ- رابردوو.

ب- لەحزەی ئێستاکە.

جـ- دوای ئێستا کە.

ئەمانە بەزاراوەی ڕێزمانی باو تا ئێستا پێیان گوتراوە (ماضی، حال، مستقبل).

هەندێ زمان بۆ هەریەکێک لەو زەمانانە صیغەی تایبەتییان تێدایە. دەتوانین بڵێین زمانی کوردی بە صیغە ئەو سێ زەمانەی تێدا دیار کراوە چونکە لە زاری کرمانجیدا صیغە بۆ هەر سێ کات هەیە، کە لەو زارەشدا هەبوو وەک لە هەموو کوردیدا هەبێ وایە. بەڵام لە زاری کرمانجیی خوارووا ئەوەندەی بیستبێتم بۆ دوو کاتی (ئێستا و ئایندە) هەر یەک صیغە هەیە، جوداکردنەوەی (مستقبل) یا لە ڕستەدا دیار دەکەوێت یاخود بە هۆی بەکارهێنانی وشەی تایبەتییەوە، وەک:

ڕۆیشتم – دەڕۆم (ئێستا دەڕۆم، سبەی دەڕۆم) یا (کە بوو بە هاوین گەرما دادێ).

٤– د. نەسرین فەخری دەڵێت – کار بە پێی زەمان دەکرێت بە سێ بەشەوە لە زمانی کوردیدا:

أ– ڕابردوو، وەک: نووسیم.

ب– ئێستا، وەک: دەڕۆم.

جـ– ئایندە، وەک: دێڕۆم.

تەنیا ئەوەندە هەیە لە شێوەی خوارووا کاری ئایندە هەریەک بنکە بۆ ئێستا و داهاتوو (ئایندە) بەکار دەهێنرێت. هەروەها کاری ڕابردوو دەکرێت بە پێنج بەشەوە:

آ– نزیک، وەک نووسیم.

ب– ئیستیمراری، وەک: دەتنووسی.

جـ– تام، وەک: نووسیومە (نقیسیە).

د– دوور، وەک: نووسیبووم.

هـ– دوورتر، وەک: نووسیبووبووم (ببووم)[1].

---

(١) د. نەسرین دەڵێت: بەکارهێنانی ڕابوردووی دوورتر زۆر کەم بووەتەوە، لەوانەشە ئەنجامی دووبارەکردنەوەی کاری یاریدەدەری (بوونەکە) بێت، کە کرابێت بەیەک لەبەر قورسی.

پێنجەم - کاری لە رووی دارِشتنەوە (صیغە)

نووسەرانی کورد بەم جۆرە لە کار لە ڕووی دارِشتنەوە دەدوێن:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (٩، ١٠)ی بەرگی دووەمی دەستووری زمانی کوردیی چاپی بەغدادا دەڵێت:

لە کوردیدا پێنج چەشن صیغە هەیە:

١- صیغەی ئیخباری.

٢- صیغەی ئینشائی.

٣- صیغەی ئەمری.

٤- صیغەی دوولائی.

٥- صیغەی مەسدەر.

هەروەها لە لاپەرە (٣٧)ی هەمان دەستووردا دەڵێت:

١- موزاریعی ئیخباری (٤٤٢) - بە دانانی ئەداتی سیغە لە پێش ڕەگەوە، وە نووساندنی ڕاناوە لکاوەکان بە دوای ڕەگەوە پێک دێت، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| یەکەم | ئەکەوم | ئەکەوین |
| دووەم | ئەکەوی | ئەکەون |
| سێیەم | ئەکەوێ | ئەکەون |

٢- موزاریعی ئینشائی (٤٤٣) - ئەداتی سیغە دەخرێتە پێش ڕەگەوە، وە ڕاناوە لکاوەکان دەخرێنە دوای ڕەگەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| بکەوم | بکەوین |
| بکەوی | بکەون |
| بکەوێ | بکەون |

هەروەها لە لاپەڕە (٣٨، ٣٩)ی هەمان بەرگدا (بەرگی دووەم)، کاری رابردووی ئیخباری دەکات بە چوار بەشەوە:

١- ڕابوردووی رووتی ئیخباری (٤٤٥) - ڕاناوە لکاوەکان دەخرێتە دوای قەدەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| کەوتم | کەوتین |
| کەوتی | کەوتن |
| کەوت | کەوتن |

٢- ڕابوردووی ناتەواوی ئیخباری (٤٤٦) - ئەداتی سیغە دەخرێتە پێش ڕابردووی ڕووتەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| ئەکەوتم | ئەکەوتین |
| ئەکەوتی | ئەکەوتن |
| ئەکەوت | ئەکەوتن |

٣- ڕابوردووی لێکدراوی ئیخباری (٤٤٧) - دەمی ئێستای ئیخباری فیعلی - بوون - ی یاریدەدەری لازم دەخرێتە دوای دوولایی ڕابوردووەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| کەوتووم | کەوتووین |
| کەوتووی | کەوتوون |
| کەوتووە | کەوتوون |

٤- ڕابوردووی دووری ئیخباری (٤٤٨) - ڕابوردووی ناتەواوی ئیخباری فیعلی «بوون»ی یاریدەری لازم دەخرێتە دوای قەدەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| کەوتبووم | کەوتبووین |
| کەوتبووی | کەوتبوون |
| کەوتبوو | کەوتبوون |

هەروەها لە لاپەڕە (٣٩، ٤٠)ی بەرگی دووەمدا، ڕابوردووی ئینشائی دەکات بە سێ بەشەوە:

١- رابردووی ناتەواوی ئینشائی (٤٤٩) - ڕابوردووی رووتی ئیخباری دەخرێتە مەیانی ئەداتی سیغەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| بکەوتمایە | بکەوتینایە |
| بکەوتیتایە | بکەوتنایە |
| بکەوتایە | بکەوتنایە |

٢- ڕابوردووی لێکدراوی ئینشائی (٤٥٠) - ئێستای ئینشائی فیعلی «بوون»ی یاریدەدەری لازم دەخرێتە دوای قەدەوە، وەک:

کەوتبم کەوتبین

کەوتبی کەوتبن

کەوتبێ کەوتبن

٣- ڕابوردووی دووری ئینشائی (٤٥١) - ئەداتی سیغە دەخرێتە، دوای ڕابوردووی دووری ئیخبارییەوە، وەک:

کەوتبوومایە کەوتبووینایە

کەوتبوویتایە کەوتبوونایە

کەوتبوایە کەوتبوونایە

ڕایەکانی مامۆستا وەهبی کۆتاییان هات.

٢- نووری عەلی ئەمین دەڵێت کار لە ڕووی صیغەوە دوو جۆرە:

١- صیغەی ئیخباری: لە ماضیدا، وەک (کەوت، کەوتووە، دەکەوت، کەوتبوو). لە مضارعدا، وەک (دەخوێنم).

٢- صیغەی ئینشائی: لە ماضیدا، وەک (بکەوتمایە، کەوتبم، کەوتبوومایە، کەوتبێتم)، لە مضارعدا (بنووسم، بنووسە).

٣- د. نەسرین دەڵێت: هەروەک (کار) لە ڕووی کاتەوە دەکرێت بە چەند بەشێکەوە دیسان لە ڕووی مفهوم و ڕواڵەت و بەشی تریشەوە دابەش دەکرێت بە جۆرێک سنوورێکی ئاشکرا دەخاتە نێوان ئەم بەشانە بۆ نموونە ئەو بەشەی (نووری عەلی ئەمین) دەڵێت کە ئینشائییە بەر (مفهوم) دەکەوێت نەک کات.

٤- مامۆستا مەسعوود محەمەد دەڵێت: بەلای منەوە دوای ئیستیقرای تەواو لە زمانی کوردیدا بۆ دەرخستنی ئەو صیغانەی لە کارەکانیدا هەیە چ بەرنامەی کاک نووری و چ بەرنامەی د. نەسرین بێت هەردووکیان دەست دەدەن بۆ دابەشکردنی کاری رابردوو لە ڕووی صیغەوە، بەڵام بە مەرجی ئیستیقرای تەواو، چونکە ئێمە کە هەموو صیغەکانمان دۆزییەوە و جۆری بەکارهێنانیانمان دیارخست چ فەرقێک نامێنێ لە ڕووی سوود و زەرەرەوە لە

نێوان ئەوەدا بڵێین (بکەوتمایە) صیغەی ئینشائیی کاری رابردووی (کەوتن)ە وەیا خود بڵێین (بکەوتمایە) بەشێکی فیعلی (کەوتن)ە بە پێی مەفهوومێک کە د. نەسرین ناوی بۆ دابنێت. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێم هەرچەند بشلێین ئەم فیعلە (بکەوتمایە) بەر دابەشکردن لە ڕووی مەفهووم دەکەوێت ناشێ لەبیر خۆمانی ببەینەوەکە فیعلەکە لە رووی کاتەوە نە موزاریعە و نە ئەمر، دیسانەوە ناشێ هەبوونی کات لە فیعلەکەدا پشتگوێ بخەین چونکە کات بەشێکی فیعلەکەیە.

٥- لە «دەستووری زمانی فارسی» دانانی ر. ذوالنور (کار) لە رووی صیغەوە دەکات بە شەش بەشەوە:

١- ئیخباری.

٢- التزامی.

٣- امری.

٤- شرطی.

٥- مصدری.

٦- وصفی.

لە رووی ئەوەوە خزمایەتێکی مێژوویی هەیە لە نێوان زمانی کوردی و فارسیدا بیری مرۆڤ بۆ هێندێ دەڕوات کەوا زمانی کوردیش وەک فارسی ئەم شەش جۆرە صیغە فیعلانەی تێدا هەبێت، لەمەش زیاتر وابووە نووسەری کورد لەم ڕێبازەوە باسی فیعلی کوردیی کردووە. لیژنە دوای لێکۆڵینەوە بە پێویستی زانی لێرەدا ئیشارە بۆ چەند راستییەک بکات:

یەکەم - نابێ لە ڕێزماندا واتایەکی تایبەتی لە فیعلدا بکرێتە سەرەباس تا صیغەیەکی تایبەتیی بۆ ئەو واتایە پەیدا نەبێت چونکە زۆرجار لە ئاخاوتندا یەک صیغە بۆ چەند مەبەستێک بەکار دێت ئەمە هەرگیز ناشێ ئەم صیغەیە دابەش بکات بۆ چەند جۆرێ، وە هەر جارە بە پێی مەبەستێ عینوانێکی تازەی بۆ دابنێ، لە فارسیدا بۆ ئەم شەش (وجە)ە شەش جۆر دارشتنی سەربەخۆی تێدایە بە نموونە:

لە (وجهی مصدری)دا رستەی (باید رفتن، شاید گفتن، نیازم شنیدن) لە کتێبەکەدا نووسراوە، لە ئاخاوتنی کوردیدا چ صیغەی تایبەتی بەرانبەر ئەم

صیغەیە پەیدا نابێت. بۆ دەربڕینی واتای ئەوتۆیی لە زمانی کوردیدا دارشتنی تر هەیە کە فیعلەکە تێیدا بەر دابەشکردنێکی تر دەکەوێت، هەروەها بۆ (وەجهی وەسفی) کە لەم نموونانەدا دێنە بەرچاو (من و تو نشتە ناهار میخوریم. من نشتە ناهار میخورم) صیغەی تایبەتی لە کوردیدا نییە.

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە لەو ڕایانەی کە لەبارەی (کار)ەوە لە ڕێزمانە کوردییەکان و بێگانەدا هاتوونە ناوەوە و چوونە بنج و بناوانی سروشتی زمانی کوردی و ئەو مەبەسانەی کە لە صیغە جودا جوداکانی مازیدا بەدی دەکرێت، لیژنە گەیشت بەم قەناعەتەی خوارەوە:

کاری رابردوو

کاری رابردوو لە بنەڕەتدا بە دوو جۆر دابەش دەکرێت:

١- رابردووی ئیخباری.

٢- رابردووی ئینشائی.

زمانەکانی بێگانە هەریەکەیان لە ڕێبازێکەوە ئەم دوو جۆرەیان لە یەکدی جودا کردووەتەوە، وە صیغەی تایبەتییان بۆ بەشەکانی هەریەک لەو دوو جۆرە داناوە. لە زمانی کوردیدا وەک سەرنج دەری دەخات، رابردووی ئیخباری و رابردووی ئینشائی هەریەکەیان چوار جۆری هەیە:

جۆرەکانی رابردووی ئیخباری:

١- رابردووی مطلق (رەبەق)[1]، وەک: ڕۆیشت.

٢- رابردووی استمراری (بەردەوام)، وەک: دەڕۆیشت.

٣- رابردووی نزیک، وەک: ڕۆیشتووە.

٤- رابردووی دوور، وەک: ڕۆیشتبوو.

جۆرەکانی رابردووی ئینشائی:

١- ڕۆیشتبا.

---

(١) وشەی (رەبەق) پێشنیازی مامۆستا مەسعوودە.

٣- بڕۆیشتبایه (بڕۆیشتایه).
٤- ڕۆیشتبێ (ڕۆیشتبێت).

لیژنه جارێ نهیپهرژایه سهر دۆزینهوهی ناوی تایبهتی بۆ ههریهک له صیغهکانی ماضی ئینشائی، بهڵام لهو باوهڕهدایه که پێویستیان به ناوی تایبهتی ههیه، چونکه به سهرنجدانێکی سهرپێیی بیر بۆ ئهوه دهڕوات ههر یهک لهم صیغانهی ئینشائی له رووی زهمان و دارشتنهوه دهوهستێته بهرانبهر یهکێک له صیغهکانی ماضی ئیخباری؛ ئینشائی بهم جۆرهی خوارهوه بکهونه بهرانبهر یهکتر، وهک:

| ئیخباری | ئینشائی |
| --- | --- |
| ڕۆیشت | ڕۆیشتبا |
| دهڕۆیشت | بڕۆیشتبایه (بڕۆیشتایه) |
| ڕۆیشتووه | ڕۆیشتبێ |
| ڕۆیشتبوو | ڕۆیشتبوایه (ڕۆیشتبووبایه) |

نموونهی سهرنجدان:

بهر لهوه دهرفهت ههبێت بۆ لێدوانێکی تهفصیلی له چۆنێتی پێوهندیی نێوان صیغهکانی ئیخباری و ئینشائی، وه به پێی داخوازیی جێگه تاکه نموونهیهک لهو چوارانه دهدهینه بهر سهرنج.

دهڕۆیشت بڕۆیشتایه

لهم دوو صیغهیه یهکهمیان ئامرازی (ده)ی موضارهعهتی تێدایه، دووهمیان (ب)ی ئهمر و ئینشای تێدایه، وهک که دهڵێین:

دهڕوا بڕوا

ئهمه روونی دهکاتهوه که (ب)ی ئامرازی ئینشائی (بڕوا) ههر خۆیهتی چووهته سهر صیغهی (بڕۆیشتایه)ی ماضی ئینشائی که دیاره (ب)هکه وهستاوهته بهرانبهر (ده)ی موضارهعهت له صیغهی (دهڕۆیشت)ی ماضی ئیخباری.

لهمهولا له چۆنێتیی دارشتنی کاری رابردوو له فیعلی تێپهڕ و تێ نهپهڕدا دهدوێین و ههموو جۆرهکانیان یهکه یهکه دهخهینه پێش چاو.

یەکەم - کاری رابردووی رەبەق (مطلق)

١- جۆری دروستکردنی کاری ڕابردووی تێ نەپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا:

دروستکردنی کاری رابردووی تێ نەپەڕ بەم جۆرەیە:

١- لە چاوگەکە نوونی چاوگی فڕێ دەدرێت.

٢- راناوی لکاوی کەسی دەخرێتە سەر.

تێبینی:

بۆ کەسی سێیەمی تاک راناوی لکاو لەم کارەدا دەرناکەوێت.

| چاوگ | رابردووی تێ نەپەڕ |
| --- | --- |
| هاتن | کەسی سێیەمی تاک (ئەو هات) |
| | کەسی سێیەمی کۆ (ئەو هاتن) |
| | کەسی یەکەمی تاک (ئەز هاتم) |
| | کەسی یەکەمی کۆ (ئەم هاتین - هاتن)[١] |
| | کەسی دووەمی تاک (تو هاتی ) |
| | کەسی دووەمی کۆ (هوون هاتن) |

ب- لە زاری کرمانجیی خوارروودا:

دەستووری دروستکردنی ئەم جۆرە کارە لە زاری کرمانجیی خوارروودا وەک ئەو دەستوورەیە کە لە زاری کرمانجیی سەروودا بەکاردێت، تەنیا ئەوەندە هەیە لە زاری سەروودا راناوی نەلکاو لەگەڵ کاری تێ نەپەڕدا جودایە تا ڕاناوی نەلکاو لەگەڵ کاری تێپەڕدا بەڵام لە زاری خوارروودا ئەو جوداییە نییە، هەروەک دوایی دیار دەکەوێت، لە کاتێک نموونەمان هێنایەوە بۆ دروستکردنی کاری رابردووی تێپەڕ.

٢- جۆری دروستکردنی کاری رابردووی تێپەڕ:

---

(١) زاری بۆتان.

ا- له زاری کرمانجیی سەروودا:

دروستکردنی ئەم کارە بەم جۆرە دەبێت:

١- له چاوگەکە نوونە چاوگییەکە دەقرتێت.

٢- ڕاناوی نەلکاوی دەخرێتە پێش، وەک:

| چاوگ | رابردووی تێپەڕ |
| --- | --- |
| گرتن | کەسی سێیەمی تاک (وی گرت، وێ گرت) |
| | کەسی سێیەمی کۆ (وان گرت) |
| | کەسی یەکەمی تاک (من گرت) |
| | کەسی یەکەمی کۆ (مە گرت) |
| | کەسی دووەمی تاک (تە گرت) |
| | کەسی دووەمی کۆ (وە گرت) |

تێبینی:

بۆ کەسی سێیەمی تاک لەم صیغەیەدا ڕاناوی نەلکاو بۆ نێر و مێ له یەکتر جودان. (وی) بۆ نێر و (وێ) بۆ مێ.

ب- له زاری کرمانجیی خوارووا:

دروستکردنی ئەم کارە بەم جۆرە دەبێت:

١- نوونی چاوگیی له چاوگەکە دەقرتێت.

٢- ڕاناوی لکاوی دەچێتەسەر، وەک:

| چاوگ | رابردووی تێپەڕ |
| --- | --- |
| کردن | کەسی یەکەمی تاک (کردم) |
| | کەسی یەکەمی کۆ (کردمان) |
| | کەسی دووەمی تاک (کردت) |
| | کەسی دووەمی کۆ (کردتان) |

کەسی سێیەمی تاک (کردی)

کەسی سێیەمی کۆ (کردیان)

تێبینی:

لەو نموونانە دەردەکەوێت ڕاناوی لکاو لە زاری کرمانجیی خوارووددا بۆ کاری تێ نەپەڕ و تێپەڕ، هەموویان یەک جۆرنین.

زۆرتر دیتمان کەسی سێیەمی تاک لە کاری رابردووی تێ نەپەڕدا، راناوی لکاوی نییە، بەڵام لە تێپەڕدا، وەک لەو نموونانەی دوایی دەرکەوت، (ی) راناوی لکاوە.

کەسی یەکەمی تاک راناوی لکاوی لە تێپەڕ و تێ نەپەڕدا ناگۆڕێت هەر (م)ە.

ڕاناوی لکاو بۆ کەسانی تر لە تێپەڕەوە بۆ تێ نەپەڕ دەگۆڕێ بە پێی لیستەی خوارەوە:

| | ڕاناوی لکاو | |
|---|---|---|
| | لە کاری تێ نەپەڕدا | لە کاری تێپەڕدا |
| بۆ کەسی سێیەمی کۆ | ن «نووستن» | یان «کردیان» |
| بۆ کەسی یەکەمی کۆ | ین «نووستین» | مان «کردمان» |
| بۆ کەسی دووەمی تاک | ی، یت «نووستی» «نووستیت» | ت «کردت» |
| بۆ کەسی دووەمی کۆ | ن «نووستن» | تان «کردتان» |

وەک رواڵەت دەری دەخات ڕاناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی کۆ و کەسی سێیەمی کۆ پیتی «ن»ە، کەوا بە ڕێکەوت لەگەڵ «ن»ی چاوگ یەکدی دەگرنەوە.

٣- نەفی کاری رابردووی ڕەبەق:

١- تێ نەپەڕ: لە هەردوو زاردا «کرمانجیی سەروو و خواروو» ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە پێش کارەکە، وەک:

نەهات نەهاتن

نەهاتم نەهاتن

نەهاتی نەهاتن

تێبینی:

لە کرمانجی ژووروودا زاری بۆتانی بۆ کەسی یەکەمی کۆ (نەهاتن) بەکار دەهێنێت لە بری (نەهاتین).

٢- تێپەڕ:

أ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە پێش کارەکە و ڕاناوی نەلکاویش دەخرێتە پێش ئامرازی نەفییەکەوە، وەک:

وی (وێ) نەگرت وان نەگرت

من نەگرت مە نەگرت

تە نەگرت وە نەگرت

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووادا: لە پێشەوە، ئامرازی (نە)ی نەفی دێت و بە دوای ئەودا راناوی لکاو (هی تێپەڕ) ئەنجا کارەکە دێت، وەک:

نەمگرت - نەمانگرت

نەتگرت - نەتانگرت

نەیگرت - نەیانگرت

تێبینی:

لە غالبی زاری بلباسیدا (مامەش، مەنگوڕ، پیران، سوێسنی، پشدەری، ئاکۆ...) تصریفی کاری رابردوو جۆری تایبەتی خۆی هەیە، کەوا تا ڕادەیەک جودا دەبێتەوە لەو نموونانەی لەمەوبەر نووسیمانن. وێنەش بۆ ئەمە:

١- کاری رابردووی تێ نەپەڕ: هەرچەند قالبی کارەکە لەم زارەدا جوداوازیی نییە لەگەڵ قالبی فیعلی تێکڕای زاری کرمانجیی خواروو، بەڵام راناوی نەلکاو کە دەکەوێتە پێش کارەکە لەم زارەدا وادەبێت دەگۆڕێت لە چاو راناوەکانی زاری کرمانجیی خوارووادا، وەک:

ئەو نووست - ئەو (ئەوان) نووستن

ئەمن نووستم - ئەمە نووستین

ئەتۆ نووستی - ئەوە نووستن

بۆ نەفیش وەک زاری کرمانجیی خواروو ئامرازی (نە) دەچێتە پێش کارەکەوە، وەک:

ئەو نەنووست - ئەو (ئەوان) نەنووستن

٢- کاری رابردووی تێپەڕ:

لەم کارەدا دوو جۆرە تصریف هەیە یەکێکیان ئاسایی، ئەوی تریان بۆ واتایەکی تایبەتی. نموونەکانی ژێرەوە، هەردوو جۆرەکە دەردەخەن.

ئەو گرتی - ئەوی گرت (ئەو گرتیان - ئەوان گرت)

ئەمن گرتم - ئەمنم گرت (ئەمە گرتن - ئەمەن گرت)

ئەتۆ گرتت - ئەتۆت گرت (ئەوە گرتو - ئەوەو گرت)

لە نەفیدا ئەم صیغانە بەم جۆرە دەگۆڕدرێن، وەک:

ئەو نەیگرت - ئەوی نەگرت (ئەو نەیانگرت - ئەوان نەگرت)

ئەمن نەمگرت - ئەمنم نەگرت (ئەمە نەنگرت - ئەمەن نەگرت)

ئەتۆ نەت گرت - ئەتۆت نەگرت (ئەوە نەوگرت - ئەوەو نەگرت)

بۆ دیارخستنی جودایی نێوان واتای صیغەکان ئەم رستانەی خواروو بوون بە نموونە:

ئەمن گرتم، ئەتۆت خوارد

ئەوی بەستەوە، ئەمەن کوشت

ئەتۆ کڕیت، ئەوان دەبەر کرد

دووەم - کاری رابردووی ئیستیمراری (بەردەوام)

١- جۆری دروستکردنی تێ نەپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: ئیشارەتی موضارەعەت (د) دەخرێتە پێش کاری تێ نەپەڕی رەبەقەوە (مطلق)، هەرکارەش ڕاناوی نەلکاوی خۆی بە پێشدا دێت، وەک:

ئەز دهاتم         ئەم دهاتین (ئەم دهاتن - لە زاری بۆتان)

تو دهاتی         هوون دهاتن

ئەو دهات         ئەو دهاتن

ئامرازی (نە)ی نەفیش لە صیغەی نەفیدا دەخرێتە پێش حەرفی موضارەعەتەکەوە، وەک:

ئەز نەدهاتم - ئەم نەدهاتین

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووا: ئیشارەتی موضارەعەت (دە) دەخرێتە پێش کاری تێ نەپەڕی ڕەبەقەوە، وەک:

دەهاتم         دەهاتین

دەهاتی         دەهاتن

دەهات         دەهاتن

بۆ نەفی، ئامرازی (نە) دەخرێتە پێش صیغەی سەرەوە، وەک:

نەدەهاتم         نەدەهاتین

٢- جۆری دروستکردنی تێپەڕ:

آ- لەزاری کرمانجیی سەروودا: ئشارەتی موضارەعەت (دە) دەخرێتە پێش رابردووی (ڕەبەق)ی تێپەڕ، ڕاناوی نەلکاوی هەرکارەش لەپێش کارەکەوە دێت، وەک:

من دگرت         مە دگرت

تە دگرت         وە دگرت

وی، وێ دگرت   وان دگرت

لە حاڵی نەفیشدا ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە پێش حەرفی موضارەعەتەوە وەک:

من نەدگرت     مە نەدگرت

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووا: لە پێشەوە ئیشارەتی موضارەعەت (دە) دێت، بە دوای ئەودا ڕاناوی لکاو، ئەنجا کارەکە دێت، وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

دەمگرت دەمانگرت

دەتگرت دەتانگرت

دەیگرت دەیانگرت

لە حاڵی نەفیشدا راناوی لکاو دێتە پاش ئامرازی نەفی (نە)، ئەوجا ئیشارەتی موضارەعەت و کارەکە دێن، وەک:

نەمدەگرت نەماندەگرت

نەیدەگرت نەیاندەگرت

سێیەم - کاری رابردووی نزیک

١- جۆری دروستکردنی تێ نەپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە راناوی نەلکاو دێت بەدوای ئەودا صیغەی ناوی کارا (فاعل) ئەنجا راناوی لکاو، بەو جۆرەی لەو نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

ئەز نفستیمە ئەم نفستینە

تو نفستییی ئەو نفستینە بۆتان

ئەو نفستییە ئەو نفستینە

لە زاری بادیناندا ئەم صیغەیە دارشتنی جودایە لەهی بۆتان بە پێی ئەم نموونانەی خوارەوە:

ئەزێ نفستیم ئەمێت نفستین

تویێ نفستی هونێت نفستین

ئەوێ نفستی ئەوێت نفستین

بۆ نەفی، ئامرازی (نە)ی نەفی دێتە پێش کارەکەوە، وەک:

ئەز نەنفستیمە ئەم نەنفستینە

ب- لە زاری کرمانجیی خواروودا: لە پێشەوە صیغەی ناوی کارا (فاعل)ی کارەکە و بە دوا ئەودا راناوی لکاو دێت، وەک:

نووستووم نووستووین

نووستووی (ت)     نووستوون

نووستووه            نووستوون

[روونکردنەوە:

ئەم یەک بوونەی راناوی کەسی دووەمی کۆ و کەسی سێیەمی کۆ بۆ کاری تێ نەپەڕ دیاردییکە لە هەموو صیغەکاندا دەدیترێت و دەستوورێکی گشتییە لە زمانی کوردی نەک هەر لەم صیغەیەدا.

دەمڕاستی لیژنە]

تێبینیی یەکەم:

چونکە صیغەی کۆی دووەم و سێیەم وەک یەکترن، بە راناوی نەلکاو کە لەپێشەوە بێت لەیەکتر جودا دەکرێنەوە، یاخود بە پێی راگەیاندنی جێگە ئەو جوداوازییە دەکرێت، دەبێت بڵێین:

ئێوە نووستوون        ئەوان نووستوون

تێبینی دووەم:

ساغکردنەوەی حەقیقەتی ئەم زیادییەی کە بە دوا صیغەی تاکی سێیەمدا دێت (نووستووە)، پێویست بە لێکۆڵینەوە دەکات. بەلای هەندێ زمانزانەوە ئەم زیادییە فیعلی مساعدە کە لە ئینگلیزی پێی دەوترێت (ڤێرب تو بی «verb to be»).

لە رێزمانی فارسیشدا دەڵێت ئەمە کورتکراوەی (ئەست)ی خەبەرییە.

مامۆستا مەسعوود دەڵێت سەرنج دەری دەخات لە کوردیدا بۆ دروستکردنی (ئیسناد و ئیخبار) لە رستەی ئیسمیدا راناوی کاری تێ نەپەڕ دێت، ئەم لیستەیەی خوارەوە مەبەست روون دەکاتەوە:

| کاری تێ نەپەڕ | راناوی لکاو | رستەی ئیسمی |
| --- | --- | --- |
| نوستم | م | من کوردم |
| نوستین | ین | ئێمە کوردین |
| نوستیت | یت | تۆ کوردیت |

| | | |
|---|---|---|
| نوستن | ن | ئێوە کوردن |
| نوست | ... | ئەو کوردە |
| نوستن | ن | ئەوان کوردن |

لەمەوە دەردەکەوێت کەسی تاکی سێیەم لە کاری رابردووی تێ نەپەڕدا ڕاناوی لکاوی دیار کراوی نییە تاکو بۆ پێکهێنانی ئیخبار لە ڕستەی ئیسمیدا بەکار بێت، لەبەر ئەوە سەلیقەی کوردی بۆ پێکهێنانی واتای ئیخبار لە سەرچاوەیەکەوە کە ئێستا نازانم چییە ئەم زیادییەی هێناوە وەک ڕاناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاک. بە لامەوە ئەگەر ئەمەی نەهێنایە شتێکی تری دەهێنا کە (ئیخبار) ڕابگەیەنێت و ڕستەی ئیسمی پێ تەواو بکات. ئەنجا لێکدانەوەم ئەمەیە: زیادی دوای ڕستەی ئیسمی بۆ کەسی سێیەمی تاک ڕاناوی لکاوە وەک هی کەسانی تر.

بێینەوە بۆ صیغەی کەسی سێیەمی تاک لە رابردووی نزیکدا، وەک دیاردە ئەم صیغەیە رواڵەتی وەک صیغەی ناوی کارا (فاعل) وایە، واتە وێنەی رستەکە لە وێنەی رستەی ئیسمی دەکات. ئەنجا هەروەک رستەی ئیسمی بۆ کەسی سێیەمی تاک ئەم زیادییەی تێدا بەکار دێت، کاری رابردووی نزیکیش بۆ کەسی سێیەمی تاک کە لە رواڵەتدا وەک رستەی ئیسمی وایە دەبێت هەمان زیادەی بۆ بەکار بێت؛ کە گوتت: (ئەو نوستوو) وەک ئەوەیە گوتبێتت (ئەو شوان) هەردوو رستە (ئیخبار و ئیسناد)یان تێدا پەیدا نابێت ئەگەر زیادییەکەی راناوی لکاوی کەسی سێیەمی (ە) نەچێتە دوایانەوە و نەگوترێت:

ئەو نوستووە

ئەو شوانە

نووری عەلی ئەمین دەڵێت: ڕستە لە زمانی کوردیدا بەبێ (کار) دروست نابێت، وەک:

من نوستووم

من کوردم

لە رستەی یەکەمدا وشەی (نوستوو) کارەکەیە و ئیسنادی پێک هێناوە، بەڵام لە رستەی دووەمدا کارەکە سواوە و دیار نییە، راناوی (م) ئەرکی ئەو دەبینێت، واتە بۆتە کارا بۆ کارێکی سواو کە رەگەکەی لە صیغەی کەسی سێیەمدا

بەدەردەکەوێت، وەک:

ئەو کوردە

بەڵام لە صیغەی کەسی سێیەمی ڕستەی فیعلیدا ئەوەی پێ ناوێت چونکە کارەکە خۆی لە توانایدا هەیە ئیسنادێک پێک بهێنێت بەبێ یاریدە ئەنجا لەبەر ئەوە من (ە) بە کارێکی یاریدەدەر دادەنێم لە صیغەی کەسی سێیەمی تاکدا نەک راناو وەک مامۆستا مسعوود دەڵێت.

مامۆستا مەسعوود دەڵێ: وا دیارە مامۆستا نووریش دان بەوەدا دێنێت لەم رستانەدا (کوردم، کوردیت، کوردین) کاری ئاشکرا نییە. سوانی کارەکە، ئەگەر سوابێت، ئەو حەقیقەتە ناگۆڕێت کە لە رواڵەتی ئێستاکەیاندا کار وجوودی نییە، کەواتە چۆن دەتوانین بڵێین رستە لە زمانی کوردیدا بەبێ (کار) پەیدا نابێت لە حاڵێکدا دەڵێین کاری رستەی (من کوردم) سواوە ناشزانین ئەوەی سواوە چییە.

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی دێتە پێش کارەکەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| من نەنوستووم | ئێمە نەنوستووین |
| تۆ نەنوستووی (ت) | ئێوە نەنوستوون |
| ئەو نەنوستووە | ئەوان نەنوستوون |

٢- جۆری دروستکردنی تێپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لەپێشەوە راناوی نەلکاو دێت، بە دوای ئەودا دارِشتنێکی کار بۆ ئەم صیغەیە دێت کە لە نموونەدا بە دیار دەکەوێت، ئەنجا حەرەکەی (ە) دێت کە دەمەتەقێی لەسەرە ئایا سروشتەکەی چییە؟ ئاخۆ راناوی کەسی سێیەمی تاکە یا (ڤێرب تو بی verb to be) کەسی سێیەمی تاکە یاخود احتمالێک هەیە کە ئەمە هەر تەکمیلەی ئەم صیغەیەیە.

نموونەی تێپەڕ:

| | |
|---|---|
| من گرتییە | مە گرتییە |
| تە گرتییە | وەگرتییە |
| وی، وێ گرتییە | وان گرتییە |

لە حاڵێکدا بەرکار لەم صیغەیەدا کۆ بێت بەم جۆرە راناوەکەی دەردەکەوێت.

من گرتینه       مه گرتینه

بۆ نەفی، ئامرازی (نە) دێتە نێوان راناوی نەلکاو و کارەکەوە و دەگوترێت:

من گرتییە   من نەگرتینە

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووداً: راناوی لکاو دەشێت بەدیار کەوێت یان نەکەوێت بە دوا ئەودا دارشتنی تایبەتیی ئەم صیغەیە دێت، ئەنجا راناوی لکاو، پاش ئەو بزوێنی (ە) دێت کە جێی دەمەتەقێیە و لەمەوبەر گوتمان و روونمان کردەوە. نموونە:

من گرتوومە       ئێمە گرتوومانە

تۆ گرتووتە       ئێوە گرتووتانە

ئەو گرتوویە       ئەوان گرتوویانە

تێبینیی یەکەم:

لەلایەن ئەو رایەی کە حەرەکەی (ە) بە راناو دادەنێت... کاتێک کە مفعول راناوی جمع بوو یا تاکی مخاطب وەیا قسەکەر بوو راناوەکە لە جێی ئەم بزوێنە دەردەکەوێت، دەگوترێت:

گرتوومن - گرتوویانن - گرتوومت - هتد.. لەمەدا دەردەکەوێت ئەم بزوێنە (ە) ئەویش راناوە بۆ کەسی سێیەمی تاک، چونکە لە شێوەی خوارووداً هەر لەو حاڵەدا دەردەکەوێت، کە مفعولەکە تاکی سێیەم بێت، وەک: گرتوومە، دیتوومە.

تێبینیی دووەم:

وا دەبێت ئەم صیغەیە بەم جۆرەی خوارەوە بەکار دەهێنرێت، وەک:

گرتووەتم - گرتووەتمان

گرتووەتت - گرتووەتتان

گرتووەتی - گرتووەتیان

لە زاری بلْباسەتیدا، ئەم صیغەیەش شێوەی تایبەتیی خۆی هەیە، وەک:

گرتوومە       گرتوونە

گرتووتە       گرتووە

گرتوویە       گرتوویانە

دەشگوترێت:

ئەمنم گرتووە　　ئەمەن گرتووە

ئەتۆت گرتووە　　ئەوەو گرتووە

ئەوی گرتووە　　ئەوان گرتووە

ئەم صیغەیەی بڵباسەتی وەک لە پێشەوە جارێکی تر روون کرایەوە لە حاڵی تایبەتی خۆیدا بەکار دێت.

لە حاڵەتی نەفیدا ئامرازی (نە) لە پێشەوە دێت، بەدوا ئەودا ڕاناوی لکاوی فاعل دێت و بەدوا ئەودا دارِشتنی تایبەتیی صیغەی کارەکە، وەک:

من نەمدیوە　　ئێمە نەماندیوە

تۆ نەتدیوە　　ئێوە نەتاندیوە

ئەو نەیدیوە　　ئەوان نەیاندیوە

چوارەم - کاری رابردووی دوور

١- جۆری دروستکردنی تێ نەپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەرووداا: لە پێشەوە راناوی نەلکاو، بە دوا ئەودا صیغەی رابردووی رەبەق (مطلق)ی تاکی سێیەم، ئەنجا کاری (بوو) لە صیغەی رابردووی رەبەق (مطلق) لەگەڵ راناوی لکاوی خۆیدا، وەک:

ئەز نڤستبووم　　ئەم نڤستبوون (ئەم نڤستبووین - بادینانی)

تو نڤستبووی　　هوون نڤستبوون

ئەو نڤستبوو　　ئەو نڤستبوون

لە نەفیشدا ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە پێش کارەکەوە، وەک:

ئەز نەنڤستبووم　　ئەم نەنڤستبوون

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووداا: لە پێشەوە راناوی نەلکاو دێت (دەشتوانرێت چاوی لێ بپۆشرێت) بە دوای ئەودا صیغەی رابردووی رەبەق (مطلق)ی تاکی سێیەم، ئەنجا کاری (بوو) لە صیغەی رابردووی رەبەق لەگەڵ راناوی لکاوی خۆیدا، وەک:

| | |
|---|---|
| من نوستبووم | ئێمە نوستبووین |
| تۆ نوستبووی | ئێوە نوستبوون |
| ئەو نوستبوو | ئەوان نوستبوون |

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە پێش کاری یەکەم، کە کاری بنجییە، وەک:

من نەنوستبووم - ئێمە نەنوستبووین

٢- جۆری دروستکردنی تێپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا:

لە پێشەوە راناوی نەلکاوی تێپەڕ، بە دوا ئەودا قەدی کار، ئەنجا صیغەی رەبەقی رابردووی کاری (بوون) دێت، وەک:

| | |
|---|---|
| من دیتبوو | مە دیتبوو |
| تە دیتبوو | وە دیتبوو |
| وی (وێ) دیتبوو | وان دیتبوو |

ب- لە زاری کرمانجیی خوارروودا:

دەشێت لە پێشەوە راناوی نەلکاو بێت یان نەیەت، ئەنجا قەدی کار، بە دوا ئەودا صیغەی رەبەقی رابردووی کاری (بوون)، لەگەڵ راناوی لکاوی تێپەڕ دێت، وەک:

| | |
|---|---|
| دیتبووم | دیتبوومان |
| دیتبووت | دیتبووتان |
| دیتبووی | دیتبووتان |

جۆرەکانی کاری رابردووی ئینشائی

لیژنە لەمەوبەر لە رابردووی ئیخباری و جۆرەکانی و چۆنێتیی دارشتنی و نەفییان لە تێپەڕ و تێ نەپەڕدا دوا، ئەوا لەمەولاش لە رابردووی ئینشائی و جۆرەکانی دەدوێین (جارێ بۆ دۆزینەوەی زاراوەی موناسب بۆ هەرجۆرێک لە جۆرەکانی رابردووی ئینشائی لیژنە ئەو دەرفەتەی نەبوو تێیدا خەریک بێت، بۆیە ئەم کارەی بۆ کاتێکی تر تەرک کرد).

[روونکردنەوە:

ئەم تەرزە دوا خستنەی هەندێ کاری ئەوتۆ کە خەریکبوونی بە زیادەوەی دەویست، لەوەوە بوو کە لیژنە وای چاوەڕوان دەکرد دوای تەواوبوونی هەموو لێکۆڵینەوەکانی، بەرهەمەکەی بخرێتە بەر چاوانەوە؛ بە ئومێد بوو لەو ماوەیەدا کەم و کورتییەک هەبێت بیانبڕێت. بەڵام خێراکردن لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکە ماوەی پوختەکردن و چاو پێداگێڕانەوەی لە دەست لیژنە دەرهێنا، بۆیەیە لە هەندێ جێگەدا لێکۆڵینەوەکان بە ناتەواوی ماونەتەوە.

دەمڕاستی لیژنە]

یەکەم - ئەو صیغە ئینشائییەی کە دەوەستێتە بەرانبەر رابردووی ئیخباریی رەبەق (مطلق).

١- جۆری دروستکردنی رابردووی ئینشائیی رەبەقی تێ نەپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە راناوی نەلکاوی کاری تێ نەپەڕ دێ، بە دوا ئەودا صیغەی رابردووی رەبەق (مطلق) دێ، ئەنجا صیغەیەکی تایبەتیی دارڕژاو لە کاری (بوون) دێ، کە بۆ دەربڕینی واتای ئەو تەرزە رابردووە دروست کراوە، بە پێی خشتەی خوارەوە لەگەڵ ڕاناوی لکاوی پێویستی صیغەکە، وەک:

| | |
|---|---|
| ئەز نفستبام | ئەم نفستبان - نفستباین (بادینانی) |
| تو نفستبای | هوون نفستبان |
| ئەو نفستبا | ئەم نفستبان |

لە حاڵی نەفیشدا ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە پێش کارەکەوە و دەبێتە:

| | |
|---|---|
| ئەز نەنفستبام | ئەم نەنفستبان |

ب- لە زاری کرمانجیی خواروودا: لێرەدا لیژنە سەرلەنوێ کەوتەوە موناقەشەی بنج و بناوانی دارشتنی ئەو صیغانە سەرنجێکیشی گرتە هەندێ جوداوازی کە هەیە لە نێوانی زاری سلێمانی و زارەکانی تری کرمانجیی خواروو، ئەم دەمەتەقێیە هەموو کاتی کۆبوونەوەی خایاند.

مامۆستا مەسعود بە پێی لێکدانەوە و بەراوردی خۆی لەولایەنی بەرانبەر یەکتربوونی صیغەکانی ئیخباری لەگەڵ صیغەکانی ئینشائی ئەم میسالانەی خوارەوەی هێنایەوە، کە هەرجارە صیغەیەکی ئینشائی وەرامی صیغەیەکی ئیخباریی بەرانبەر خۆی دەداتەوە.

یەکێک دەڵێت: تۆ گۆشتەکەت خواردووە.

ئەوی تر دەڵێت: ئەگەر خواردبێتم خوا بمگرێت.

یەکێک دەڵێت: لێت گەڕابان گۆشتەکەت دەخوارد.

ئەوی تر دەڵێت: ئەگەر بمخواردبایە دەمتوانی.

یەکێک دەڵێت: تۆ بەر لە هاتنمام گۆشتەکەت خواردبوو.

ئەوی تر دەڵێت: ئەگەر خواردبووبام لێوم چەور دەبوو.

وەک من تێ بگەم لە بنەڕەتدا ئەم صیغانە بەم جۆرە یەکتر عەکس دەکەونەوە. کە ئەمە دەلیلی هەندەیە هەر صیغەیەک لە ئیخباریدا صیغەیەکی تایبەتیی بەرانبەر هەیە لە ئینشائیدا، یاخود زەمانی صیغەیەکی ئیخباری لە یەکێ لە صیغەکانی ئینشائی دیار دەکەوێت، بەڵام ئیمکان هەیە بگوترێت بە هۆی ئەوەوە کە ڕێزمانی کوردی لە زوویەکەوە تۆمار نەکراوە و سەبارەت بە وردەکارییەک کە لەو صیغانە و زەمانەکانیاندا بەکار هێنراوە بە مروری کات لە وتووێژدا وادەبێت تێکەڵ پێکەڵی لە نێوانیاندا پەیدا دەبێت. ئەرکی زمانەوانیش ئەوەیە لە حاڵی وەهادا تێکەڵ پێکەڵی نەهێڵێ و هەڵە ڕاست بکاتەوە. [قسەکانی مەسعوود محەمەد لێرەدا کۆتاییيان هات].

دروستکردنی رابردووی ئینشائی لە کرمانجیی خواروودا بەم جۆرە دەبێت:

لە پێشەوە رابردووی رەبەق (مطلق) دێ، ئەنجا صیغەی تایبەتیی راگەیاندنی (انشاء وتمنی) کاری (بوون) لەگەڵ راناوی لکاوی کەسەکە دێ، وەک:

| | |
|---|---|
| ڕۆیشتبام | ڕۆیشتباین |
| ڕۆیشتبایت | ڕۆیشتبان |
| ڕۆیشتبا | ڕۆیشتبان |

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی دێتە پێشێ و دەگوترێت:

| | |
|---|---|
| نەڕۆیشتبام | نەڕۆیشتباین |

تێبینی:

ناوچەی سلێمانی ئەم صیغەیە بەکار ناهێنن.

٢- جۆری دروستکردنی رابردووی ئینشائیی رەبەقی تێپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە راناوی نەلکاوی کاری تێپەڕ، بە دوا ئەودا قەدی کار (کە بریتییە لەو هێندەی دوای قرتاندنی نونی چاوگی دەمێنێتەوە) دێ، بە دوای قەدا صیغەی راگەیاندنی (انشاء وتمنی) لە کاری (بوون) دێ، وەک:

| | |
|---|---|
| من گرتبا | مە گرتبا |
| تەگرتبا | وە گرتبا |
| وی، وێ، گرتبا | وان گرتبا |

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە پێش کارەکەوە و دەگوترێت:

| | |
|---|---|
| من نەگرتبا | مە نەگرتبا |

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووا: لە پێشەوە قەدی کارەکە، ئەنجا صیغەی تایبەتیی (انشاء وتمنی) کاری (بوون) لەگەڵ راناوی لکاوی تێپەڕ دێ، وەک:

| | |
|---|---|
| من گرتبام | ئێمە گرتبامان |
| تۆ گرتبات | ئێوە گرتباتان |
| ئەو گرتبای | ئەوان گرتبایان |

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی لە پێشەوە دێ، بە دوای ئەودا راناوی لکاو، ئەنجا قەدی کارەکە و صیغەی (انشاء وتمنی) کاری (بوون) دێ، وەک:

| | |
|---|---|
| نەمگرتبا | نەمانگرتبا |
| نەتگرتبا | نەتانگرتبا |

تێبینی:

ناوچەی سلێمانی ئەم صیغەیە بەکار ناهێنن.

دووەم - ئەو صیغەی ئینشائییەی کە دەوەستێتە بەرانبەری رابردووی بەردەوامی

ئیخباری:

١- جۆری دروستکردنی رابردووی ئینشائی بەرانبەر رابردووی بەردەوامی تێ نەپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە ڕاناوی نەلکاوی کاری تێ نەپەڕ دێ، بە دوای ئامرازی (ب) دێ، ئەنجا قەدی کارەکە، دوا ئەو صیغەی تایبەتیی کاری (بوون) دێ، وەک:

| | |
|---|---|
| ئەز بنڤستبام | ئەم بنڤستبام |
| تۆ بنڤستبای | هوون بنڤستبان |
| ئەو بنڤستبا | ئەو بنڤستبان |

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە جێ ئامرازی (ب)، وەک:

| | |
|---|---|
| ئەز نەنڤستبام | ئەم نەنڤستبان |

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووداد: لەم زارەدا بۆ ئەم صیغەیە لە وێنەیەک زیاتر هەیە، وەک:

بنوستبام

بنوستبامایە

بنوستمایە

مامۆستا مەسعوود دەڵێت: بەلای منەوە شێوەی یەکەم (بنوستبام) رەسەنە، چونکە هەموو ماکەکانی صیغەکەی تێدا مەوجوودە، وەک پیتی (ب)ی ئینشائی، قەدی کاری (نووستن)، صیغەی تایبەتیی «تمنی و انشاء»ی کاری (بوون) لەگەڵ راناوی لکاو. شێوەی دووەم (بنوستبامایە) زیادێیکی هاتووەتە سەر بۆ مەبەستێک کە دەبێت لە ئەسڵەکەی بکۆڵرێتەوە، ئایا بۆ ئارایشتە یا ئاواتە یا شتێکی ترە.

شێوەی سێیەم (بنوستمایە) کە تایبەتیی سلێمانییە، صیغەی ئینشائیی کاری (بوون) کە گوتمان (با)یە سەرلەبەری قرتاوە.

٢- جۆری دروستکردنی رابردووی ئینشائی بەرانبەر رابردووی بەردەوامی تێپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە راناوی جودای کاری تێپەڕ دێ، ئەنجا

ئامرازی (ب)ی ئینشائی (ئیزن، ئەمر، روخسەت) ئەوجا قەدی صیغەی کاری رابردوو، بە دوای ئەودا صیغە تایبەتییەکەی کاری (بوون) دێ، وەک:

| | |
|---|---|
| من بکربا | مە بکربا |
| تە بکربا | وە بکربا |
| وی، وێ بکربا | وان بکربا |

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی دێتە جێی ئامرازی (ب)ی ئینشائی و دەبێتە:

| | |
|---|---|
| من نەکربا | مە نەکربا |

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووداد: لەم زارەدا ئەم صیغەیە سێ جۆری هەیە:

١- ئامرازی (ب)ی ئینشائی لە پێشەوە، ئەنجا راناوی لکاوی کاری تێپەڕ، ئەنجا قەدی کارەکە، بە دوا ئەودا صیغەی تایبەتیی کاری (بوون)، وەک:

| | |
|---|---|
| بمکردبا | بمانکردبا |
| بتکردبا | بتانکردبا |
| بیکردبا | بیانکردبا |

٢- صیغەی پێشوو وەک خۆی دێتەوە و (ایە)ی دەخرێتەسەر، بەڵام چونکە صیغەکە کۆتایی بە پیتی (ا) هاتووە، پیتی (ا)ی دووەم لە (ایە) قرتاوە، بووەتە:

| | |
|---|---|
| بمکردبایە | بمانکردبایە |

٣- لە زاری ناوچەی سلێمانی صیغەی تایبەتیی کاری بوونی (با) دەقرتێت و دەبێتە:

| | |
|---|---|
| بمکردایە | بمانکردایە |

بۆ نەفیش ئامرازی (نە) دێتە جێی ئامرازی (ب)ی ئینشائی، وەک:

| | |
|---|---|
| نەمکردبا | نەمانکردبا |

تێبینی:

وا دەردەکەوێت سەلیقەی کوردی تێ گەیشتووە سروشتی (ب) کە داخوازی بوون و کردن دەکات کۆ نابێتەوە لەگەڵ ئامرازی (نە)ی نەفی، کە نەبوون و نەکردن رادەگەیەنێت، بۆیە لە هیچ صیغەیەکدا ئەم دوو ئامرازە کۆ نابنەوە، واتە کە نەفی هات (ب) دەقرتێت.

سێیەم- ئەو صیغە ئینشائییەی کە دەوەستێتە بەرانبەر رابردووی نزیکی ئیخباری:

١- جۆری دروستکردنی رابردووی ئینشائی بەرانبەری نزیکی ئیخباری تێ نەپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە راناوی جودای کاری تێ نەپەڕ، ئەنجا قەدی کارەکە، لەپاشاندا صیغەی تایبەتیی کاری (بوون) بە راناوی لکاوەوە، وەک:

ئەز نڤستبم ئەم نڤستبن (ئەم نڤستبین - بادینانی)
تو نڤستبی هوون نڤستبن
ئەو نڤستبت ئەو نڤستبن

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی بە دوا راناوی جودادا دێتە پێش کارەکە و دەبێتە:

ئەز نەنڤستبم ئەم نەنڤستبن

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووداا: لە پێشەوە قەدی کارەکە، ئەنجا کاری تایبەتیی (بوون) بە راناوی لکاوی کاری تێ نەپەڕەوە، وەک:

نوستبم نوستبین
نوستبی نوستبن
نوستبێ نوستبن

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی دەخرێتە پێش صیغەکە، وەک:

نەنوستبم نەنوستبین

٢- جۆری دروستکردنی رابردووی ئینشائی بەرانبەر نزیکی ئیخباریی تێپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە راناوی جودای کاری تێپەڕ، بە دوا ئەودا قەدی کار، ئەنجا صیغەی تایبەتیی (بوون) دێ، وەک:

من گرتبت مەگرتبت
تە گرتبت وە گرتبت
وی، وێ گرتبت وان گرتبت

دەشێت کۆتایی صیغەکە (بیت) یاخود (بیتن) بێت لە بری (بت)، کارەکەش بەم جۆرە بێت:

من گرتبیت		من گرتبیتن

مە گرتبیت		مە گرتبیتن

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی بە دوا راناودا دێتە پێش صیغەکە و دەبێتە:

من نەگرتبت		من نەگرتبیت		من نەگرتبیتن

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووda: لە پێشەوە قەدی کار ئەوجا صیغەی تایبەتیی کاری (بوون) بە ڕاناوی لکاوی کاری تێپەڕەوە دێت، بەڵام لە وێنەیەک زیاتر بۆ ئەم صیغەیە بەکار دێت:

شێوەی یەکەم: قەدی کار + صیغەی تایبەتیی کاری (بوون) لەگەڵ راناوی کاری تێپەڕ، وەک:

گرتبم		گرتبمان

گرتبت		گرتبتان

گرتبی		گرتبیان

شێوەی دووەم – قەدی کار + صیغەیەکی درێژتری کاری (بوون) لە صیغەی شێوەی یەکەم + راناوی لکاوی کاری تێپەڕ، وەک:

گرتبێتم		گرتبێتمان

گرتبێتن		گرتبێتتان

گرتبێتی		گرتبێتیان

بۆ نەفی لە هەردوو صیغەدا ئامرازی (نە)ی نەفی لە پێشەوە دێت، بە دوا ئەودا ڕاناوی لکاو، ئەوجا قەدی کار، بە دوا ئەویشدا صیغەی تایبەتیی کاری (بوون) دێت، وەک:

نەمگرتبێ		نەمانگرتبێ

[ڕوونکردنەوە:

ئەم صغەیە بۆ هەموو کەسەکان سێ جۆری هەیە: نەمگرتبێ، نەمگرتبێت، نەم گرتبێتن – نەیانگرتبێ، نەیانگرتبێت،

نەیانگرتبێتن... هتاد.

دەمڕاستی لیژنە]

چوارەم- دروستکردنی صیغەی ئینشائیی رابردوو کە دەکەوێتە بەرانبەر رابردووی دووری خەبەری:

١- جۆری دروستکردنی رابردووی ئینشائیی بەرانبەر دوور خەبەریی تێ نەپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە ڕاناوی جودای کاری تێ نەپەڕ دێ، بە دوا ئەودا صیغەی رابردووی ئینشائیی کاری (بوون) بۆ کەسی سێیەمی تاک، دواجار صیغەی تایبەتیی ئینشائیی کاری (بوون) لەگەڵ ڕاناوی لکاو، وەک:

ئەز نڤستبووباما ئەم نڤستبووباینا (ئەم نڤستبووباینا: بادینانی)

توو نڤستبووبایا هوون نڤستبووبانا

ئەو نڤستبووبایا ئەو نڤستبووبایا

بۆ نەفیش ئامرازی (نە) دەچێتە پێش قەدی کارەکەوە، بەدوا راناوە جوداکەدا، وەک:

ئەز نەنڤستبووباما ئەم نەنڤستبووبانا

ب- لە زاری کرمانجیی خوارووودا: ئەم صیغەیە دوو جۆری هەیە:

أ- جۆرێکی گشتی: لە پێشەوە قەدی کاری رابردوو «بە لادانی نونی چاوگ» ئینجا قەدی کاری رابردووی (بوون) بە دوا ئەودا صیغەی ئینشائیی تایبەتیی (بوون) لەگەڵ راناوی لکاوی تێ نەپەڕ، وەک:

نوستبووبام نوستبووباین

نوستبووبایت نوستبووبان

نوستبووبا نوستبووبان

ب- جۆری ناوچەی سلێمانی: لەم جۆرەدا تایبەتییە ئینشائییەکەی کاری (بوون) دەقرتێت، لە شوێنی ئەودا زیادییەکی تایبەتی بە راناوی لکاوەوە دێ، بە شوێن قەدی کاری ئەسڵیدا لە شکڵی رابردووی دوور، یاخود دەتوانین بڵێین لە پێشەوە قەدی کاری ئەسڵی لە صیغەی رابردووی دوور بە راناوەوە دێت ئینجا

ئەو زیادییە تایبەتییە کە جێگەی صیغەی ئینشائییە تایبەتییەکەی کاری (بوون) دەگرێتەوە، وەک:

نوستبوومایە نوستبووینایە

نوستبوویتایە نوستبوونایە

نوستبوایە نوستبوونایە

بۆ نەفیش ئامرازی نەفی (نە) لە پێشەوە دێ بەبێ گۆڕینی هیچ کەرتێک لە صیغەی کارەکەدا، وەک:

نەنوستبووبام نەنوستبووباین

یاخود لە شێوەی سلێمانی:

نەنوستبوومایە نەنوستبووینایە

٢- جۆری دروستکردنی رابردووی ئینشائی بەرانبەر دووری ئیخباریی تێپەڕ:

آ- لە زاری کرمانجیی سەروودا: لە پێشەوە راناوی جودا ئینجا قەدی کاری رابردوو، بە دوای ئەودا صیغەی ئینشائیی تایبەتیی کاری (بوون) دێ وەک:

من گرتبووبا مە گرتبووبا

تە گرتبووبا وە گرتبووبا

وی، وێ گرتبووبا وان گرتبووبا

بۆ نەفیش ئامرازی (نە)ی نەفی دێتە پێش کارەکەوە، وەک:

من نەگرتبووبا مە نەگرتبووبا

ب- لە زاری کرمانجیی خواردوودا: لێرەشدا دوو جۆر هەیە:

أ- جۆری گشتی: لە پێشەوە قەدی کار، ئەوجا صیغەی ئینشائیی تایبەتیی کاری (بوون) لەگەڵ راناوی لکاوی کاری تێپەڕ دێ، وەک:

گرتبووبام گرتبووبامان

گرتبووبات گرتبووباتان

گرتبووبای گرتبووبایان

ب- جۆری ناوچەی سلێمانی: لە پێشەوە قەدی کاری رابردووی دوور لەگەڵ راناوی

لکاوی کاری تێپەڕ دێ، ئینجا ئەو زیادییە تایبەتییەی کە جێی صیغە تایبەتییەکەی کاری (بوون) دەگرێتەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| گرتبوومایە | گرتبوومانایە |
| گرتبووتایە | گرتبووتانایە |
| گرتبوویایە | گرتبوویانایە |

لە حاڵی نەفیدا:

نەفی جۆری گشتی:

| | |
|---|---|
| نەمگرتبووبا | نەمانگرتبووبا |
| نەتگرتبووبا | نەتانگرتبووبا |
| نەیگرتبووبا | نەیانگرتبووبا |

نەفی شێوەی سلێمانی:

| | |
|---|---|
| نەمگرتبوایە | نەمانگرتبوایە |
| نەتگرتبوایە | نەتانگرتبوایە |
| نەیگرتبوایە | نەیانگرتبوایە |

تێبینی:

تەعریفی کاری رابردوو کاتی خۆی دوا خرابوو تا لە لێکۆڵینەوەی کاری ئاینده (مضارع) لە کۆبوونەوەی پەنجا و دووی ڕۆژی ١٦ - ٦ - ١٩٧٣دا تەعریفی بۆ دانرا.

تەعریفی خوارەوەی کاری رابردوو لە کۆبوونەوەی ڕۆژی باسکراوەوە، بەرەودوا، گوێزرایەوە بۆ ئێرە، ئەمەش تەعریفەکەیە:

«کاری رابردوو ئەو کارەیە کە کاتەکەی بەسەرچووبێت»

بەلای لیژنەوە ئەم تەعریفە جامع و مانعە، واتە (پڕ بە پێستی مەبەستە)، چونکە لیژنە هەموو ئەو تەعریفانەی کە بۆ کاری رابردوو دانراون لە زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی سەیر کرد، ئینجا گەیشتە ئەو تەعریفە.

کاری ئاینده

لە دوا تەواوبوونی لێکۆڵینەوە لە کاری رابردوو، لیژنە هاتە سەر تۆژینەوەی لە کاری ئاینده (مضارع). بۆ ئەم مەبەستە لیژنە گەڕایەوە بۆ ئەو تەعریفانەی کە لە کتێبە جودا جوداکانی رێزماندا باس کراون. دیسان لیژنە بە پێویستی زانی تەعریفێک بێنێتەوە، کە هەم لەگەڵ تەعریفی کاری رابردوودا هاوئاهەنگ بێت، هەم دەرفەتی رەخنە لێگرتنی نەدا:

«کاری ئاینده، ئەو کارەیە کاتەکەی ئێستا یا لە مەودوا دێت».

بەلای لیژنەوە ئەم تەعریفەش وەک هینەکەی پێشوو پڕ بە پێستی مەبەستە.

[روونکردنەوە:
دەتوانرێ، لە رێی بەراوردکردن لەگەڵ تەعریفی کاری رابردوودا بگوترێ «کاری ئاینده ئەو کارەیە کاتەکەی بەسەر نەچووبێت».
ئەم گوتەیەی «بەسەر نەچووبێت» ئێستا و دواتریش دەگرێتەوە.
دەمڕاستی لیژنە]

دروستکردنی کاری ئاینده:

لیژنە هاتە سەر جۆری وەرگرتنی کاری ئاینده؛ جارێ لەوە کۆڵییەوە کە ئایا کاری ئاینده لە چاوگ یا لە کاری رابردوو یا رەگی کار وەردەگیرێت. لە دوا موناقەشەیەکی زۆر و ئیستیقرای گەلێک لە کارەکانی زمانی کوردی لیژنە گەیشتە ئەو باوەڕە کە وا دروستکردنی کاری ئاینده لە کوردیدا تابیع بە یەک دەستوور نییە، وە لێکۆڵینەوەی ئەو باسە رێگە بۆ تاکەیاک رای دەرناکات. بۆ روونکردنەوە دەڵێین لێرە بە پێشەوە نووسەران گوتوویانە کاری ئاینده دەشێ لە سێ رێگەوە وەربگیرێ:

١- رێی چاوگ.
٢- رێی کاری رابردوو.
٣- رێی رەگی کار.

بەڵام لیژنە کە هات ئەم قاعیدانەی تەطبیق کرد بەسەر نموونەی کارەکانی

کوردی بۆی دەرکەوت ئەو کارانە هەموویان یەک جۆر نین لەلایەنی چۆنێتیی مانەوەی ڕەگیان، وەیا نیسبەتی کاری رابردوو لەگەڵ ئایندەدا، هەر تاقمێک لە کاری کوردی مومکینە بۆ خۆیان بکەونە ژێر قاعیدەیەک کە زۆر جودا بێت لە قاعیدەی تاقمێکی تر، دەست نیشانکردنی ئەو جۆرە تاقمانە و تابیع بوونیان بە دەستوورێکی تایبەتیی خۆیان، بەندە بە ئیستیقرای زۆربەی کارەکان لەزمانی کوردیدا، کە ئەمەش تا ئێستا کەس نەیکردووە (بابیی ئەوە کە لیژنە ئاگادار بێت) وە کردنیشی کاتێکی درێژتری دەوێت لەو کاتەی کە لیژنە بەدەستییەوە هەیە، لەبەر ئەوە لیژنە هاتە سەر ئەو قەناعەتە کەوا ئیشێک ئێستا لە ئیمکاندا بێت بکرێت لە بارەی دانانی دەستوور بۆ کاری ئایندە لە کوردیدا ئەوەیە کە قاعیدەی بێگومان (مطرد) باس بکرێت و دەستووری بۆ دابنرێت. ئەو دەستوورانەی کە شازیان (ریزپەڕ) تێ دەکەوێت، وەیا دەشێ پێیان بگوترێت (سەماعی) بخرێتە دواتر.

لەو قاعیدانەی کە گومانیان تێدا نییە لە دروستکردنی کاری ئایندەدا ئەمانەن:

١- کاری ئایندە لە کوردیدا عەلامەتی تایبەتیی خۆی هەیە کە ئەویش (دە)یە، کە دەکەوێتە سەرەتای کارەکەوە. لە شێوەی ناوچەی سلێمانیدا ئەم (دە)یە بە (ئە) تلفظ دەکرێت، هەروەها لە ناوچەی ئەردەلانیش. لیژنە وا بەباش دەزانێت دۆزینەوەی هۆی ئەم گۆڕانە لە (دە)وە بۆ (ئە) بەجێ بهێڵرێت بۆ دراسەیەکی قووڵتر[1].

لە شێوەی کرمانجیی سەروودا ئەم (دە)یە بە (د – di) تلفظ دەکرێت، ئەمانەش نموونەی هەرسێ جۆری عەلامەتەکە:

دەچم ئەڕۆم دکرم

پێویستە لێرەدا دووبارەی بکەینەوە لە شێوەی کرمانجیی سەروودا لە صیغەی داهاتوو (مستقبل) لە جیاتی (د) ئامرازی (دێ) بەکار دێت، وەک:

دێ چم

دێ کرم

---

(١) مامۆستا توفیق وەهبی ئەم لێکۆڵینەوەیەی کردووە لەو گوتارەی کە لە بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوبووەوە لە ژێر ناونیشانی (ئەسڵی پیتە قاڵبی «ئە»ی شێوەی سلێمانی).

٢- ئەو کارانەی کە لە عەرەبیدا پێیان دەڵێن مطاوعە (جارێ لیژنە زاراوەی - کاری ڕوودان - ی) پێشنیاز کرد بۆ ئەو جۆرە کارانە)وە زۆربەیان کۆتاییيان بە پیتی (ا) دێ دەستووریکی روونیان هەیە هەموویان دەگرێتەوە لەم نموونانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

| چاوگ | ڕابردوو | ئایندە |
| --- | --- | --- |
| ڕژان | ڕژا | دەڕژێ (دەڕژێم - دەڕژێین) |
| پسان | پسا | دەپسێ (دەپسێم - دەپسێین) |
| سووتان | سووتا | دەسووتێ (دەسووتێم - دەسووتێین) |

ئاشکرایە کە دروستکردنی کاری ئایندە لەو جۆرە کارانە، بەهێنانی حەرفی موزارەعەت لە پێشەوە و گۆڕینی ئەلفەکە بە (ێ) و فڕێدانی نوونی چاوگەکە و هاتنی ڕاناوی لکاو پێک دێت.

تێبینی:

لە کەسی سێیەمی تاکدا (ێ)ی کۆتاییی کارەکە (ڕاناو) نییە و ئەلفەکەیە و بووەتە (ێ). بوون و نەبوونی ڕاناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاک لە ئایندەدا، باسێکە لەمەوبەر لیژنە لێی دواوە و ئەندامانی لە یەک باوەڕدا نەبوون دەربارەی.

٣- ئەو کارانەی کە کۆتاییيان بە پاشگری (اندن) دێت، لەوانیشدا دەستوورێکی ئاشکرا هەیە بۆ وەرگرتنی ئایندە وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

| چاوگ | کاری ڕابردوو | کاری ئایندە |
| --- | --- | --- |
| ڕژاندن | ڕژاندم | دەڕژێنم |
| زیڕاندن | زیڕاندم | دەزیڕێنم |
| پساندن | پساندم | دەپسێنم |
| وەراندن | وەراندم | دەوەرێنم |

لە مانەشدا ئەلفەکە دەبێت بە (ێ) و، (دن) لە چاوگە کە فڕێ دەدرێت و ڕاناوی لکاوی بە دوادا دێت، هەڵبەتە (دە) یا (ئە) یا (د)ی موزارەعەتی بە پێشدا دێت.

تێبینی:

بۆ کەسی سێیەمی تاک کە دەگوترێت (دەڕژێنێ، دەپسێنێ..)

بە نیسبەت ئەو (ێ)یەی وا بە کۆتایی کارەکەوە، هەندێ کەس باوەڕی ئەوەیە کەرتی راناوی لکاو بێت و تەواوی کارەکە (دەڕژێنێت، دەزیرێنێت) بێت. واتە (ێ) بە تەنیا بێت یا (ێت) بە راناوی دادەنێت و لەمانە کاک (نووری عەلی ئەمین) باوەڕی وایە. بەڵام بەلای مامۆستا مەسعوودەوە (دەڕژێنێ و دەڕژێنێت و دەڕژێنێتن) هەروەها هەموو کاری ئایندەی کەسی سێیەمی تاک راناویان نییە و ئەو زیادییەی لە کۆتایی کارەکەوە دێت زیادییێکی (تصریفی)یە و هەر جارە بە جۆرێک خۆ دەگۆڕێت بە گوێرەی مۆسیقای وشەی کارەکە، وەک (دەکات، دەچێت، دەژیت). ئەگەر ئەمانە راناو بوونایە نەدەبوو هەرجارە بە وێنەیەک خۆیان دیار بخەن، جگە لەمە دەبوایە بۆ «ئیسناد»یش لە رستەدا پەیدا ببنەوە، هەروەک دەگوترێت: «ئێمە جوانین – ئێوە جوانن» دەبوایە بگوترایە: «ئەو جوانێت» یاخوت «جوانات» وەیاخوت «جوانیت» چونکە لە کوردیدا راناوی لکاوی کاری ئاینده دەبێتەوە ئەداتی ئیسناد هەروەک راناوی لکاوی کاری تێپەڕ «ت، م، ی، تان، مان، یان» دەبنە مضاف الیه (برام، برات، برای، برامان، براتان، برایان).

٤– ئەو کارانەی کە کۆتاییان بە (ی) دێت، وەک لەم چاوگانەی خوارەوە دەردەکەوێت (فڕین، ناڵین، لەقین، تەپین، تەزین، زانین، نووسین، کۆشین، گوشین، کڕین) ئەویش دەستوورێکی داڕشتنی ئاشکرای تێدا بەدی دەکرێت:

| چاوگ | رابردوو | ئاینده |
|---|---|---|
| تەزین | تەزیم | دە (تەز)م |
| تاشین | تاشیم | دە (تاشـ)م |
| فڕین | فڕیم | دە (فڕ)م |

دروستکردنی موزاریعەکە بە فڕێدانی (ی)ی کۆتایی نوونی چاوگ و هاتنی ئیشارەتی موزارەعەت لە پێشەوە و ئەنجا راناوی لکاو لە دوایدا دەبێت. لەو نموونانەی تا ئێستا هاتوونە بەرچاوی لیژنە ئیستیثنایەک پەیدا نەبووە، مەگەر لە

تاکە کاری (ژین) بەولاوە کە لە زاری سلێمانیدا (ی)کەی دەمێنێتەوە بە خیلافی قاعیدە. بەلای لیژنەوە ئەصڵی کارەکە لە دەستوور لانادا بەڵام لە زاری سلێمانیدا گۆڕانی بە سەردا هاتووە و کردوویەتی بەشاز (ریزپەڕ). ئەصڵی کارەکە لە چاوگی (ژیان)ەوە، وەردەگیرێ، ئەوسا دروستکردنی کاری موزاریع لەم چاوگە بەر قاعیدەی «أفعال المطاوعة) دەکەوێت، بەو پێیە دەگوترێت:

| چاوگ | رابردوو | ئایندە |
|---|---|---|
| سووتان | سووتام | دە (سووتێـ)م |
| ژیان | ژیام | دە (ژیێـ)م |

[ روونکردنەوە:

لێرە بە پێشەوە گوتوومە کەسی سێیەمی تاک لە رابردووی تێ نەپەڕ و لە هەموو ئایندەدا راناوی لکاوی نییە، لەبەر ئەمە بەلای منەوە لەو فیعلانەدا وەک: (دەتەزێت، دەتاشێت، دەفڕێت... هتاد) دوو پیتی کۆتایی کە (ێت)ە راناو نین بگرە بەشێکی تصریفن وەک (دەتەزێتن، دەفڕێتن).

دەمڕاستی لیژنە]

٥- ئەو کارانەی کە کۆتاییان بە (ت)دێ، سەرنجی لیژنەیان ڕاکێشا لەلانی ئەوەوە کە زۆربەیان بەر دەستوورێکی تایبەتی دەکەون بۆ دروستکردنی ئایندە لێیان، لە پێشەوە لیژنە ئیستیقرایەکی کرد لەو ماوەیەی کە بەدەستییەوە بوو، بۆ دۆزینەوەی ئەو جۆرە کارانە تاگەیشت بە رێکخستنی لیستەی خوارەوە:

«فرۆشتن، کرۆشتن، خستن، کەوتن، گرتن، گەیشتن، بیستن، پاراستن، هاویشتن، بەستن، خەوتن، بزووتن، رێستن، گەستن (گەزتن)، بێشتن (بێژتن)، چێشتن (چەشتن)، رێشتن (رشتن)، ئەنگوتن، پەستن، گڵوفتن، ژنەوتن، سرەوتن، لێستن (لستن)، خواستن، ئەنگاوتن، پاڵاوتن، پەستاوتن، قەڵاشتن، گواستن (گواستنەوە)، شوشتن، نووستن، رۆیشتن، خستن، گوتن، هێشتن، ماشتن، داشتن، ناشتن، هاتن، مشتن، ئاخاوتن».

لەم کارانەدا بە پێی دەست بژارێک کە لیژنە لێی کردن - ئەمانەی خوارەوە بەر دەستوورێکی بێ تەگەرە دەکەوون:

«کرۆشتن، فرۆشتن، کوشن، کەوتن، بزووتن، بیستن، بەستن، قۆستنەوە، خەوتن، رێستن، گەستن (گەزتن)، بێشتن (بێژتن)، چێشتن (چێژتن)، مشتن (مژتن)، رێشتن (رشتن)، ئەنگووتن، پەستن، گلۆفتن، ژنەوتن، سرەوتن، لێستن (لستن)».

دروستکردنی کاری ئایندە لەو چاوگانە بە جۆرێکی گشتی بەم پێیە دەبێ:

لە پێشەوە حەرفی موزارەعەت ئەنجا قەدی کار دێت و پیتی (ت)ی کۆتاییی کار و (ن) چاوگی دەقرتێن و دەبنە:

| چاوگ | رابردوو | ئایندە |
|---|---|---|
| فرۆشتن | فرۆشتم | دە (فرۆش)م |
| کەوتن | کەوتم | دە (کەو)م |
| بزووتن | بزووتم | دە (بزوو)م |
| بیستن | بیستم | دە (بیس)م |

هەندێ تێبینی هەیە وەک ئەوەی ئەو کارانەی پیتی (ش)یان تێدایە، لە پێش پیتی (ت)ەوە، بەزۆری لە موزاریعدا دەبن بە (ژ)، وەک:

| | |
|---|---|
| کوشتن | دەکوژم |
| کرۆشتن | دەکرۆژم |
| ناشتن | دەنێژم |
| بێشتن | دەبێژم |

پیتی (ش) و پیتی (ژ) لە یەکتری نزیکن، دەشێ بە یەکتری بگۆڕینەوە. ئەو ئیحتمالەش هەیە لە بنەڕەتدا وشەکان «کوژتن» و «کرۆژتن» بووبن و پیتی «ژ» تێیاندا گۆڕابێ بە «ش» چونکە پیتی «ژ» لەگەڵ پیتی «د» زیاتر دەگونجێت و پیتی «ش»ش لەگەڵ پیتی «ت».

تێبینیی دووەم ئەوەیە وشەی «بەستن» و «بیستن» وادەبێت موزاریعەکەیان پیتی

«ت»ەکەیان دەمێنێت و دەگوترێت «دەبەستم و دەبیستم» واش دەبێت «ت»ە کە دەقرتێت و بە پێی دەستوور دەبنە «دەبەسم و دەبیسم».

وشەی «گەستن»یش لە موزاریعدا «س»ەکەی دەبێتە «ز» کە ئەویش لە تلفظدا زۆر لە دەنگی (س) نزیکە. ئیمکانیش هەیە وشەکە لە بنەڕەتدا «گەزتن» بوو بێت بەڵام «ز»ەکە گۆڕابێت بە «س» چونکە دەنگی (س) حەز لە دەنگی (ت) دەکات دەنگی (ز)یش حەز لە (د) دەکات.

ئەو چاوگانەی کە لە بڕگەی یەکەم وەیا دوومیاندا پیتی «ا»یان تێدایە، وەک: « ناشتن، پاراستن، ئەنگاوتن، پالاوتن، پەستاوتن، قەلاشتن، گواستنەوە» دەستوورێکی تایبەتییان هەیە هەموو تێیدا بەشدارن: لە موزاریعدا پیتی (ا)ەکە دەکرێت بە (ێ) و لەسەر قاعیدەی ئەسڵی، «تن»ەکە دەقرتێت و دەبنە «دەپارێزم، دەئەنگێوم، دەپاڵێوم، دەپەستێوم، دەقەڵێشم، دەگوێزمەوە، دەنێژم».

لە «خواستن، گواستنەوەی»دا دیسان «س»ەکە دەبێتە «ز» ئەویش وەک ئەو (س)ەی لەمەوپێش لێی دواین. چاوگی «خواستنەوە» بەر ئەم دەستوورە ناکەوێت و «ا»ەکەی ناگۆڕێت بە (ێ).

[ڕوونکردنەوە:

لە زۆر لەهەجەدا (گواستنەوە)ش هەر دەبێتە (دەگوزامەوە) وەک (دەخوازمەوە). دەتوانم بڵێم ئەم دوو وشەیە دەنگەکەی (ا) تێیاندا دەکەوێتە ناو بڕگەی یەکەمەوە. وشەی (دەگوێزمەوە) لە کاری (گوێزانەوە)وە وەرگیراوە و چووەتە لەهجە ئاخاوتنەکانەوە.

دەمڕاستی لیژنە]

لە چوار چاوگی «هاتن، ناشتن، ماشتن، داشتن» دووەکەی سەرەتا، واتە «هاتن، ناشتن» قاعیدەیەکیان هەیە کە دەبنە «دێم، دەنێژم»: پیتی «ا» لە هەردووکیاندا دەبێتە «ێ» و دوو پیتی «تن»یش دەقرتێن، ئەوەندە هەیە ئایندەی «هاتن» کورت کراوەتەوە لە «دەهێم»ەوە بووە بە (دێم). ماشتن و داشتن دەبن بە «دەماڵم و دەدێرم» کە هەردووکیان شازن. بەڵام لە زاری کرمانجیی سەروودا وشەی ماشتن پیتی «ل»ی تێدایە و «ماڵشتن»ە. بەو پێیە موزاریعی ئەم وشەیە لە زاری سەروودا

کەمتر لە ئەسلّی خۆی دوور کەوتووەتەوە. ئایندەی «داشتن» کە دەبێتەوە «دەدێرم» دەگەڕێتەوە بۆ «دێران»، ئەویش هەر بە واتای ئاودانە.

لە سێ چاوگی «ڕۆیشتن، شوشتن، نووستن» ظاهرەیەک دەردەکەوێت وەک دەستوور کە بریتییە لەوە هەموو پیتەکانی دوای پیتی «و» دەقرتێن و مضارعەکەیان دەبێتە «دەڕۆم، دەشۆم، دەنووم». ئەم قاعیدەیە هەر بۆ ئەو جۆرە چاوگانە دەبێت کە پیتی «و» لە دوای یەکەم پیتی چاوگەکەوە بێت، کە کەوتە دواتر بەرقاعیدە ناکەوێت، وەک «گلۆفتن، کرۆشتن، فرۆشتن».

[ڕوونکردنەوە:

ئەو چاوگە تائییانەی وەک: پەستاوتن، ئەنگاوتن، گواستنەوە... کە لە بڕگەی دووەمیاندا دەنگی ئەلف «ا» هەیە بەر هەمان قاعیدەی کارەکانی وەک: ژماردن، هەناردن، سپاردن، بواردن، هەڵپەساردن... هەتاد دەکەون کە لەوانیشدا دەنگەکەی ئەلف «ا» لە ئایندەدا دەبێتە «ێ» وەک: دەژمێرم، دەهەنێرم، دەسپێرم، دەبوێرم، هەڵدەپەسێرم. دیارە لەم کارانەدا کە بڕگەی دووەمیان دەنگی ئەلفیان تێدایە فەرق بەوە ناکرێ ئایا کارەکان دالین یاخود تائی.

دەمڕاستی لیژنە]

چی دەمێنێتەوە لە چاوگەکانی کە خرانە لیستەی سەرەوە هەموویان شازن و قاعیدەی گشتی نایان گرێتە، پێویستە چۆنەتیی دروستکردنی مضارعیان تاک تاک لەبەر بکرێن.

٦- ئەو چاوگانەی کە پیتی پێش (ن) چاوگیان پیتی (ا)یە، لە هەمان کاتیشدا لە جۆری ڕوودان (مطاوعە، وقوع) نین لە موزاریعدا ئەلفەکەیان دەپەڕێت، وەک:

| چاوگ | ڕابردوو | ئاینده |
|---|---|---|
| کێلّان | کێلّام | دەکێلّم |
| وێران | وێرام | دەوێرم |

لەو جۆرە کارانە سەرەرای دوو کاری پێشەوە ئەمانەی خوارەوەشی دۆزیوەتەوە کە لەم بابەتەبن:

پێوان، کێشان، هەڵستان، هێنان، هەڵهێنجان، کوتان، پێچانەوە، شێلان، کۆشان.

لەم کارانە تێبینییەک دەکرێت کە زۆربەیان لە جۆری تێپەرن، وا پێ دەچێت نزیکیی کاری تێ نەپەڕ لە رووی واتاوە لەگەڵ کاری روودان (مطاوعة)، وای کردووە سەلیقەی کوردی خۆ بپارێزێ لەوە کاری تێ نەپەڕ بخاتە ژێر ئەوقاعیدەیە نەکا شوبهەی کوردی خۆ بپارێزێ لەوە کاری تێ نەپەڕ بخاتە ژێر ئەو قاعیدەیە نەکا شوبهەی مطاوعەی لێ بکرێت. بۆیە تەنیا ئەو کارە تێ نەپەڕانەی کە بە ئاشکرایی خۆ لە مطاوعە جودا دەکەنەوە کەوتوونەتە بەر ئەم قاعیدەیە.

[روونکردنەوەی:

لە لیستەی سەرەوە تەنیا دوو کاری (کۆشان و هەڵستان) تێ نەپەڕن. کاری هەڵستان لە (هەڵوەستان)ەوە وەرگیراوە، ئەسڵەکەشی (وەستان)ە. کاری (وەستان) ئەگەر بە واتای (پەک کەوتن لە رۆیشتن) بێت، دەکەوێتە بەر بەشی (مطاوع) و دەبێ لە ئایندەدا بگوترێ (دەوەستێم).

جگە لەمانە ئەم کارانەش هەن کە دەنگی ئەلف تێیاندا دەکەوێتە پێش نوونی چاوگ و نەک هەر (مطاوع) نین، تێپەڕیشن:

پێکان، بێژان، نان، هێلان، دان، دێران، [بە واتای ئاودان، لە ئایندەدا دەبێتە دەدێرم]، جێوان، گێڕان، گوێزانەوە. [بێگومان هی تریش چنگ دەکەون].

جگە لە دوو کاری (نان، دان) ئەوانی تر هەموویان دەستوورین، لە ئایندەدا بە پێی دەستووری گشتی دەبنە (دەپێکم، دەبێژم، دەهێلم، دەدێرم، دەجێوم، دەگێرم، دەگوێزمەوە).

کاری نان کە دەبێتە (دەنێم) لە بنەڕەتدا (نیان)ە، ئەویش بە پێی دەستوور گۆڕاوە بۆ ئایندە. بەڵگەی (نیان) لەم دێرە شیعرەی

حاجی مەلا عەبدوڵڵا کە بۆ شێخ عومەری بیارەی هەناردووە دەردەکەوێت:

«لە پاش بۆسیدەن و بۆییدەنی تام»

«نیامە سەر سەر و چاوم بە ئیکرام»

کاری (دان) کە دەبێتە (دەدەم) دەبوو ببێتە (دەدم). دیارە لە کۆندا رواڵەتێکی تری هەبووە، کە ئێرە جێی لێکۆڵینەوەی نابێتەوە.

لە هەموو کاران ریزپەڕتر کاری (مان)ە کە لە واتادا (مطاوع)ە بەڵام لە تصریفدا وەک ئەو کارانە تصریف دەکرێ کە (اندن)یان پێوەیە چونکە دەبێتە (دەمێنم) وەک (دەچێنم). لە فارسیدا (ماندن)ە، ئەگەر لە کوردیشدا وەها مابایەوە تصریفەکەی (دەمێنم)ی هەڵدەگرت.

دەمراستی لیژنە]

٧- لیژنە (٦) چاوگی دۆزییەوە کە پیتی پێش نوونی چاوگییەکەیان (وو) بێت، وەک (دروون، گروون، چوون، بوون، سوون، جوون).

دروون و گروون دەکەونە بەر یەک قاعیدە و لە موزاریعدا نوونی چاوگییان دەپەڕێت. بەڵام دوو تێبینییان تێدا بەدی دەکرێت لە چاو چوارەکەی تریان:

تێبینیی یەکەم:

ئەوەیە هەردووکیان تێپەڕن.

تێبینیی دووەم:

ئەوەیە وەک چوارەکەی تر، واوەکەیان نەکەوتووەتە دوای یەکەم پیتی وشەکە، کەواتە ئەم دوو کارە تاقانەیەی واوی دەستووریکی تایبەتیی خۆیان هەیە و مضارعەکەیان دەبێتە (دەدرووم، دەگرووم). لە چوار کارەکەی ترا (چوون و بوون) واوەکەیان لە مضارعدا دەقرتێن و دەبنە (دەچم، دەبم). دەمێنێتەوە دوو کارەکەی (سوون و جوون) کە لە مضارعەکەیاندا واوەکەیان ناقرتێت و لە رواڵەتدا بەر قاعیدەی (چوون) و (بوون) ناکەون و دەبنە شاز (ریزپەڕ). بەڵام سەرنج دەری

دەخا، ئەسڵەکەیان (ساوین) و (جاوین) بووە، وە ئێستا لە هەندێ ناوچەی کوردستان هەر بەم جۆرە لەکار دێن. لە هەندێ جێگای تریش ئەلفەکەیان قرتاوە و بوون بە (سوین) و (جوین). کە حاڵ وابێت هەردووکیان بەر قاعیدەی چاوگی یایی دەکەون و بوونەتە (دەساوم، دەسووم، دەجاوم، دەجووم) و هیچ کامێکیان لە حەقیقەتدا شاز نین.

٨- ئەو چاوگانەی کە حەرفی پێش نوونی چاوگییان (د)ەیە و زنجیرەی چاوگی کوردی بەو کۆتاییی پێ دێت [چونکە لە پێش نوونی چاوگی یا (ا) یا (و) یا (ی) یا (ت) یا (د) دێت] وە بریتین لەمانەی خوارەوە (کردن، بردن، مردن، شۆردن، شردن، خواردن، بژاردن، ژماردن، بواردن، هاوردن، سپاردن، شاردن، ناردن، هەڵکەندن، هەڵپەساردن، راندن) بە سەرنج دەردەکەوێت کە تاقمێکیان بەر دەستووری دەکەون، ئەو تاقمەش ئەو چاوگانەن کە بە (اردن) کۆتاییان دێ بە ئیستسنای چاوگی (خواردن) چاوگەکان ئەمانەن:

(بژاردن، ژماردن، بواردن، سپاردن، شاردن، هەناردن، هەڵپەساردن). تێکڕای ئەمانە بەر دەستووری (اندن) دەکەون، کە لە مضارعدا ئەلفەکەی دەبێت بە (ێ) و دال و نوونەکەی دەقرتێن، ئیتر دەبنە: دەبژێرم، دەژمێرم، دەبوێرم، دەسپێرم، دەشێرمەوە، هەڵدەپەسێرم، دەهەنێرم [ئەمەی دواییان، سواوە و بووە بە «ناردن - دەنێرم»].

وەک گوتمان چاوگی (خواردن) کە موزاریعەکەی دەبێتە (دەخۆم) بیژۆکە دەبوو بە پێی قاعیدە ببێتە (دەخوێرم). لە هەندێ شێوە بەشێکی ئەم بنجەی ماوە و دەڵێن (دەخۆرم) هەربایی ئەوە لە دەستووری لاداوە کە ئەلفەکەی نەکردووە بە (ێ) و پەڕاندوویەتی.

تێبینییەک لێرەدا دەکرێت، ئەویش ئەوەیە لیژنە چاوگی (اندن)ی نەخستە ژێر قاعیدەی چاوگی دالی لەو رووەوە کە (اندن) تاکە صیغەی تێپەڕاندنە لێی دەوەشێتەوە بخرێتە بەر دەستوورێکی تایبەتی، دیاریشە (د)ی (اندن) ئەسڵی نییە صیغەی (تێپەڕ) هێناویەتی. بە نیسبەت چاوگی (راندن) کە لە رواڵەتدا بە (اندن) کۆتایی دێت و دەبوایە مضارعەکەی ببوایە (دەڕێنم) کەچی (دەڕانم)ە، بەلێکۆڵینەوە دەردەکەوێ، لە بەکارهێنانیشدا هەیە چاوگەکەی (رانین)ە، کە

مەصدەرێکی یاییيە بە پێی قاعیدەی چاوگی یایی لە مضارعدا پێویستە (ین) بپەڕێت، بەو پێیە (دەڕانم) لە دەستووری لانەداوە وەک دەناسم، دەزانم.

شردن، بردن، مردن رواڵەتیان یەکێکە بەلام وشەی (مردن) لە رووی ئەوەوە کە «لازم – تێ نەپەڕ»ە دەبێت بە جودا قسەی لێ بکرێت (شردن و شۆردن) هەردووکیان بەیەک واتان.

ئەو لەهجەیەی «شردن» بەکار دێنێت لە مضارعدا دەیکاتەوە «دەشۆم» بۆیە بەر قاعیدەی (شوشتن) دەکەوێت و لێرە بە پێشەوە قسەی لێ کراوە، کەواتە ئەم لەهجەیە بەرێکەوت وشەی (شردن) لە وشەی (شۆردن)ەوە تێی کەوتووە بەلام وادیارە بە تەواویی تێیدا جێگرە نەبووە کە ئەسڵی «شوشتن»ی لەبیر بباتەوە بۆیە لە مضارعدا دەگەڕێتەوە.

(شۆردن) هەرچەند چ هاوڕێی وەک خۆی نییە بۆ خۆی بەر قاعیدەی وەرگرتنی مضارع دەکەوێت لەو رووەوە کە دەبێتە «دەشۆرم» و دوو پیتی «د، ن»ی لێ دەقرتێت.

[روونکردنەوە:

بە پێی لێکدانەوەی خۆم کاری (دەشۆرم) لە کاری (شۆرین)ەوە وەرگیراوە کە ئەویش وەک هەموو کارێکی یائی تصریف کراوە. بە نموونە (شۆرین، گۆڕین، کوڵین، نۆڕین، دۆزینەوە – هەروەهاش نووسین، تاشین، کڕین...) سەرلەبەریان بە قرتانی (ین)ی چاوگەکەیانە دەبنە (دەشۆرم، دەگۆڕم، دەکوڵم، دەنۆڕم، دەدۆزمەوە – دەنووسم، دەتاشم، دەکڕم...) ئیتر مضارعی شۆرینە بۆ شردن و شۆردن دێتەوە.

دەمڕاستی لیژنە]

دوو چاوگی «کردن، بردن» هەردووکیان لە مضارعدا یەک صیغەیان هەیە کە ئەویش مانەوەی تەنیا پیتی یەکەمە و قرتانی هەموو پیتەکانی تر و هاتنی بزوێنێکی لاوەکی «ە»یە بە دوا ئەودا «دەکەم، دەبەم».

مردن کە لازمە خۆی جودا کردووەتەوە لە «کردن و بردن» لە مضارعدا بەر

قاعیدەی قرتانی «د، ن» دەکەوێت و دەبێتە «دەمرم». لە غەیری ئەم کارانە کە خرانە ژێر قاعیدە و باسیان لێ کرا چەند فیعلێکی تر هەن وەک (ویستن) کە مضارعەکەی لە بەکارهێنانی ئێستادا دەبێتە (دەمەوێ) و بیژۆکە، یاخۆت هەندێ کار کۆتاییان بە ئەلف دێت و بەر قاعیدەی چاوگی ئەلفی ناکەون یاخود هەندێ کاری تر بە ئیستیقرا معلوم دەکرێت کە دارشتنێکی تایبەتیی خۆیان هەیە، تێکڕای ئەم کارانە بەجێ هێشتران بۆ لێکۆڵینەوە لە دوارۆژدا.

لیژنە لە دارشتنی (کاری ئایندە) بووەوە و بە پێویستی نەزانی لەوە زیاتر درێژەی پێ بدات، ئەوەندە هەیە لیژنە لەو باوەڕەدایە کە چۆنێتیی دارشتنی کاری ئایندە و ریزپەرەکانی و چوونە ناو وردەکاریی ئەو باسەوە فەرمانێکی یەکجار درێژە و خۆتەرخانکردنێکی تەواوی دەوێت، لەبەر ئەوە چی تر لەسەر دارشتنی کاری ئایندە نەڕۆیشت بەڵام دەبێ ئەم تێبینییە گرنگەی خوارەوە بخاتە بەرچاو:

لەو دەستووانەی کە باس کران بۆ دارشتنی کاری ئایندە بە نیسبەت کەسی سێیەمی تاکەوە چەند دەستوورێکی تایبەتی هەیە لە هی کەسەکانی تر جودا دەبنەوە.

دەدیترێت لە هەموو کارەکانی ئایندەدا بۆ کەسانی یەکەمی تاک و کۆ و دووەمی تاک و کۆ و سێیەمی کۆ پیتی پێش (راناو) لە کارەکەدا بۆ هەموو کەسەکان یەک پیتە، وەک:

دەخۆم – دەخۆین

دەخۆیت – دەخۆن

دەخۆن

دەکەم – دەکەین

دەکەیت – دەکەن

دەکەن

دەفرِم – دەفرِین

دەفرِیت – دەفرِن

دەفرِن

بەڵام پیتی پێش ئەم ڕاناوانە لە کاری کەسی سێیەمی تاکدا بە ئەغلەب دەگۆڕێت و لە هی کەسەکانی تر جودا دەبێتەوە و دەگوترێ:

دەخوات

دەکات

دەفڕێت

لیژنە بە ئیستیقرا گەیشتە دۆزینەوەی دەستوور بۆ جۆری گۆڕانی ئەو پیتانەی کە گوتمان دەکەونە پێش راناوی کەسەکانەوە:

دەستووری یەکەم:

هەموو ئەو چاوگانەی کە پێیان دەگوترێت چاوگی (ئەلفی) تێپەڕ بن یا تێ نەپەڕ بن، تێ نەپەڕی عادەتی یا مطاوعە بن، لە کاری ئایندەدا بۆ کەسی سێیەمی تاک ئەلفەکەی دەبێت بە (ێ)، وەک:

خووسان　　سووتان　　رمان (ئەمانە مطاوعەن)

هەڵستان　　(ئەمە تێ نەپەڕی عادەتییە)

کێلان　　پێوان　　شێلان (ئەمانە تێپەڕن)

لەو چاوگانەدا صیغەی کەسی سێیەمی تاک لە ئایندەدا ئەلفەکەیان دەبێتە (ێ) و دەگوترێت:

دەخووسێ

دەڕمێ

هەڵدەستێ

دەکێڵێ

دەپێوێ

دەستووری دووەم:

بۆ دارشتنی صیغەی مضارعی کەسی سێیەمی تاک لە چاوگی غەیر ئەلفی دەبێ سەیری صیغەی مضارعی کەسەکانی تر بکرێت، لەوانەوە صیغەی کەسی سێیەمی تاک بدۆزرێتەوە. لێرە دەستوورەکە دەبێت بە دوو بەشەوە:

١- ئیستیقرا دەری دەخات کەوا لەو کارە موزاریعانەی کە پیتی پێش راناوە کەسییەکان (ۆ) یاخوت (ە) بوو، بۆ کەسی سێیەمی تاک ئەلفێک بە دوا واوەکەدا دێت و (ە)کەش بۆ خۆی دەبێتە (ا). بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| دەخۆم | دەخوا[1] |
| دەڕۆم | دەڕوا |
| دەکەم | دەکا |
| دەخەوم | دەخا |

٢- دیسانەوە ئیستیقرا دەری دەخات کە هەموو کارەکانی تر بۆ کەسی سێیەمی تاک کۆتاییان وەک چاوگە ئەلفییەکان بە (ێ) دێت، وەک:

| | |
|---|---|
| دەچم | دەچێ |
| دەمرم | دەمرێ |
| دەفڕم | دەفڕێ |

---

(١) نووری عەلی ئەمین دەڵێت وەک لەمەوبەر روونم کردووەتەوە، ئەگەر کاری ئایندە رەگەکەی کۆتاییی بە پیتە بزوێنی (ۆ، ە) هات وەک ئەو میسالانەی سەرەوە لە صیغە کەسییەکانی تردا جگە لە صیغەی کەسی سێیەم، ئەوا لە صیغەی کەسی سێیەمدا لەبەر گرانیی تلفظ پیتە بزوێنی (ۆ) دەبێت بە (و)، وە پیتە بزوێنی (ە) دەبێت بە (ا) وە راناوی (ا) یا (ات) دەلکێنرێت بەو کارە مضارعانەوە کە کۆتاییان بە پیتە بزوێنی (ۆ) دێ، وە هیچ یا (ت) دەلکێنرێت بەوانەی کۆتاییان بە (ە) دێت، چونکە دوو ڤاوڵ زەحمەتە بگەنە یەک.

[روونکردنەوە:

کاری (خستن) لە زۆر لەهجەدا (یەخستن، یێخستن)ە. لە بەستەدا هەیە:

هات کاروانی کەرداران

یێخستیان لە بن داران

لێ دەن دەردی حەلۆکێ

صیغەی ئایندەشی دەبێتە (دەیەخێ - دەیێخێ). لەمەدا ئەم تەعەلیلەی بە دوایەکتردا هاتنی دوو بزوێن جێی نابێتەوە.

دەمڕاستی لیژنە]

دەبەستم دەبەستێ

دەکەوم دەکەوێ

ئەمانەی کە لێی دواین تایبەتیی زاری کرمانجیی خواروون، بەڵام تایبەتییەکانی زاری کرمانجیی سەروو لە دارشتنی صیغەی کەسی سێیەمی تاک لە لایەن مامۆستا سادق بەهائەدینەوە ئامادە کراوە وەک لای خوارەوە:

١- لە بەهدینان: (ت) وەکو (پاشگر) ئیزافە دەکرێ بەسەر بناغەی کار (فعل): مان - دمینت، کۆلان - دکۆلت، کێلان - دکێلت، رویشیان - دروشیێت، هلدان - هلددت.

٢- لە بۆتان: (ە) وەکو پاشگر ئیزافە دەکرێ بەسەر بناغەی کار (فعل): مان - دمینە، کۆلان - دکۆلە، کێلان - دکێلە، رویشیان - درویشە، هلدان - هلددە.

[روونکردنەوە:

وا دەزانم باسەکە لە زاری کرمانجیی سەروودا پتری بەبەرەوە هەیە.

دەمراستی لیژنە]

کاری فەرمان

١- کاری فەرمان لە رووی دارشتنەوە: هەتا ئێستا ئەو کتێبانەی کە بۆ رێزمانی کوردی دانراون باسی کاری ئەمریان لەگەڵ کاتەکانی کاردا باس کردووە لەسەر شێوەی عەرەبی، جا ئێمەش پێش ئەوەی بێینە سەر باسکردنی پێویستە بریارێک بدەین دەربارەی ئەوەی ئایا هەر لەسەر شێوەی کۆن برۆین و لە تەک کاتەکانی تردا باسی بکەین یا لەو کاتانەی جودا بکەینەوە و بەتیا باسی بکەین، یان بیخەینە پاڵ باسێکی تر؟

مامۆستا سەعید سدقی لە لاپەرە (٣٦)ی مختصری صرف و نحوی کوردیدا، لە تەک فیعلدا و لە باسی کاتەکانی کاردا لێی دەدوێت و دەڵێت فعل چوار بەشە:

١- فعل ماضی.

٢- فعلی حال.

٣- فعلی ئیستیقال.

٤- فعلی ئەمر.

وە بەم جۆرەش تەعریفی کاری ئەمر دەکات:

«فعلی ئەمر - فعلێکە طلب کردەوەیی وەیا طلب منع بوون لە کردەوەیێکی پێ بکرێت».

نووری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٣٣)ی قواعدی زمانی کوردی ساڵی ١٩٥٨دا، ئەویش لەتەک زەمانەکانی کاردا باسی دەکات و دەڵێت کاری ئەمر:

«ئەو فرمانەیە کە داوای ڕوودانی کردەوەیێکی پێ ئەکرێ لە دوای ئاخاوتن یەکسەر، وەک:

بنووسە بنووسن

بکرە بکرن

دکتۆر عبدالنعیم محمد حسنین مامۆستای زمانی فارسی لە جامعەی عین شمس لە کتێبی (قواعد اللغة الفارسیة)ی ١٩٧٠، ئەم کارە لەگەڵ زەمانەکانی کاردا باس ناکات (بەتایبەتیی ڕابوردوو) و بەجیا لێی دەدوێت و دەڵێت کاری ئەمر و مضارع - ئیخباری و ئیلزامی - دعاء لە ڕەگی کار (المادة الأصلیة) وەردەگرێت:

کردن کن بکن می کنم

لە زمانی ئینگلیزیدا کارێ ئەمر imperaive mood بە تەنیا و دوا بە دوای کار باسی دەکات.

کوردۆییفیش لە کتێبی [گرامەتیکا زمانێ کوردی بۆنا درسخانێدا (٥ - ٨)] لە لاپەڕە ١٣٥دا لەسەر کاری ئەمر، دەڵێت:

«تەحرێ فەرمانێ (فعل امر). تەحرێ فەرمانێ نیشان دکە فەرمانکرنێ ئەو کفش دکە کو یەک ئەمر دکە سەر ێ دنێ».

مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (٣٨) دەستووری زمانی کوردی بەرگی دووەم دوا بە دوای مضارعی ئینشائی و پێش ڕابردووی ڕووتی ئیخباری دەربارەی ئەمر دەڵێت:

«ئەداتی صیغە ئەخرێتە پێش ڕەگەوە، وە بۆناوە پێونووساوەکان ئەخرێتە دوای ڕەگەوە»، وەک:

بکەوم بکەوین

بکەوە بکەون

بکەوێ بکەون

دوا ئەم نمایشتە لیژنە هاتە سەر دەربڕینی قەناعەتی خۆی لە بارەی ئەو بەشەی ئاخاوتن کە تا ئێستا پێی گوتراوە (فعل امر - فرمانی داخوازی - ئیمپەرەتیف imperative - تەحرێ فەرمانێ، یا هەر زاراوەییێکی تری بۆ بەکار هاتبێت).

١- لە رووی زاراوەوە لیژنە لەو باوەڕەدایە کە سروشتی ئەم ئاخاوتنە لە بنەڕەتدا سروشتێکی ئەمرییە بۆیە وای پەسەند کرد کە زاراوەی (فەرمان)ی بۆ بەکار بێت. دیارە کوردیش لە کۆنەوە وشەی (فەرموون، فەرمان)ی بۆ مەبەستی (ئەمر) داهێناوە. وەک لە موناقەشەی لێرە بە پێشەوە دەردەکەوێت (فەرمان) خۆی یەکێکە لە بەشەکانی (کار) بەو پێیە زاراوەی تەواوی ئەم بەشە دەبێتە (کاری فەرمان).

٢- لە رووی ئیسپاتی (فعلیە)تی ئەم بەشەی ئاخاوتن، لیژنە ئەم راستییانەی تێدا دەست نیشان کرد:

أ- تەسریفی وەک هەموو کارێک بە هەموو کەسەکانیەوە لە هەموو وشەکاندا دیارە.

ب- کات بەشێکی واتای (کاری فەرمان)ە، هەرچەند کاتەکە خۆی لە خۆیدا مەبەستی قسەکەریش نەبێت. سەرەڕای ئەمە شتێکی ئاشکرایە، کە وا کاتەکە بۆ ئێستا و لەمەولایە نەک رابردوو.

جـ- نیشانەی تایبەتیی خۆی هەیە کە لە پێش وشەکەوە دێت، هەروەک کاری مضارع نیشانی تایبەتیی خۆی هەیە.

هـ- ئاشکرا بوونی (فعلیە)تی لەوە زیاتر دیار دەکەوێت کە واتاکەی بەر مفهومی ئینشائی دەکەوێت نەک ئیخباری.

تێبینی:

لەگەڵ ئەمەشدا کە لیژنە زاراوەی (کاری فەرمان)ی هەڵبژارد بۆ ئەم بەشەی

ئاخاوتن، ئاگاداری ئەوەیە کە لە غەیری واتای (فەرمان) واتای تریش رادەگەیەنێت، بەپێی جێگە و دەلالەتی هەڵوەست، یا بە هۆی هێنانە ناوی ئامرازی تایبەتییەوە، وەک:

پاڕانەوە، داخوازی، تکا، تووک لێکردن، دۆعا بۆ کردن، هەتاد... ئەم راستییانەش وەها رادەگەیەنن کەوا (کاری فەرمان) دوو جۆری لە یەکتر جودای هەیە:

جۆری یەکەم - فەرمانی صریح:

کە ئەمە تەنیا لەگەڵ کەسی دووەمدا بەکار دێت و صیغەی تایبەتیی خۆیشی هەیە، وەک:

بکە بکەن

بڕۆ بڕۆن

بژی بژین

بنوو بنوون

لەم صیغەیە راناوی کەسی دووەمی تاک دەرناکەوێت [بەڵام بەلای- نووری عەلی ئەمین-ەوە لە کەسی دووەمی تاکدا ئەو فەرمانانەی کە کۆتاییان بە (ە) دێت - وەک- بنووسە، بکرە، بگرە، بتاشە- بزوێنەکەیان راناوە].

جۆری دووەم - فەرمانی ناصریح:

ئەم صیغەیە بۆ هەموو کەسەکان بەکار دێت، تەنانەت بۆ کەسی دووەمی تاک راناوەکەشی دێتەوە، واتە لەم صیغەیەدا راناوی کەسی دووەمی تاک حەزف ناکرێت، وەک لە صیغەی فەرمانی صریحدا حەزف کرا، بۆ نموونە:

بڕۆیت بڕۆن

بڕۆم بڕۆین

بڕوات بڕۆن

***

ببیستیت ببیستن

ببیستم ببیستین
ببیستێت ببیستن

[ڕوونکردنەوە:
ئەگەر بسەلمێنین بزوێنی کۆتاییی (بکە، بدە...) ڕاناوە دەبێ بڵێین لە وشەکانی (بکەیت، بدەیت..) دوو ڕاناو هەیە...
دەمڕاستی لیژنە]

لیژنە لە دانانی زاراوەی فەرمانی ناصریح بۆ ئەم جۆرە صیغەیە تێبینیی ئەم ڕاستییەی کرد، کە وا بێ گومان فەرمانی صریح لە بنەڕەتدا بۆ مخاطب (کەسی دووەم) دانراوە، هەر هەمان ڕاستیی هۆی ئەمە بوو کە دیتمان بۆ کەسی دووەمی تاک لە صیغەی فەرمانی صریحدا پێویست نەبوو بە ڕاناوی لکاو (مامۆستا مەسعوود ناوی ناوە ڕاناوی چالاک و دکتۆرە نەسرینیش پێی گوتووە ڕاناوی بزێو) کەچی لە ناصریحدا ڕاناوەکەی گەڕایەوە بۆ ناو کارەکە.

ئیستیقرا دەری دەخات کە داڕشتنی صیغەی فەرمانی ناصریح بۆ هەموو کەسەکان (بێ بیژۆک) بریتییە لەوە صیغەی مضارع ئیشارەتەکەی دەگۆڕێت بە ئیشارەتی ئەمرو بەس، وەک:

دەخۆیت بخۆیت
دەخۆن بخۆن
دەخۆم بخۆم
دەخۆین بخۆین
دەخوات بخوات
دەخۆن بخۆن

بە نیسبەت صیغەی فەرمانی صریحەوە دەستوورەکە بۆ کەسی دووەمی کۆ ناگۆڕێت بەڵام بۆ کەسی دووەمی تاک وادەبێت دەستوورەکە بەردەوام دەبێت و واش دەبێت دەگۆڕێت و دەبێتە ریزپەڕ.

دەستووری یەکەم:

ئەو کارە مضارعانەی پێش ڕاناوەکانیان کۆتاییان بە بزوێنی (ۆ، وو، ێ، ە) دێت ڕاناوەکەیان دەقرتێت و دەبنە صیغەی فەرمانی صریح، وەک:

| | |
|---|---|
| دەخۆیت | بخۆ |
| دەنوویت | بنوو |
| دەسووتێیت | بسووتێ |
| دەکەیت | بکە |

[ڕوونکردنەوە:

ئەو کارانەی کە لە مضارعدا پیتی پێش راناویان پیتی (ی)ە وەک: (دەژیم، دەژین)، لە فەرمانی صریحدا دەبێتەوە (بژی). بەلام کاری وەک (دەنووسیت، دەچیت) حەرفەکەی (ی) تێیاندا راناوی کەسی دووەمی تاکە، لە کەسەکانی تردا بزر دەبێت وەک (دەنووسم، دەچم، دەنووسن، دەچن...) لە بۆیە کاری فەرمانی صریحیان دەبێتە (بنووسە، بچوو).

دەمڕاستی لیژنە]

دەستووری دووەم:

لە غەیری ئەم کارانەدا ڕاناوەکە دەقرتێت و بزوێنی (ە) دەخرێتە کۆتایی کارەکەوە، وەک

| | |
|---|---|
| دەکڕیت | بکڕە |
| دەگریت | بگرە |
| دەکێلیت | بکێڵە |
| دەفڕیت | بفڕە |
| دەمریت | بمرە |
| دەخزیت | بخزە |
| دەخەویت | بخەوە |

دەسوتێنیت    بسووتێنە

هەتا ئێستا لیژنە تاقە کارێکی دۆزیوەتەوە کە «بیژۆک» بێت و بەر ئەم دەستوورە نەکەوێت، ئەویش کاری (چوون)، کە بە پێی دەستوور دەبوایە مضارعی (دەچیت) لە فەرمانی صریحدا ببێتە (بچە)، کەچی لە زۆربەی زارەکانی کوردیدا واوی پێش نوونی چاوگ دێتەوە ناو صیغەکەوە و دەگوترێت (بچوو، بچۆ). لە هەندێ لەهجەی کوردیشدا دەگۆڕێت بە (بچە) بە پێی قاعیدەی دووەم:

لەم صیغەی فەرمانی صریحدا لیژنە سەرەنجی بۆ ئەوە ڕۆیی کەوا ڕەنگە لە بنەڕەتدا هەموو یا زۆربەی کارەکان بۆ کەسی دووەمی تاک کۆتاییان بە بزوێنی (ە) هاتبێت، ئەم بزوێنە هەتا ئێستاش لە هەندێ لەهجەدا ناوناو خۆی بە دیار دەخات لەگەڵ لەو کارانەی کە لە لەهجەی تردا دەرناکەوێ، وەک ئەوەی کە دەگوترێت (بنوە) لە جیاتی (بنوو). لە زاری بۆتاندا وەک مامۆستا سادق بەهائەدین دەڵێت (بخوە) دەگوترێت لە جیاتی (بخۆ).

هاتنی حەرفی ئەمر لە سەرەتای فەرمانی کاری سادەدا شتێکی پێویستە، بەڵام کە کارەکە لە سادەیی شۆرا، دەشێت حەرفی ئەمر بمێنێتەوە و دەشێت بشقرتێت، وەک:

| | |
|---|---|
| هەڵبگرە | هەڵگرە |
| تێ بکۆشە | تێ کۆشە |
| هەڵبخەڵەتێم | هەڵخەڵەتێم |
| دابچڵەکێین | داچڵەکێین |
| سەربکەوە | سەرکەوە |

تێبینی:

لەو زارانەی کرمانجیی ژێروودا کە پاشگری «وە» بە پێشگر دێتە ناو کارەوە حەرفی «فەرمان» دەقرتێت، وەک:

وەخۆ

وەدە

لێرەدا ئەم زارانە لەگەڵ زاری کرمانجیی سەروو یەکدی دەگرنەوە. لە زاری

کاری ئاینده

له دوا تەواوبوونی لێکۆڵینەوە لە کاری رابردوو، لیژنە هاتە سەر تۆژینەوەی لە کاری ئاینده (مضارع). بۆ ئەم مەبەستە لیژنە گەڕایەوە بۆ ئەو تەعریفانەی کە لە کتێبە جودا جوداکانی ڕێزماندا باس کراون. دیسان لیژنە بە پێویستی زانی تەعریفێک بێنێتەوە، کە هەم لەگەڵ تەعریفی کاری رابردوودا هاوئاهەنگ بێت، هەم دەرفەتی رەخنە لێگرتنی نەدا:

«کاری ئاینده، ئەو کارەیە کاتەکەی ئێستا یا لە مەودوا دێت».

بەلای لیژنەوە ئەم تەعریفەش وەک هینەکەی پێشوو پڕ بە پێستی مەبەستە.

[روونکردنەوە:
دەتوانرێ، لە ڕێی بەراوردکردن لەگەڵ تەعریفی کاری رابردوودا بگوترێ «کاری ئاینده ئەو کارەیە کاتەکەی بەسەر نەچووبێت».
ئەم گوتەیەی «بەسەر نەچووبێت» ئێستا و دواتریش دەگرێتەوە.
دەمڕاستی لیژنە]

دروستکردنی کاری ئاینده:

لیژنە هاتە سەر جۆری وەرگرتنی کاری ئاینده؛ جارێ لەوە کۆڵییەوە کە ئایا کاری ئاینده لە چاوگ یا لە کاری رابردوو یا رەگی کار وەردەگیرێت. لە دوا موناقەشەیەکی زۆر و ئیستیقرای گەلێک لە کارەکانی زمانی کوردی لیژنە گەیشتە ئەو باوەڕە کە وا دروستکردنی کاری ئاینده لە کوردیدا تابیع بە یەک دەستوور نییە، وە لێکۆڵینەوەی ئەو باسە ڕێگە بۆ تاکەیاک رای دەرناکات. بۆ روونکردنەوە دەڵێین لێرە بە پێشەوە نووسەران گوتوویانە کاری ئاینده دەشێ لە سێ ڕێگەوە وەربگیرێ:

١- ڕێی چاوگ.
٢- ڕێی کاری رابردوو.
٣- ڕێی رەگی کار.

بەلام لیژنە کە هات ئەم قاعیدانەی تەطبیق کرد بەسەر نموونەی کارەکانی

کوردی بۆی دەرکەوت ئەو کارانە هەموویان یەک جۆر نین لەلایەنی چۆنێتیی مانەوەی رەگیان، وەیا نیسبەتی کاری رابردوو لەگەڵ ئایندەدا، هەر تاقمێک لە کاری کوردی مومکینە بۆ خۆیان بکەونە ژێر قاعیدەیەک کە زۆر جودا بێت لە قاعیدەی تاقمێکی تر، دەست نیشانکردنی ئەو جۆرە تاقمانە و تابیع بوونیان بە دەستوورێکی تایبەتیی خۆیان، بەندە بە ئیستیقرای زۆربەی کارەکان لەزمانی کوردیدا، کە ئەمەش تا ئێستا کەس نەیکردووە (باییی ئەوە کە لیژنە ئاگادار بێت) وە کردنیشی کاتێکی درێژتری دەوێت لەو کاتەی کە لیژنە بەدەستییەوە هەیە، لەبەر ئەوە لیژنە هاتە سەر ئەو قەناعەتە کەوا ئیشێک ئێستا لە ئیمکاندا بێت بکرێت لە بارەی دانانی دەستوور بۆ کاری ئایندە لە کوردیدا ئەوەیە کە قاعیدەی بێگومان (مطرد) باس بکرێت و دەستووری بۆ دابنرێت. ئەو دەستوورانەی کە شازیان (ریزپەڕ) تێ دەکەوێت، وەیا دەشێ پێیان بگوترێت (سەماعی) بخرێتە دواتر.

لەو قاعیدانەی کە گومانیان تێدا نییە لە دروستکردنی کاری ئایندەدا ئەمانەن:

١- کاری ئایندە لە کوردیدا عەلامەتی تایبەتیی خۆی هەیە کە ئەویش (دە)یە، کە دەکەوێتە سەرەتای کارەکەوە. لە شێوەی ناوچەی سلێمانیدا ئەم (دە)یە بە (ئە) تلفظ دەکرێت، هەروەها لە ناوچەی ئەردەڵانیش. لیژنە وا بەباش دەزانێت دۆزینەوەی هۆی ئەم گۆڕانە لە (دە)وە بۆ (ئە) بەجێ بهێڵرێت بۆ دراسەیەکی قووڵتر[1].

لە شێوەی کرمانجیی سەروودا ئەم (دە)یە بە (د – di) تلفظ دەکرێت، ئەمانەش نموونەی هەرسێ جۆری عەلامەتەکە:

دەچم ئەڕۆم دکرم

پێویستە لێرەدا دووبارەی بکەینەوە لە شێوەی کرمانجیی سەروودا لە صیغەی داهاتوو (مستقبل) لە جیاتی (د) ئامرازی (دێ) بەکار دێت، وەک:

دێ چم

دێ کرم

---

(١) مامۆستا توفیق وەهبی ئەم لێکۆڵینەوەیەی کردووە لەو گوتارەی کە لە بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕدا بڵاوبووەوە لە ژێر ناونیشانی (ئەسڵی پیتە قاڵبی «ئە»ی شێوەی سلێمانی).

کرمانجیی سەروودا دروستکردنی فەرمان - صریح و ناصریح - وەکو زاری کرمانجیی خواروەوە، بەڵام کە:

(ڤە) وەکو پێشگر بە کارەوە نووسا یاخود پێشگرێک وەک (را، دا، هل، هەڵ، ڕۆ.. هتد) ئەوسا پێشگرەکە، شوێنی (ب) دەگرێت، وەک:

ڤەخارن ڤەخۆ

ڤەروتن ڤەروژە

هەروەها:

ڕادان ڕادە

دادان دادە

هەڵپەڕین هەڵپەڕە

ڕۆکردن ڕۆکە

هەروەها کاری (چوون) لە کرمانجیدا بیژۆکە و فەرمانەکەی ئەمەیە:

هەڕە هەڕن

هەڕێ هەڕنێ

سرنج دەری دەخات کەوا لەگەڵ صیغەی فەرمانی ناصریحدا، ئامرازێک بەکار دێت کە لەگەڵ هی صریحدا بەکار نایەت ئەویش ئامرازی (با)یە، وەک دەگوترێت:

بابڕۆم بابڕۆین

بابڕۆا بابڕۆن

بابڕۆیت بابڕۆن

واش دەبێت ئەم ئامرازە شکڵێکی لێکدراوی دەبێت بۆ صیغەی ناصریح بەکار دێت، وەک:

دەبابڕۆین - دەبابڕۆن... هەتاد.

بەڵام کەرتی یەکەمی ئەم ئامرازە لێکدراوە (دە) هەر لەگەڵ ناصریحدا بەکار نایەت بگرە ئەوسا بۆ صیغەی صریحیش بەکار دێت، وەکو:

دەبڕۆ - دەبڕۆن

لە زاری کرمانجیی سەروودا لە جیاتی (با) ئامرازی (بلا، دا) بەکار دێت، وەک:

بلابچین - بلابچن

دابچین - دابچم

هەروەها لە جیاتی (دەبا) وشەی (دێدا) بەکار دێت، وەک:

دێدا بڕۆین . دێدا بڕۆم

تێبینی:

دەکرێت لە وەرامی فەرماندا کاری مضارغ و کاری رابردوو بەکار بهێنرێت، وەک کە یەکێک بڵێ (بڕۆ، دەبڕۆ) ئەو کەسەی فەرمانەکەی بەسەردا کراوە دەڵێ: وادەڕۆم یاخود وا ڕۆیشتم، ئیتر بێ گومان دەربڕینی مەبەست بە صیغەی ماضی، وەیا مضارع هەرجارە بە پێی جێگا واتای تایبەتیی خۆی دەبێت؛ وا دەبێت لە وەرامدا لە جیاتی «وارۆیشتم» لە هەندێ لەهجە و شوێندا دەگوترێت:

(ئەوا ڕۆیشتم، ئەوە ڕۆیشتم) کە هەموویان بە یەک واتان. لە کرمانجیی سەروودا لە جیاتی (وا، ئەوا، ئەوە) وشەی (ئەڤە) بەکار دێت، وەک:

ئەڤە ئەزێ دێ خۆم

ئەڤە ئەزێ دێ چم

لە کرمانجیی سەرووشدا وا دەبێت وەرامی فەرمان بە صغەی ماضی دەبێت، وەک: (ئەڤە ئەز ژێ گەڕیام) لە وەرامی کەسێکدا کە پێی بڵێیت (وازی لێ بێنە).

بەکارهێنانی کاری فەرمان بەپێی مەبەست

هەرچەند لە بنەڕەتدا ئەم صیغەیە بۆ فەرمانە بەڵام بۆ گەلێ مەبەسیت تریش بەکار دێت، وا دیارە لە (زمان)دا صیغەیەک کە بۆ مەبەستێکی تایبەتیی دادەنرێت بە پێی بەرەوژوور چوون و فرەوانبوونی فیکر و هۆش لە ئەنجامی گۆڕانی کۆمەلایەتیدا ئەم صیغەیە مساحەی فرەوانتری پێ دەگیرێتەوە بۆ دەربڕینی واتای تازە داهاتوو. لەگەڵ ئەمەشدا خزمایەتییەک هەر دەمێنێت لە نێوانی واتای ئەصلی و واتاکانی تازەداهاتوودا.

لەم واتایانەی کە لە ئەنجامی گۆڕانی کۆمەلایەتیدا هاتوونەتە ناو صیغەی فەرمانەوە هەست بەوە دەکرێت کە لە ناو هەموویاندا جۆرێک (داخوازی) هەیە کە هەر خۆی مەبەستە لە فەرمان پێکردن.

بە دوا واتای ئەمردا ئەم واتایەنەش لە صیغەی فەرمان دێنە بەر چاو:

١- پاڕانەوەی، وەک (خوایە لێم خۆش بیت)

٢- دۆعا، وەک (سەرکەوتووبیت)

٣- تووک لێکردن (الدعاء بالشر)، وەک:

مالّت بشێوێت

خانەت وێران بێت

٤- ئیزندان. وەک (برۆ بۆ سینەما، ئەمە پارە و نانی پێ بخۆ)

٥- ئیزن خواستن، وەک (ڕێم دەدەی بڕۆم. ئەرێ فلاّن کەس بنوێ)

نەهی کاری فەرمان:

کاری فەرمان کە ڕواڵەتێکی ئیجابییە ڕواڵەتێکی سەلبیشی هەیە، کە پێی دەڵێین (نەهی). صیغەی نەهی سەرلەبەری وەک صیغەی «فەرمان» وایە لەوە ڕووەوە کە ئەویش نەهی صریح و هی ناصریحی هەیە.

نەهی صریح:

ئەم صیغەیە ئەویش وەک فەرمانی صریح تەنیا بۆ کەسی دووەمە:

١- ئەداتەکەی تایبەتیی کە ئەداتی (مە)یە.

٢- ڕاناوی کەسی دووەمی تێیدا بە دیار ناکەوێت، بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| برۆ | مەڕۆ |
| ببینە | مەبینە |
| بچن | مەچن |

نەهی ناصریح:

لەم صیغەیەدا هەموو کەسەکان تێیدا وەک یەک بەشدارن، ئامرازەکەشی (نە)یە، بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| بڕۆم | نەڕۆم |
| بڕۆین | نەڕۆین |

بڕوات نەڕوات

بڕۆن نەڕۆن

بڕۆیت نەڕۆیت

بڕۆن نەڕۆن

ئەم صیغەی نەهییەش وەک فەرمان بە هەردوو شێوەی صریح و ناصریحیەوە بە پێی جێگە بۆ مەبەستی جوداجودا بەکار دێت بەڵام کە واتای صیغەی ئەمر بۆ دۆعا بوو لە نەهیدا دەبێت بە (تووک لێکردن) بە پێچوانەش، کە ئەمرەکە بۆ (تووک لێکردن) بوو، نەهییەکەی دەبێتە دۆعا بۆ کردن، وەک:

سەرکەوێت سەرنەکەوێت

بمرێت نەمرێت

تێبینی (١):

کاتێک ئامرازی نەفی دێتە پێش کاری ئایندە ئیشارەتی مضارعەت تێ دەچێت، کە ئامرازی نەهیش دێتە سەر «فەرمان» ئیشارەتی ئەمر تێ دەچێت، وەک:

دەڕوا ناڕوا

بڕوا نەڕوا

تێبینی (٢):

بەڵام لە کوردیدا جۆرێک نەفی و نەهی هەیە کەوا زۆر لە واتای nor و neither نزیکە، ئیشارەتەکەی لەگەڵ هی مضارع و ئەمردا کۆ دەبێتەوە و تێیان نابا، بۆ نموونە دەگوترێت:

نە دێ نە دەڕوا (بۆ نەفی)

نە بێت نە بڕوات (بۆ نەهی)

لە شێوەی کرمانجیی سەروودا، نەهی صریح ناصریح ئەشێت بە ئامرازی (مە) و (نە) بێت، وەک:

نەخۆ مەخۆ (بۆ صریح)

نەخۆی مەخۆی (بۆ ناصریح)

بەڵام لە ناوچەی بادینادا تەنیا ئیشارەی (نە) بەکار دێت، وەک:

نەخۆ (بۆ صریح)

نەخۆی (بۆ ناصریح)

لە دوا ئەمــە و لە دوا لێکۆڵینـەوە و وردبوونەوە و لێـدوانێکـی زۆر دوور و درێژ و هەڵسەنگاندنی تـەعریفی «کار»، لەلایەن ئەندامـانی لیژنەوە ئەم تەعریفـەی خوارەوە بۆ «کاری فەرمان» پەسەند کرا:

«کاری فەرمان ئەو کارەیە داوای ڕوودانێک دەکات دوای ئاخاوتن».

لیژنە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە ئەو تەعریفەی پەسەند کرد:

١- کە گوترا (ئەو کارەیە) هەموو تایبەتییەکانی کار وەک کات و صیغە دەگرێتەوە.

٢- وشـەی (داوا) بۆ فەرمـان و دوعا و تووک لێکردن و ئاوات و خواستن و هەمـوو واتاکانی تری فەرمان کە لە پێشەوە لێی دواین دەست دەدات.

٣- وشەی (ڕوودان) کاری تێ نەپەڕ و تێپەڕ و مطاوعە دەگرێتەوە.

٤- دەستـەواژەی (دوای ئـاخـاوتن) جۆرێک لە جـۆرەکـانی ڕابردووی ئینشـائی کە ئەویش ئاواتی تێـدایە لەم تەعـریفـە دەردەهاوێت، صـیـغـەکـەشـی ئەمــەیە (بچوومایە، بمکردایە).

شەشەم - کار لە ڕووی فۆرمەوە:

کار لە ڕووی فۆرمەوە دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١- کاری سادە.

٢- کاری ناسادە.

١- کـاری سـادە: ئەو کـارەیە کـە لە تاکـە یەک وشــە پێک هـاتووە و نـاشـێت کـەرت بکرێت، وەک: خواردی، نوست، پسا...

تێبینی:

أ- کاری سادە لە گەردانی جودا جودادا کە ڕواڵەتی لە سادەوە بۆ ناسادە دەڕوات لە ڕاسـتیـدا هـەر سادە دەمـێنێتـەوە، دیارە هـەموو کـارێک سادە بێت یا نـاسادە شـیـاوی ئەوەی هـەیـە ببێت بە ڕابردوو و ڕانەبردوو و ئـەمـر، لە ڕابوردوودا هـەر جـارەیان بۆ زەمـانێک بەکـار بێت و لە هـەمـوو حـاڵانیـشـدا ڕاناویـان بگۆڕێت؛

تێکڕای ئەم گۆڕانە ڕواڵەتییە چ کارێکی نییە بەسەر سادەیی و ناسادەییەوە.
کار کە بۆ خۆی لە بنەڕەتدا یەک وشە بوو با لە گەردانیشدا زیادەی بێتە سەر هەر بە سادەیی دەمێنێتەوە، بۆ نموونە:

کاری (هات) لە تاکە وشەی (هاتن)ەوە وەرگیراوە، کارێکی سادەیە، لەوەوە «هاتم، نەهاتم، هاتبام، هاتبێتم، دەهاتین» هەموویان سادەن.

ب- لە کوردیدا صیغەیەک هەیە دووبارەکردنەوەی «کار» ڕادەگەیەنێت بێ ئەوەی واتای بگۆڕێت وەک «هات - هاتەوە». ئەم زیادییەی بە دوا کارەکەدا دێت و واتای ناگۆڕێت، نابێتە هۆی ئەوە کارەکە لە سادەیی بشۆڕێت. لە کرمانجیی سەروودا ئەم ئامرازەی کۆتاییی کار لە پێشەوەی کارەوە دێت؛ بەڵام هەمیشە واتای تازە پێک دێنێت نەک دووبارەکردنەوە دەبەخشێت، ئەگەر هات و دووبارەکردنەوە ببەخشێت دەبێت لەوێشدا بکەوێتە دواوە، وەک:

زڤڕی - زڤڕیڤە

٢- کاری ناسادە: ئەو کارەیە کە لە کارێک و زیادییەک پەیدا بووبێت، وەک:

هەڵکەوتن

دەستگرتن

سەربڕین

چاوپۆشین

ئیستقرا دەری دەخات لە کوردیدا کاری ناسادە سێ جۆری هەیە:

یەکەم - ئەو جۆرەیە کە زیادییەکەی وشەیەکی واتادار بێت، وەک:

(سەربڕین، دەستگرتن) لەم کارانەدا کۆبوونەوەی کارەکە و وشە واتادارەکە واتایەکی تازە پێک دێنێت کە هیچ کامیان بە تەنیا نایبەخشن. لیژنە زاراوەی «لێکدراو»ی پەسەند کرد بۆ ئەم کارانە.

دووەم: ئەم جۆرەیە کە زیادییەکەی پێشگر، وەیا پاشگربێت. لەمەدا زیادییەکە واتای سەربەخۆی نییە، بەڵام واتای کارەکە دەگۆڕێت، وەک:

هەڵگرتن، دابەزین، کردنەوە.

لیژنە زاراوەی «داڕژاو = دروستکراو»ی بۆ ئەم کارانە پەسەند کرد.

سێیەم - ئەو جۆرەیە کە زیادییەکەی وشەی واتادار و پێشگر وەیا پاشگر بێت، وەک: دەست لێ هەڵگرتن، پێ لێ هەڵبرین، دەستکردنەوە، سەر هەڵدانەوە.

لیژنە زاراوەی «ئاوێتە»ی بۆ ئەم کارانە پەسەند کرد. لەمەوپێش زاراوی «تێکەڵ» بەکار هاتووە بەڵام «ئاوێتە» وشەیێکی سادە و لەبارترە.

لیژنە لە سەرەتای لێکۆڵینەوەیدا بۆ ئەمە چوو بوو کە کاری ناسادە بکرێت بە دوو بەشەوە:

١- لێکدراو

٢- دارِژاو

بۆ هەریەک لەم بەشانەش تەعریف و نموونەی پێویستی هێنا بووەوە بەڵام دوای چاو پێداخشاندنەوە وتووێژی نێوان ئەندامان دابەشکردنەکەی دواتری (١- لێکدراو ٢- دارِژاو ٣- ئاوێتە)ی پەسەند کرد.

تێبینیی (١)

کاری دارِژاو (دروستکراو) وادەبێت لە تەنیا پێشگرێک و کار، وەیا پاشگرێک و کار، وەیا کار و پێشگرێک زیاتر، وەیا لە کار و پێشگر و پاشگر پێک دێت، نموونە:

هەڵگرتن، دابەزین (کار و پێشگرێک)

گرتنەوە، خواردنەوە (کار و پاشگرێک)

تێ هەڵکێشان، پێ ڕاگەیشتن (کار و دوو پێشگر)

هەڵدانەوە، دادانەوە، (کار و پێشگر و پاشگر)

تێبینی (٢)

هەرچەند پێویستە مەبەست لە پێشگر و پاشگر روون بکرێتەوە، بۆ ئەوە لەم باسەی کاری ناسادەدا خوێنەری ئەم ڕێزمانە سەری لێ نەشێوێت بەڵام پێویستی نەپچڕانەوەی زنجیرەی باسی کار ئەم روونکردنەوەیەی وەخراند بۆ کاتێکی تر.

تێبینیی (٣)

لە گەردانی کاری ناسادەدا ئیشارەی مضارعەت (دە) بەسەر کارەکەوە

دەمێنێتەوە و جێ گۆڕکێ ناکات، نموونە:

هەڵدەستم، تێ هەڵدەچم، دەست بەسەردا دەگرم

بەڵام لە شێوەی کرمانجیی سەروودا لە صیغەی ئایندە (مستقبل) ئیشارەی مضارعەت دەچێتە بەراییی پێشگرەکەوە، وەک:

دێ ڕابم

دێ هەلگرم

تێبینیی (٤)

گەردانی کاری ناسادە کە بکرێتە کاری نادیار (مبنی للمجهول) تەنیا دەخلی بەسەر کارەکەوە هەیە، زیادی و پێشگر و پاشگر لە کارەکەدا، وەک خۆیان دەمێننەوە، نموونە:

کردن، کرا، هەڵکرا، هەڵ دەکرێت، هەڵدەکرێتەوە

گرتن، گیرا، داگیرا، دادەگیرێت، دادەگیرێتەوە

تێبینیی(٥)

بۆ نەفی و نەهی، ئەداتی نەفی بێت یا نەهی بیت دەکەوێتە پێش کارەکەوە، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| هەڵمەگرە | هەڵنەگریت | هەڵناگرن |
| تێ هەڵمەچوو | تێ هەڵنەچیت | تێ هەڵناچین |

لە کرمانجیی سەروودا هەرچەند غالب ئەوەیە کە ئەداتەکان ڕاستەوخۆ بکەونە پێش کارەکەوە، بەڵام دەشێت جێ بگۆڕن و بچنە پێش پێشگرەکانەوە، وەک:

ڕانەبە نەڕابە

ڕانابت ناڕابت

لەبەر ئەوەی کە بەشێ لە کاری ناسادە بە یاریدەی پێشگر و پاشگر پێک دێن، لیژنە وای بە باش زانی لەو پێشگر و پاشگرانە بدوێت کە پێوەندییان بە کارەوە هەیە.

پێشگر و پاشگری کار

پێشگر:

١- هەڵ (هل): هەڵچوون، هەڵبڕین، هەڵدان: ئەم پێشگرە بە گشتی بۆ بزووتنەوەی سەرەوژوور بەکاردێت، بەڵام ناوناوە بۆ مەبەستی تریش بەکار دێت، وەک: هەڵڕشتن، هەڵگلۆفتن.

٢- (دا): دابوون، داگرتن، دابەزین، دادڕین. ئەم پێشگرە بە گشتی بۆ بزووتنەوەی بەرەوخوار بەکار دێت بە پێچەوانەی (هەڵ)، بەڵام واش دەبێت بۆ مەبەستی تر بەکار دێت، وەک: داچڵەکین، داڕزین، دابڕین.

٣- (ڕا): ڕاگرتن، ڕاپەڕین، ڕاخستن، ڕامالّین. ئەم پێشگرە بە گشتی بۆ بزووتنەوەی ئاسۆیی (افقی) بەکار دێت، واش دەبێت بۆ مەبەستی تر دێتە پێش کارەوە، وەک:

ڕاچڵەکین، ڕاهاتن، ڕازاندنەوە.

٤- (تێ): تێکەوتن، تێهاویشتن، تێکردن. ئەم پێشگرە بە گشتی بزووتنەوەی بەرەو ناوەوە پیشان دەدات، واش دەبێت بۆ مەبەستی تر بەکار دێت، وەک:

تێ هەڵسوون، تێپەڕین، تێدان.

٥- (پێ): پێکەنین، پێکردن، پێبوون، پێچوون (خایاندن). ئەم پێشگرە بۆ گەلێ مەبەست بەکار دێت، وەک دیارخستنی هۆی ڕوودان، وەیا گۆڕانی حاڵ (پێگەیشتن).

٦- (لێ - ژێ): لێدان (عود لێدان)، لیهاتن (تا لێهاتن)، لێبوونەوە، لێکردن. ئەم پێشگرە بۆ گەلێ مەبەست بەکار دێت، وەک لە وێنەکاندا دیارە.

٧- (وەر): وەرکەوتن، وەرچەرخان، تێوەردان... ئەم پێشگرە بزووتنەوەیەکی قەوسی دائیریی تێدایە واش دەبێت بۆ واتای تر بەکار دێت، وەک: وەرگرتن.

٨- (ڤە - وە): ئەم پێشگرە لە شێوەی کرمانجیی سەرووودا بە گشتی، وە لە هەندێ شێوەی کرمانجیی خوارووشدا بۆ مەبەستی داهێنانی واتای تازە بەکار دێت، وەک:

کوشتن ڤەکوشتن

خارن      ڤەخارن

لە کرمانجیی خواروودا دەگوترێت «دەرگەکە وەکە» بە واتای بکەوە، هەروەها دەگوترێت (وەخۆ) بە واتای بخۆوە.

لە کرمانجیی سەروودا ئەم پێشگرە لە ڕابوردوو و ئایندە و فەرماندا بەکار دێت، بەڵام لە کرمانجیی خواروودا تەنیا لە رابردوو و فەرماندا دەدیترێت، لە ئایندەدا دەبێتەوە پاشگر وەک هەموو شێوەکانی تری کرمانجیی خواروو، نموونەش:

١

دەرگەکەم   وەکرد

دەرگەکە   وەکە

دەرگەکە   دەکەمەوە

٢

ئاوەکەم   وەخوارد

ئاوەکەی   وەخۆ

ئاوەکەی   دەخۆمەوە

٩- لە کرمانجی سەروودا پێشگری (ڤێ) هەیە، وەک:

ڤێدان، ڤێچوون

لە هەندێ شێوەی کرمانجیی خواروودا (بە تایبەتیی لە نێوان خێڵەکاندا) ئەم «ڤێ»یە دەبێتە «وێ»، وەک:

وێدان      وێکەوتن

١٠- لە کوردیدا هەندێ کار زیادییەکی تێکەڵیان بە پێشدا دێت، وەک: پێککەوتن، لێکبوونەوە، تێکسمڕان. ئەم زیادییانە لە حاڵێکدا واتای کارەکە بگۆڕن، وەیاخود لێی زیاد بکەن بە پێی دەستووری پێشگر دەبێت پێیان بگوترێت پێشگری «داڕژاو».

چەند نموونەیەکی تر لە پێشگری ئاوێتە (داڕژاو):

پێوەدان      تێوەچوون      تێوەگلان (تورط)

١١- له کوردیدا کۆمەڵێک وشه هەن دێنه پێش کارەوه واتای تازه پێک دێنن، وەیا واتای کۆن دەگۆڕن، وەیا لێی زیاد دەکەن، وەک:

(سەرکەوتن، سەردان، بەرکەوتن، ژێرکەوتن، دەرکەوتن، دەرخستن، لادان...).

هەندێ زمانەوانی کورد ئەمانه به پێشگر دادەنێن، واته له مەعنای ئەصڵییان دەردەبەن و وەک پێشگری (هەڵ، دا)یان حیساب دەکەن که واتای خۆیان دۆڕاندبێت. بەلای هەندێ زمانەوانانی تری کوردییەوه ئەم وشانه پێشگر نین و وشەی واتادارن (ناو بن یا ئاوەڵکار بن) بەو پێیه هاتنیان له پێش کارەوه کاری (لێکدراو) پێک دێنن، نەک کاری (داڕژاو).

پاشگر:

لیژنه له تەواوکردنی باسی (پێشگر) هاته سەر دوان له (پاشگر)ی کار. به ئیستیقرا دەردەکەوێت له هەندێ شێوەکانی زمانی کوردیدا پاشگرێکی بێ دەمەتەقه هەیه که ئەویش پاشگری (ەوه) یاخود (وه)یه.

تێبینی:

بەلای د. نەسرین فەخرییەوه ئەم پاشگره تەنیا شێوەی (وه، ڤه)یه نەک (ەوه)یه، به بەڵگەی ئەمه له شێوەی ژووروودا کاتێک دەبێته پێشگر (وه) بەکار دێت، وەک:

ڤەخارن ڤەخارنەڤه

ئەم بزوێنەی (ە) پێوەندییه بۆ لکاندنی پاشگری (وه) به پیته کۆنسۆنانتی پێش خۆیەوه.

بەڵام ڕای مامۆستا مەسعوود ئەوەیه، چ مانعێک نییه لەوەدا بگوترێت پێشگرەکه تێکڕای (ەوه)یه چونکه له هەموو ئەو میسالانەدا که بۆ کار دێنەوه ئەم بزوێنەی پێشەوه (ە) دەدیترێت، تەنانەت وا دەبێت که پیته بزوێن دەبێته کۆتایی کار پیتێکی کۆنسۆنانت دێت و ئەم بزوێنه دەپارێزێت، وەک:

هاتوومەتەوه (که لێرەدا – ت – هات و بزوێنەکەی پاراست)

له گەلێک شێوه ئاخاوتندا دەگوترێ (گەڕایەوه، کوژایەوه...) که لەو شوێنانەدا

پیتێکی (ی) پێوەندیی وەک (نون الوقایة) دێت و بزوێنەکەی سەرەتای (ەوە) دەپارێزێت. نالی دەڵێ:

لاله کە مەجمەرێکە بە با خۆش و گەش دەبێ

ناوی کە پڕ خەڵووزە بە شەبنم کوژایەوە

شاعیرێکی تر دەڵێ:

«شۆڕشی مەجنوون لە ناڵەی کۆهکەن فامایەوە»

بێ گومان لەو شێوانەدا، کە دەبێتە پێشگر ئیمکان نییە بزوێنەکەی پێشەوە (ە) خۆ بە دەربخات، کە ئەمە بەدیهییەکە و کوتانەوەی لزووم نییە.

قسەی مامۆستا مەسعوود محەمەد تەواو بوو.

ئەم پاشگرە لە کوردیدا بۆ گەلێ مەبەست بەکار دێت وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

١- کردن - کردنەوە (فتح).

لێرەدا پاشگرەکە واتایەکی تازەی پێک هێنا.

٢- خواردن - خواردنەوە.

لێرەدا جوداوازیی خستە نێوان مفهومی کۆن و تازە.

٣- ڕازانەوە

حەسانەوە

کڕووزانەوە

پاڕانەوە

لەم نموونانەدا پاشگرەکە دەورێکی بنجیی هەیە لە پێکهێنانی سەرلەبەری واتادا لەو رووەوە کە ئەگەر لاببردرێت واتا نامێنێت.

٤- هاتن - هاتنەوە.

لێرەدا دووبارەکردنەوە ڕادەگەیەنێت، هەرچەندە لە پێشەوە گوترا کە لەم حاڵەدا کارەکە لە سادەیی ناکەوێت بەڵام دیسانەوە ئاشکرایە کە پاشگرێک بە کۆتاییی کارەکەوە هەیە.

تێبینیی (١)

وا دەبێت ئەم پاشگرە دوو واتای سەربەخۆ ڕادەگەیەنێت، وەک (چوونەوە): لەوانەیە بە واتای دووبارەکردنەوە بێت یاخود ڕەوانەوەی ڕەنگ بێت؛ هەروەها: بردنەوە، کردنەوە...

ئەم پاشگرە شێوەی بەکارهێنانی تریشی هەیە کەوا بۆ سەرنجگرتن و لێکدانەوە دەردەکەوێت. لەم ڕووەوە خوێندنەوەی وتارەکەی (د. نەسرین فەخری) لە بەرگی یەکەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد یارمەتیی خوێنەر دەدات.

تێبینیی (٢)

لە کرمانجیی سەرووشدا هاتنی پێشگری (وە) ئەم دەورە دەبینێت کە وەک پاشگر لە کرمانجیی خوارووەدا دەیبینێت تەنیا دووبارەکردنەوە نەبێت، کە لەوێشدا هەر بە پاشگری دەمێنێتەوە.

٥- لەو زیادییانەی کە بە دوا کاردا دێن، زیادیی (اندن)ە. ئەم زیادییە چ پێی بگوترێت (پاشگر) چ پێی بگوترێت (أداة = ئامراز)، وەیا زیادیی تصریفی چەند دەورێک لە کاری کوردیدا دەبینێت. سروشتێکی تایبەتیشی هەیە کە جودای دەکاتەوە لە پاشگری تر ئەویش ئەمەیە کەوا تێکەڵ بە تکوینی کار دەبێت، وە لە تصریفدا (لە ماضییەوە بۆ مضارع) شکلی دەگۆڕێت. لەم نموونانە جۆری کارکردنی (اندن) لە کاری کوردیدا بە دەردەکەوێت:

١- فڕین فڕاندن (هەڵفڕاندن)
کەوتن کەواندن
خەوتن خەواندن

لێرەدا کاری تێ نەپەڕی گۆڕیوە بە تێپەڕ.

٢- پڕمە پڕماندن
زیرە زیراندن
حیلە حیلاندن

لێرەدا «اندن» کاری تێ نەپەڕی دروست کردووە لە دەنگی سروشتی، لە کرمانجیی سەرووەدا ئەم تەرزەکارە لە دەنگدا بە هۆی «اندن»ەوە دروست نابێت.

٣- برژا     برژاندی

سووتا     سووتاندی

پسا     پساندی

ڕژا     ڕژاندی

ئەم کارانە کە کاری (ڕوودان - مطاوعە)ن کۆتاییشیان بە بزوێنی (ا) هاتووە لە حاڵێکدا کە (اندن)یان دەچێتە سەر و دەیان کات بە تێپەڕ، بە ناچاری یەکێک لە دوو (ا)یەکە دەقرتێت.

حەوتەم - ئەو واژانەی کە لە «کار» وەردەگیرێن:

بە پێی ئیستیقرایەک کە لیژنە لە زمانی کوردیدا کردوویەتی ئەو واژانەی کە لە «کار» وەردەگیرێن بۆ دەربڕینی مەبەستی جۆرجۆری ئاخاوتن، ئەمانەن:

١- ناوی کارا (اسم الفاعل)

٢- ناوی بەرکار (اسم المفعول)

٣- ناوی چاوگ (اسم المصدر)

٤- ناوی جێگا (اسم المكان)

٥- ناوی ئامێر (اسم الآلة)

٦- ناوی ناسادە (الاسم المركب)

ئەوا لیژنە یەکە یەکە لێیان دەدوێت:

١- ناوی کارا (اسم الفاعل)

آ- داڕشتنی لە کاری تێ نەپەڕ:

لەم نموونانەی خوارەوە جۆری داڕشتنی ناوی کارا لە کاری تێ نەپەڕ بە دەردەکەوێت:

نووست     نووستوو

مرد     مردوو

رزی     رزیو

خووسا     خووساو

چوو     چوو

وەک دەردەکەوێت دارشتنی «ناوی کارا» لە کاری تێ نەپەڕ بە هۆی هاتنی (و)ەوە دەبێت بۆ کۆتاییی کارەکە، بەڵام بە پێی جێگا وادەبێت واوەکە بە شێوەی بزوێن دێت، وەک (مردوو)، واش دەبێت بە شێوەی کۆنسنانت دێت، وەک (خووساو)، دیارە کە واوەکە بە دوا پیتی کۆنسنانتدا هات و بۆ خۆی دەبێتە بزوێن، بە پێچەوانە کە بە دوا بزوێندا هات دەبێتە کۆنسنانت. هەروەها کە بە دوا (و)دا هات ئیمکان نامێنێ بۆ خۆی تەلەفوز بکرێت لەبەر ئەمە دەنگەکەی دەرناکەوێت وەک «چوو، بوو...». ئەم وشانە لە بەکارهێناندا دەشێ ببنە ئاوەڵناوی کارا (الصفة الفاعلية)، وەک:

پیاوی نووستوو

ترێی ڕزیو

هەروەها ئەم صیغەیە لە پێکهێنانی «ڕابوردووی نزیک = ماضی قریب»یش بەکار دێت، وەک:

من نوستووم

ئێمە دەمێکە وەستاوین

بەڵام لە شێوەی کرمانجیی سەروودا دارشتنی «ناوی کارا» بەم جۆرە دەبێت:

١- ئەگەر کۆتاییی کارەکە پیتی کۆنسنانت بوو، وەک: «هات، مر...» بە هۆی هاتنی «ی» ناوی «کارا» پەیدا دەبێت «هاتی، مری».

٢- ئەگەر کۆتاییی کارەکە بزوێنی «ا، و» بوو، وەک «خویسا، چوو» بە هۆی هاتنی (یی)وە ناوی کارا پەیدا دەبێت «خویسایی، چوویی» بەڵام دەشێت بە دوا «ا»دا هەر یەک «ی» بێت، وەک «خویسای».

٣- کە هات و کۆتاییی (ی) بوو، وەک (ڕزی) بۆ دروستکردنی ناوی کارا نیشانەی (ای) دێت، وەک (ڕزیای). بەڵام دەشێت وشەکە وەک خۆی بمێنێتەوە و بووترێت (ڕزی). لەم حاڵەدا دیارە زیادیی (ی)ەکە، تێ چووە لەبەر (ی) ئەصلی وشەکە.

تێبینی:

لە جغزێکی تەسکدا جۆرێکی تری دارشتنی ناوی کارا لە کاری تێ نەپەڕدا دێتە بەرچاو، لە کتێبەکەی سەعید سدقی لاپەڕە (٢٠)دا دوو نموونە هاتووە (بووە،

چووه) کـه ناوی کـارابن له (چوون و بوون). ئەم دارِشـتنه بزوێنی (ه) دێنێـتـه کۆتاییی کارەکەوه له جیاتی (و). وەک ئەم چەند وشەیه، وشەی «لێکەوته، تێکەوته، هەڵاته، مـرده» ئەویش هەر جـۆرێکه له ناوی (کـارا) کـەوا بـه هـۆی هاتنی بزوێنی (ه)وه بۆ کۆتاییی کار پەیدا بووه.

دارِشتنی ناوی کـارا له کـاری تێ نەپەڕ دەسـتوورەکەی ناگـۆڕێت ئەگـەر هـات و کارەکه (ساده) نەبوو، وەک:

دامردوو

هەڵستاو

دەرپەڕیو

تێ هەڵکشیو

دیاری کـاری تێ نەپـەڕ هـەر بـه شـێوەی دارِژاو (دروستکراو) دەبـێـتـه (ناسـاده)، ئیمکـان نییه وشـەی واتادار لـه پێشـەوه بێت و بیکا بـه لێکدراو؛ لەگەڵ ئـەمـەشـدا تەرکـیـبـێکی وەسـفی هەیه له وشـەی واتادار و کـاری تێ نەپەڕ پێک دێت کـه پێی ناگـوترێت (ناوی کـارا) و واتای ناوی کـارای تێـدا نیـیـه وەک «کـۆسـتکەوتوو، کورِمردوو، سکسووتاو» ئەم وشه لێکدراوانه، ئاوەڵناوی کارای لێکدراون.

[روونکردنەوه:

دەشێ بگوترێ لـه کـاری وەک (سـەرکـەوتن، لاکـەوتن)دا وشـەکـانی (سـەر، لا) له واتای بنجـیی خـۆیانەوه بەرەو (ظریفة) رۆیشـتـوون، کـه مـەعلوومـه (ظرف) واتـای مـادیەتی خـۆی دەدۆڕێنێت، بـۆیه هاتوونه پێش کاری (کەوتن) که کارێکی تێ نەپەڕه.

دەمرِاستی لیژنه]

له کـوردیدا چەند صـیـغـەیەک هەیه وەک (ناوی کـارا) لـه کـاری تێ نـەپەڕ وەردەگیـرێت، بەڵام لایەنی وەسـفـیـەتیـان زیاتر تێدایه، لـەبەر ئەوه دەشـێت پێـیـان بوترێت «ئاوەڵناوی کارا» وەک لەم نموونانه دەردەکەوێت:

ڕووەک، که له ڕوانەوه هاتووه

نووسەک، که له نووسانەوه هاتووه.

ترسنۆک، گرینۆک لە ترسان و گریانەوە هاتوون.

ئەم تەرزە ئاوەڵناوی کارایە لە کوردیدا وادەبێت بە دووبارەکردنەوەی وشە پێک دێت، هەر جارە بە جۆرێ، وەک:

پس پسۆک، کە لە پسانەوە هاتووە.

خول خولۆک (خول خولە)، کە لە خولانەوە هاتووە.

وشەی «خش خشۆک» هەر چەند بووە بە ناوی جێگا (اسم مکان) بەڵام وا پێ دەچێت کە لە بنەڕەتدا هەر لەم بابەتە بووبێت، بەڵام لە بەکارهێناندا گۆڕابێت.

صیغەیەکی تریش هەیە مبالغەی تێدایە، وەک «گەڕۆک، فڕۆک، لەرزۆک» کە ئەمە صیغەی ڕەسەنی مبالغەیە لە کوردیدا لەو ڕووەوە کە بریتییە لە کار و زیادی (الفعل والزیادة). [گەڕ + ۆک +، فڕ + ۆک، لەرز + ۆک]. لە هەندێ میسالی پێشووتردا، وەک (پس پسۆک، گرینۆک) ئەم زیادییەی (ۆک) هەیە، بەڵام یا کارەکە بۆ خۆی دووبارە بووەتەوە یاخود زیادییەکە خۆی پترە لە «ۆک» بۆیە نەمانگوت ئەمانە صیغەی ڕەسەنی مبالغەن.

جگە لەم صیغانە لە کوردیدا صیغەی تریش هەیە کە «ناوی کارا» وە یا «ئاوەڵناوی کارا» دروست دەکەن بە ئیستیقرا دەدۆزرێنەوە. نموونەیەکی ئەم صیغایە وشەی «مردۆخ» کە ئەویش لە وشەی (مردن)ەوە هاتووە. واش هەیە لە (فرێز) صیغەیەکی کارایی وەیا «ئاوەڵناوی کارایی» ساز دەبێت، وەک (چەنگ سۆتەکە) کە لە وشەی (چەنگ + سۆت + ەکە) پێک هاتووە.

ب- داڕشتنی لە کاری تێپەڕ:

١- لە نووسینی نوێی کوردیدا صیغەیەکی داهاتووی «ناوی کارا» لە کاری تێپەڕدا پەیدا بووە، تا ئێستا بۆ کۆمەڵێک وشە بەکار هاتووە، لە پەرەسەندنیشدایە، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| خوێندن | خوێن | خوێنەر |
| نووسین | نووس | نووسەر |
| بینین | بین | بینەر |

کوشتن کوژ کوژەر

٢- لە پەڕاوێزێکی تەسکدا صیغەیەک بۆ ناوی «کارا = فاعل» بەکار دێت، وەک:

دیتن دیت دیتە

خواردن خوارد خواردە

بە جۆرێکی گشتی ئەم صیغەیە لە کاری تێپەڕدا بۆ ناوی «بەرکار = مفعول» بەکار دێت بەڵام لە چەند کارێکدا بە شێوەیەکی ریزپەڕ بووەتە ناوی «کارا = فاعل».

٣- چەند کارێکی تێپەڕ صیغەیێکی ناوی کارایان هەیە کە لە بنجدا ئەم صیغەیە بۆ کاری تێ نەپەڕە:

گرتن (گیران) گیر گیرەک

گەستن گەز گەزەک (لە شێوەی بادینی بەو شتە دەڵێن کە شتی تر دەگەزێت).

٤- لە کوردیدا صیغەیەکی مبالغەی تر هەیە لە کاری تێپەڕ وەردەگیرێت، وەک:

کوشتن کوژ بکوژ

برین بڕ ببڕ

گوتن (دە)لێ بلێ

٥- وا دەبێت لە دووبارەکردنەوەی وشەی کار «ناوی کارا» وەیا «ئاوەڵناوی کارا» پەیدا دەبێت، وەک «خواز خوازۆک» بە کەسێ دەگوترێت کە زۆر شت دەخوازێت. هەروەها وشەی «گەزگەزە» بە گیایەک دەگوترێت ژەهراوییە لەشی گیانلەبەر دەگەزێت، واتا وشەکە لە «گەستن»ەوە هاتووە.

٦- ناوی «کارای ناسادە» هەیە لە کوردیدا کە لە کاری تێپەڕ وەردەگیرێت، چ لە پێشگر و کەرێتکی کار چ لە وشەیەکی واتادار و کەرتێکی کارەکە بێت، بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| هەڵگرتن | هەڵگر | |
| تێکردن | تێکەر | پێشگر و کەرتی کار |
| لێنان | لێنەر | |

| | | |
|---|---|---|
| نانخواردن | نانخۆر | |
| سەرتاشین | سەرتاش | وشەی واتادار و کەرتی کار |
| جلشوشتن | جلشۆر | |

تێبینیی (١)

وشە واتادارەکەی جۆری دووەم جێگەی بەرکار (مفعول)ی گرتووەتەوە.

تێبینیی (٢)

ئەم صیغەیەی ناسادەی ناوی کارا لە کوردیدا بە دوا ئەداتی نەفیشدا دێت و لە تێپەڕ و تێ نەپەڕدا ئاوەڵناوی کارا دروست دەکات، وەک:

نەخۆر، نەمر، نەشۆر، نەبەز، کۆڵ نەدەر، جل نەشۆر، نەهات.

٢- ناوی بەرکار (اسم المفعول):

ناوی بەرکار لە کوردیدا چەند جۆرێک دارشتنی هەیە:

أ- لە کاری کارا نادیار (المبنی للمجهول):

دارشتنی ئەم جۆرە بەرکارە بە زیادکردنی (و) دەبێت لە کۆتاییی کاری کارا نادیاردا، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| کوژران | کوژرا | کوژراو |
| گیران | گیرا | گیراو |
| خوران | خورا | خوراو |

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لە دارشتنی ئەم جۆرەی ناوی «بەرکار» ئەوەیە کە وا هەمان ڕێگەی دارشتنی ناوی کارای (افعال المطاوعة)ی بۆ بەکار دێت، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| پسان | پسا | پساو |
| سووتان | سووتا | سووتاو |

مەبەست لەم تێبینییە ئەوەیە کە وا سەرەڕای (و)ەکە ئەلفێکیش لە کۆتاییی هەردوولایاندا هەیە کەچی تەنیا «و» لەو ناوە کارایانەدا هەیە کە لە کاری تێ نەپەڕی عادەتی (غیر مطاوعة) وەردەگیرێت، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| نووستن | نووست | نووستوو |
| کەوتن | کەوت | کەوتوو |

ئەم صیغەیەی ناوی بەرکاریش وەک صیغەی ناوی کارا بۆ رابردووی نزیک بەکاردێت، وەک:

| | | | |
|---|---|---|---|
| کوژران | کوژرا | کوژراو | کوژراوە |
| خوران | خورا | خوراو | خوراوە |
| گیران | گیرا | گیراو | گیراوە |

بۆ بەراوردی ئەم نموونە لە ڕابوردووی نزیکی کاری مطاوعە دێنینەوە، وەک:

| | | | |
|---|---|---|---|
| سووتان | سووتا | سووتاو | سووتاوە |
| پیشان | پیشا | پیشاو | پیشاوە |
| خلیسکان | خلیسکا | خلیسکاو | خلیسکاوە |

تێبینیی یەکەم:

لە شێوەی کرمانجیی سەروودا چونکە صیغەی (المبنی للمجهول) بە هۆی کاری یاریدەدەری (هاتن)ەوە پەیدا دەبێت، ئەم صیغەیەی ناوی بەرکار، لەوێدا بەم جۆرە نایەت بەرچاو، بۆ ڕابوردووی نزیکیش صیغەی تایبەتیی سەر بەو شێوەیە بەکار دێت، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| هاتنە خارن | هاتنە خارنێ | هاتیە خارنێ |
| هاتنە دیتن | هاتە دیتنێ | هاتیە دیتنێ |

تێبینیی دووەم:

لە هەندێ شێوەی کرمانجیی خوارووداد، وەک (هەولێر، کۆیە، خۆشناوەتی...) لە جیاتی «و»، «ی» بەکار دێت بۆ پێکهێنانی صیغەی ناوی بەرکار و دەگوترێت:

خورای

دیترای

کوژرای

زۆر جارانیش لە بەکارهێناندا «ی» کە دەقرتێت. صیغەی ڕابوردووی نزیکیش لەم شێوەیەدا هەر بە هۆی (ی)کەوە پێک دێت، وەک:

کوژرایه دیترایه خورایه

شایانی باس کردنه، کەوا لە دارشتنی ناوی کاراش هەمان صیغە بەکاردێت و دەگوترێت: نووستی، ڕۆیشتی (لە جیاتی نووستوو، ڕۆیشتوو).

ب- لە کاری کارا دیار (المبنی للمجهول):

١- ئەم جۆرە بەرکارە لە صیغەی ڕابوردووی ڕەبەق (مطلق)ەوە وەردەگیرێت بە زیادکردنی بزوێنی (ە) لە کۆتاییی وشەی کارەکەوە، وەک:

کوشتی کوشت کوشتە

گرتی گرت گرتە

بردی برد بردە

کردی کرد کردە

ئەم صیغەیە بە زۆریی لە کاری تایی و دالی وەردەگیرێت، ناوناوەیەک نەبێت لە کاری یایی و ئەلفی و واوی ئەم صیغەیە نایەتە بەرچاو، بە نموونە:

لە کرمانجیی سەروودا دەڵێن: ئەرزی شێلە. بەو ئەرزە دەڵێن کە وا شێلرابێت بۆ مەرەزە، واتە لە «شێلان»ەوە وەرگیراوە کە کارێکی ئەلفییە.

٢- لە شێوەی کرمانجیی خوارووودا دەگوترێت «قەول و بڕیە» لێرەدا «بڕیە» لە بڕینەوە وەرگیراوە کە ئەویش کارێکی یائییە. بە ئیستیقرای تەواوی زمانەکە لەوانەیە نموونەی تریش لەم بابەتە چنگ بکەوێت.

٣- لە پەڕاوێزێکی تەسکدا صیغەیەکی ناوی بەرکار هەیە بە زیادیی (وو) لە کۆتاییی کاری ڕابردوو پێک دێت، وە لە شێوەی کرمانجیی سەروشدا ئەم واوە دەبێتە (ی)، وەک:

کوشت کوشتوو کوشتی

گرت گرتوو گرتی

لە شێوەی کرمانجیی سەروودا بۆ کاری ئەلفی «ی» ناوبەند دێتە نێوان ئەلفەکە و «ی» ئەداتەکە، وەک:

کێلان کێلای (بە واتای - کێلراو -)

٤- دروستکردنی ناوی بەرکاری لێکدراو. ئەم باسە گیروگرفتێکی زۆری تێدایە و

پێویستی بە ڕوونکردنەوەیەکی درێژەپێدراو هەیە:

آ- چەند نموونەیەک دێنینەوە بۆ سەرنج لێگرتن لە جۆرێک لە جۆرەکانی داڕشتنی ناوی بەرکاری لێکدراو:

گورگ خواردوو

دز بردوو

ئاو خنکاندوو

گوللە کوشتوو

لەم نموونانەدا وشەی یەکەم جێگەی کارا (فاعل)ی گرتووەتەوە، هەر بۆیە مانای وشە لێکدراوەکە دەبێتە بەرکار، چونکە دیارە «کارا» داوای «بەرکار» دەکات. بە پێچەوانە، ئەگەر وشەی پێشەوە جێگەی «بەرکار»ی گرتبووەوە واتای وشە لێکدراوەکە دەبێتە واتای «کارا» چونکە «بەرکار» داوای «کارا» دەکات، بەو پێیە وشەکانی:

گۆشتخواردوو

ماڵبردوو

نێچیرکوشتوو

مەڕخنکاندوو

پەڕۆسووتاندوو

هەموویان ناوی کاران.

پوختەی ئەم دەستوورە ئەمەیە: کە وشەی پێشەوە کارا بوو، تێکڕای وشەکە دەبێتە بەرکار. بە پێچەوانەوە کە وشەی پێشەوە بەکار بوو، تێکڕای وشەکە دەبێتە کارا.

لێرەدا ڕوونکردنەوەیەک دێتە پێش پێوەندیی هەیە لەگەڵ باسی (ناوی کارای لێکدراو)، وەک:

گۆشتخۆر

پیاوکوژ

مەڕخنکێن

بەردشکێن

ئەم نموونانە کە سرنجی لێ بگرین دەبینین واتای سیفەتێکی هەمیشەیی رادەگەیەنن بەڵام کە بڵێین:

گۆشتخواردوو

پیاوکوشتوو

مەڕخنکاندوو

لەم میسالانەدا ئیشارە بۆ رووداوێکی تایبەتییە، واتا هەرچەند هەردوو صیغە بۆ ناوی کارا بەکار دێن بەڵام جیاوازییەکی بنجی هەیە لە نێوانیاندا کە سیفەتی کاتی و هەمیشەییە.

[روونکردنەوە:

ئەم نەختە باسە دەبوو لە کاتی لێکۆڵینەوە لە (ناوی کارا)دا باس بکرێت بەڵام لەبەر ئەوەی کە صیغەکە جارێکیان بۆ کارا و جارێکیان بۆ بەرکار پێک دەهێنرێت، وا بەباش زانرا دوا بخرێت تاکو هەردوو رووی بەسەریەکەوە روون بکرێتەوە.

دەمڕاستی لیژنە]

ب- لە کوردیدا وشەی «بەر» چەند واتایەکی هەیە، وەک:

بەر ثمر

بەر واجهة

بەر رووەو نزمایی

وشەی (بەر) لە وشەی لێکدراودا کە بە واتای (نزمایی) بوو، وشە لێکدراوەکە دەکاتە ناوی بەرکار، بە پێچەوانەی دەستووری گشتی، وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت، وەک:

بەرپرس

بەرخۆر

بەرکوت

بەرکار

لەمەوبەر لە باسی کارای لێکدراودا گوتوبوومان کە ئەگەر کەرتێکی کاری تێپەڕ لەگەڵ ناوێکدا هات وشەلێکدراوەکە دەبێتە ناوی کارا، وەک:

زۆرخۆر

برنجکوت

کەمپرس

بەڵام کە بە دوا وشەی (بەر)دا هاتن، وشە لێکدراوەکە دەبێتە ناوی بەرکار هەروەک لە نموونەکانی سەرووتردا دەرکەوێت.

ئەم دەستوورەی ناوی بەرکار کە بە هۆی وشەی (بەر)ەوە پێک دێت بە زۆری ناوی بەرکار دروست دەکات، بەڵام وشەی (بەرگر) کە دەبوا بە پێی دەستوورەکە ببێتە ناوی بەرکار، کەچی ناوی کارایە. لێرەدا شتێک سەرنج ڕادەکێشێت ئەویش ئەمەیە لە نموونەکانی ناوی بەرکار وشەی (بەر) لەگەڵ کارەکە یەک ئیتیجاهیان هەیە بەڵام لە وشەی بەرگردا، وشەی (بەر) دژی ئیتیجاهی ئەو کارەیە کە بەری لێگیراوە. (بەرهەڵست)یش هەروەهایە.

جـ- ئەم تەرکیبەی ناوی کارای وەک:

گۆشتخۆر

پیاوکوژ

خوێنمژ

کە هات و بزوێنی (ە)ی چووە سەر بە عادەت دەیکات بە ناوێکی قاموسی لە جۆری ناوی گشتی، وەک بڵێین:

مەشکەدڕە (ناوی مێروویەکە)

کەرخنکێنە (ناوی گیایەکە)

کلکتەقێنە (ناوی مەلێکە)

گۆڕهەڵکەنە (ناوی گیانلەبەرێکە)

دۆشاومژە (ناوی ئەنگوستێکە)

بەڵام لە چەند وشەیەکدا ئەم تەرکیبە لە جیاتی ناوی کارا پێک بێنێت، ناوی بەرکار پێک دێنێت، وەک:

مەلاخۆرە

گورگنەخۆرە

دزنەبەرە

ئەم فەقەرەیە سەر بە ناوی کارایە، بەڵام بەهۆی ئەم چەند وشەی بەرکارەوە باسەکەی هاتە ئێرانە. هەروەها وشەیێکی تریش بە نیسبەت ئەم دەستوورەی دروستکردنی ناوی کارا ئەویش وشەی (جوانوومژ)ە، کە دەبوو بە پێی دەستوور تەرکیبێکی ناوی کارا بوایە، کەچی ناوی بەرکارە و بەو ماینە دەڵێن کە (جوانوو) دەیمژێت.

٣- ناوی چاوگ (اسم المصدر):

لە کوردیدا ئەم جۆرە دارشتنە هەرچەند واتای چاوگی تێدایە بەڵام لە چاوگی ئاسایی جودا دەبێتەوە لە چەند روویەکەوە:

١- چاوگی ئاسایی بە تێکرایی کۆتاییان بە نوونی چاوگ دێت و پێوەندییەکی ئاشکراش هەیە لە نێوان ئەو و کار و ناوی بەرکار و کارا، واتە چاوگی ئاسایی دەشێت خۆی پێی بگوترێت (سەرچاوە) بۆ وەرگرتن و دارشتنی کار و ناوی کارا و بەرکار.

٢- چاوگی ئاسایی واتای کردن و رووودانی بە ئاشکرایی تێدایە، هەر خۆی ئەو ترکیبە ئیزافییە دروست دەکات (نانخواردن، کاغەزنووسین، قسەکردن) کەوا مضافەکە لە راستیدا بەرکارە (مفعول) و پێش چاوگەکە کەوتووەتەوە، کە ئەویش دەوری کار دەبینێت. ئەم کردن و روودانە لە ناوی چاوگ بەدی ناکرێت، واتە ناوی چاوگ بەرەو (تەجرید) رۆییوە و هێزی (کردن)ی تێدا نییە. بە نموونە دەڵێین (داربرین) کە تەرکیبێکی ئیزافییە و وشەی (برین) تێیدایە چاوگێکی ئاساییە و واتای روودان و کردنی تێدایە، ناشێت بکرێت بە «داربریار» کە وشەی (بریار) ناوێکی چاوگە و واتای (مطلق) یا (مجرد)ی برینی تێدایە نەک کرداری برین.

٣- ناوی چاوگ لە صیغەیەک زیاتری هەیە، واتە تێکرایان ناکەونە بەر دەستوورێک لە دارشتنیان وەک دەستووری چاوگی ئاسایی؛ صیغەکانی ئەم

ناوی چاوگـه بە ئیـسـتـیـقـرا لە زمـاندا دەدۆزرێتـەوە، هەندێ صـیـغـەی لە بەکارهێناندا پەرە سەندووترە لە هەندێکی تری. لیژنە ئەمانەی خوارەوەی بە لاوە دیارترین صیغەی ناوی چاوگن:

| | | |
|---|---|---|
| کوشتن | کوشت | کوشتار |
| گوتن | گوت | گوتار |
| کردن | کرد | کردار |

لە هەندێ ناوی چاوگ کە بە (ار) پەیدا دەبن رواڵەتێکی «ناوی کارا» دێتە پێش لەو رووەوە کـارەکـە خـۆی پیـتی «ی» تێـدایە، ئیـتـر لەگـەڵ «ار»دا «یار» دەکـەن بە کۆتاییی وشـەکە لەوەوە وشـەکە وەک ناوی کـارا دێتـە بەرچاو، لە راسـتـیـدا ناوی چاوگن، رێکەوت ئەو«ی» خستووەتە پێش «ار»ەکەوە، بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| بڕین | بڕی | بڕیار |
| دزین | دزی | دزیار |
| پرسین | پرسی | پرسیار |
| زانین | زانی | زانیار |

تێبینی:

لەو کارانەی کە کۆتاییان بە پیتی «ی» دێت تەنیا کاری (کڕین) وشەی (کڕیار)ی لێ دەبێتە ناوی کارا نەک ناوی چاوگ. مامۆستا مەسعوود دەڵێت: وا تێ دەگەم ئەم صـیـغـەیەی «کـڕیار» لەوەوە هـاتووە کـە بە دوا وشـەی (فـرۆشـیـار)دا وەک دەنگ و صـەدا، وەیاخـود وێنە و دووبارەبوونەوەی لە ئاوێنەدا خـۆی بە خـزمی دەزانـێت. لە وشەی (فرۆشیـار)دا کە ناوی کارایە سەرلەبەری (یار) بە زیادەوە هاتووە کە خۆی ئەداتی دروستکردنی صیغەیەکی وەسفی کارایە، وەک جووتیار، بەختیار.

دەشتـوانین بڵـێین لە دوو (ی)ی (کـڕین) و (یار) یەکـێکیـان تێ چووە و لە جـێی (کڕیار) ماوەتەوە (کڕیار).

٢- هـەندێ ناوی چاوگ بە زیادکـردنی «ش»یان «شت» لە کـۆتاییی کارەکـەوە پەیدا دەبێت، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| بڕین | بڕ | بڕشت |
| کۆشین | کۆش | کۆششت (کۆشش) |

وەرزین   وەرز   وەرزش (وەرزشت)

زانین   زان   زانشت [توفیق وەهبی]

واش دەبێت پێکهاتنی ئەم صیغەیە لە ڕێیەکی بیژۆکەوە دەبێت، وەک:

ڕۆیین   ڕەوشت

خواردن   خورشت

خوران   خارشت

٣- هەندێ ناوی چاوگ بە هۆی زیادکردنی بزوێنی (ە) پەیدا دەبێت، وەک:

کۆکین   کۆک   کۆکە

دزین   دز   دزە

پرسین   پرس   پرسە

گوتن   گوت   گوتە

وا هەیە ئەم صیغەیە لە هەمان کاتدا بۆ ناوی «چاوک» و ناوی «بەرکار» بەکار دێت، وەک:

ڕست، ڕشتە.

٤- هەندێ ناوی چاوگ صیغەیەکی تایبەتی خۆیان هەیە کە دەشێت ئەوان بنجی دروستکردنی چاوگ بن، وەک لەم لیستەیەی خوارەوە:

خەو   خەوتن

ترس   ترسان

لەرز   لەرزین

پرس   پرسین

گەوز   گەوزین

سووڕ   سووڕان (سووڕانەوە)

٥- صیغەیەکی ناوی چاوگی لێکدراو داڕژاوو هەیە کە واتای تازە پێک دێنێت و کەرتێکی لە کار پێک هاتووە، وەک:

پەلەفڕە   (پەل + ە + فڕ + ە)

بوومەلەرزە   (بووم + ە + لەرزە +ە)

جێگۆڕکە (جێ + گۆڕ + کە)

سەرسووڕکە (سەر + سووڕ + کە)

چاوشارکێ (چاو + شار «شاردنەوە» + کێ)

هەڵپەڕکێ (هەڵ + پەڕ + کێ)

تێبینی:

بە پێی روونکردنەوەی مامۆستا سادق بەهائەدین لە شێوەی کرمانجیی سەروودا، صیغەی دروستکردنی ناوی چاوگ بە هۆی (ش، شت) نییە، بەڵام ئەوانی تر کەم و زۆر پەیدا دەبن.

صیغەیەک هەیە بە زۆریی بۆ «ناوی یاری» بەکار دێت، کۆتاییشی بە (انی) دێت، وا دەبێت لە شێوەی کرمانجیی سەروودا ئەم صیغەیە لە کار وەردەگیرێت، وەک (یاری بڕانی) کە لە کاری (بڕین)ەوە وەرگیراوە، یارییەکەش بە واتای پێشبڕکێ دێت.

لە ڕاستیدا ئەم صیغەیە لە شێوەی کرمانجیی خوارووشدا پەیدا دەبێت، بەڵام نەک بە هۆی بەکارهێنانی کارەوە، وەک:

جگانێ (میچێن)

کەلایانێ (هەڵماتێن)

تۆپانێ (تۆپ تۆپێن)

پەلیکانێ (هەلوکێن)

رگانێ (سنجوقێن)

[روونکردنەوە:

وشەی «چاوشارکێ» کەرتی کاری تێدایە و ناوی یاریشە. وشەی «هەڵپەڕکێ»ش هەر لەم جۆرەیە.

دەمڕاستی لیژنە]

٤- ناوی جێگا (اسم المكان):

صیغەی دەستووری بۆ (ناوی جێگا) لە کوردیدا بە زیادکردنی پاشگری (گە) لە کۆتایی «کار» دروست دەبێت، وەک:

روانین روان روانگه

فڕین فڕ فڕگه

لەوەڕان لەوەڕ لەوەڕگه

بڕین بڕ بڕگه

لێرەدا مەبەست ئەو ناوی جێگایانەیە کە لە کار دروست دەکرێن، دەنا پاشگری «گه» لەگەڵ وشەی تریش ناوی جێگا زۆر دروست دەکات بەڵام لێرەدا مەبەست دەوری «کار»ە لە دروستکردنی ناوی جێگا.

جگە لەم صیغە دەستورییە صیغەی تریش هەن لە هەندێ کار وەردەگیرێن وەک:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ڕژان | دە(ڕێژ)ێ | ڕێژ | ڕێژەن |
| سووتان | دە (سووت)ێ | سووت | سووتەن |
| ڕووتانەوە | دە(ڕووت)ێتەوە | ڕووت | ڕووتەن |

لە شێوەی کرمانجیی سەروودا دەگوترێت:

گەڤسک بە واتای جێگەی (گەوزین) دێت.

زڤرک بە واتای (شوێنی گێژەنی ئاو) دێت.

وا دەبێت ناوی جێگە بۆ خۆی دەبێتە سەرچاوە بۆ چاوگ، وەک:

خلیسک خلیسکان

[ڕوونکردنەوە:

بە دوور نابینم ئەم وشەیەش وەکو وشەکانی (گەڤسک، زڤرک) لە کارەوە بووبێتە ناوی جێگە، نەک بە پێچەوانە.

دەمڕاستی لیژنە]

٥- ناوی ئامێر (آلة):

لێرەدا مەبەست هەر ئەو ناوانەن کە لە «کار» وەرگیراون. بە ئیستیقرا دەردەکەوێت زۆربەی ئەو ناوانە لە کوردیدا وشەی سەربەخۆن، پێوەندییان بەکارەوە نییە، وەک:

«دەرزی، تەشی، خەڕەک، سوژن، چەکوش، چنگاڵ، داس، سەرەند، کەوچک،

مـشـتـه». بەڵام ناوناوەیەک وا دەبێت «ناوی ئامـێـر» لە کـار وەردەگـیـرێت. ئەم دارشتنەش لە صیغەیەکی زیاتر هەیە، وەک:

١- کوتک، کوتەک (لە کوتانەوە هاتووە)

٢- بێژنگ (لە بێژانەوە هاتووە)

٣- پارزۆنگ (لە پارزنینەوە هاتووە)

٤- گـیـرە مـەقـاشـێکی بچـووکـە زەڕەنگەرەکان بەکـاری دێنن بۆ گرتنی زێڕ، لە کاری «گیران»ەوە هاتووە.

هەندێک ناوی ئامێر صیغەی «ناوی کارا»ی لێکدراویان بۆ کار دێت، وەک:

دەستاڕ (دەست هاڕ): لە «هاڕین»ەوە هاتووە.

بەفرماڵ: لە کاری (ماڵین)ەوە هاتووە.

دەستەبەرە: لە کـاری «بردن»ەوە هاتووە. لەگەڵ تێبینیی ئەمە ئەگەر بزوێنەکەی کۆتاییی وشە لاچێت، دەبێتە «دەستەبەر» وە بە مەعنای (ضامن) دێت لە عەرەبیدا.

پانیکێش (پاژنە هەڵکێش): لە کاری «کێشان»ەوە هاتووە.

شەکرشکێن: لە کاری (شکاندن)ەوە هاتووە.

کەوگیر (کەفگیر): لە کاری «گرتن»ەوە هاتووە.

چاپاڵێو: لە کاری «پالاوتن»ەوە هاتووە.

دەستەسڕ: لە کاری «سڕین»ەوە هاتووە.

لە نووسـینی تازەدا نووسـەرانی کـورد وا دەبێت لە خـۆوە ناوی تازە داهـاتوو دادەرێژن بۆ گەلێ مەبەست کە یەکێک لەوانە ناوی «ئامێر»ە، وەک:

بنووس بە واتای قەڵەم (ئامێری پێ نووسین)

بکێش بە واتای تەرازوو (ئامێری کێشان)

لیژنە لێرە بە پێشـەوە ئەم صیغەیەی باس کردووە لە ژێر ناونیشـانی ناوی کارا (صیغەی مبالغە)، لەو باوەڕەشدایە بەکارهێنانی راستەقینە هەر بەو واتایە دەبێت و دەست نادات بکرێت بە ناوی ئامـێـر. بە نموونە: وشـەی (بـنووس) بە واتـای «زۆر نووس» دێت. بـەڵام (پێنووس) دەبـێـتـە ناوی ئامـێـر کـە بمانەوێت لە «نووسین»ەوە وەری بگرین و وشەی «قەڵەم و خامە» بەکار نەهێنین.

٦- ناوی ناساده:

له کوردیدا ناوی کۆمەڵێک شت هەیە کە لە کار و زیادییەک پێک دێت، وەک:

دەستماڵ

لاگیرە

بەرچنە

دەستەسڕ

دەزگرە (دەستگرە)

دەستکێش

پێخەف

رایەخ

رووپۆش

سەرپۆش

هەمان صیغە وا دەبێت بۆ گیانلەبەریش بەکار دێت، وەک:

شیرەخۆرە

دەستگیران

پێڕەوکە

سەپسێنکە (ئەو کەروێشکەیە کە دەگاتە تەمەنێک سەگ نایگاتێ).

لەم نموونانەوە دەردەکەوێت کە وا ئەم تەرزە ناوانەی شت و گیانلەبەر لەگەڵێک صیغەوە وەردەگیرێت، وەک صیغەی ناوی کارای لێکدراو، ئاوەڵکاری کارا و صیغەی تریش.

٧- لە هەندێ رستەی کوردیدا چاوگ نوونی چاوگییەکەی دەقرتێت و چیی دەمێنێتەوە کاری چاوگەکە دەکات لە رستەدا، وەک:

| | | |
|---|---|---|
| کوشتن | کوشت | (پیاو خراپەکەم بە کوشت دا) |
| گرتن | گرت | (دزەکەم بە گرت دا) |
| کردن | کرد | (جلەکەم بەکرد دا) |

ئەم بەکارهێنانە مەنعی بەکارهێنانی چاوگە ئەصلییەکە ناکات، واتە دەگوترێت:

به کوشتنم دا

به گرتنم دا

به کردنم دا

لە زمانی فارسیدا ئەم تەرزە چاوگە کورتکراوەیە پێی دەگوترێت (مصدر مرخم = چاوگی کرتێنراو). واش پێ دەچێت لە کوردیدا تەنیا ئەو چاوگانەی زۆر بەسەر زارەوەن بەم جۆرە بەکار دێن و زیاتریش لە کاری «دان»دا دێنە ناو ڕستەوە، بەڵام چاوگی «کوشتن» لەگەڵ «چوون»یش دەگونجێت و دەگوترێت:

به کوشت چوو

به کوشت چێت (بۆ دوعا لێکردن).

٨- هەندێ صیغەی تر هەیە لە بنجێکی کار و پاشگر پێک دێت و هەرجارە مەبەستێک بە دەستەوە دەدات بە گوێرەی واتای کارەکە، وەک:

بەستەڵەک: لە «بەستن»ەوە هاتووە و ناوێکی دارژاوە (دروستکراو).

خواردەمەنی: لە «خواردن»ەوە هاتووە و ناوێکی گشتیی دروست کردووە، بەڵام لە ناوی گشتیی ئاسایی خۆی بووەتەوە بەوەدا کە صیغەیەکی تایبەتیی لە کارێک پێک هێناوە. ئەم صیغەیە ئێستاکە لەگەڵ غەیری کاریش بە کاردێ، وەک:

شیرەمەنی، ساردەمەنی، چاپەمەنی، مزرەمەنی.

لە راستیدا ئەم دارشتنە تازەیە و صیغەکە لە بنەڕەتدا هەر لەگەڵ کاردا بەکار هاتووە.

دروومان: ئەم صیغەیەش کە لە «دروون» و پاشگری «مان»ەوە هاتووە جۆرێک لە ناوی «مەعنا»ی دروست کردووە. ئەم پاشگرە لەگەڵ غەیری کاریش بەکار دێت و وشەی تازە دروست دەکات، وەک:

ئاسمان، پەشیمان، قارەمان، دارەمان

بە ئیستیقرا لەم جۆرە صیغانە هی تریش دەدۆزرێتەوە بە هۆی پاشگر و کارەوە، وەک:

خۆراک   پۆشاک

ئەم پاشگرە لەگەڵ غەیری کاریش دێت، وەک:

پیت   پیتاک

روون   رووناک

٥

# چاوگ

ساغکردنەوەی ئەو لایەنە ئاخۆ «چاوگ» سەرچاوەی ئیشتیقاقە، وەیاخود چاوگ خۆی لە کارەوە وەرگیراوە؛ باسێکی فراوانە و دەمەتەقێیەکی ورد و قووڵ هەڵدەگرێت. لە زمانی عەرەبیدا بەرەیێکی گەورەی زاناکانی زمان لە کۆنەوە بڕیارێکی گشتییان داوە کە «چاوگ - مصدر» سەرچاوەی کار و ئیشتیقاقە.

لە زمانێکی وەک ئینگلیزیدا Infinitive ڕواڵەتی لەگەڵ ڕواڵەتی Present Case یەک شتە. ڕواڵەتی ڕابردووی زۆر جاران پێوەندی نامێنێ لەگەڵ چاوگ و حازردا، کەچی لە کوردیدا ڕواڵەتی چاوگ لەگەڵ کاری ڕابوردوو لە یەکتر دەکەن. هەرچەند ئێرە جێی درێژە پێدان نییە بەڵام دەبێت ئەوەندە بگوترێت زمانزان مەیدانێکی بەرفراوانی لەبەرە بۆ بڕیاردان لەسەر ئەو رایەی خۆی پەسەندی دەکات. زمانەکەمان هەڵدەگرێت «چاوگ»ی تێدا بکرێت بەسەرچاوە، وەیا کاری ڕابوردوو، ئەو سەرچاوە بێت. لە هەمان کاتدا ڕێگەیەکی سێیەمیش هەیە بۆ دەستنیشانکردنی سەرچاوەی ئیشتیقاق کە ئەویش «ڕەگی کار»ە.

لیژنە موناقەشەی ئەم لایانانەی خستەلاوە و بە گوێرەی پەڕاوێزی دراسەکەی خۆی خەریک بوو لەگەڵ ڕواڵەتی چاوگ و ئەو دەستوورانەی کە پێوەندییان پێوەی هەیە بێ ئەوە هەوڵ بدات ڕەسەنبوونی یەک لەو سەرچاوانە بۆ ئیشتیقاق ساغ بکاتەوە. چاوگ لە ڕووی واتاوە لە خێزانی کارە دەتوانین بڵێین: چاوگ ئەو وشەیەیە کە واتای کاری تێدا بێت بەبێ کات. لە ڕستەدا دەشێت بە شێوەیەک دەرببڕێت کە جێگەی کار بگرێتەوە، لەو ڕووەوە کە ئەویش وەک کار «کارا» و «بەرکار»ی هەبێت. ئەم یەک خێزانییە و پێوەندیی چاوگ و کار وای کردووە چی دەربارەی «کار» گوتراوە لە ڕووی فۆرم و واتاوە، سەرلەبەری بۆ چاوگ بگوترێت، ئەویش وەک «کار» سادە و ناسادە و بە هێز و بێ هێزی هەیە بەڵام دیارە کە کاتی تێدا نەبێت، ڕابردوو و ئێستاکە و ئایندەی نییە.

جۆرەکانی چاوگ:

لە کوردیدا هەموو چاوگێک کۆتاییی بە دەنگی (ن) دێت، کە زاراوەی نوونی چاوکی بۆ بەکارهاتووە لە نێوان زمانزانانی کوردا؛ بەڵام لە پێش نوونی چاوگەوە چەند دەنگێک دێن کە ئەوان جۆری چاوگە کە دەستنیشان دەکەن، ئەمانەش پێنج دەنگن کە هەر جارە یەکێکیان دەکەوێتە پێش نوونی چاوگییەکە:

یەکەم - چاوگی پیتی Consonat: ئەم چاوگە دوو جۆری هەیە:

أ- چاوگی دالی: ئەو چاوگانەن کە پێتی دال تێیاندا دێتە پێش نوونی چاوگەوە، وەک:

کردن

بردن

مردن

خوێندن (خوندن)

خواردن

ناردن

ژماردن

سووتاندن

برژاندن

خنکاندن

لەوەڕاندن

لەم نموونانەدا چەند خاڵێک سەرنج ڕادەکێشێت:

١- جگە لە وشەی (مردن) کە چاوگێکی تێ نەپەڕە، ئەوانی تر هەموویان تێپەڕن، لەوەوە دەردەکەوێت لە بنەڕەتدا ئەم دەنگەی دال بۆ پەیداکردنی واتای تێپەڕاندن هاتووەتە کۆتاییی کارەوە.

٢- ئەو چاوگە تێپەڕانەی کە لە خۆوە بێ «اندن» تێپەڕن، هەموویان لەوەدا یەک

دەگرنەوە کە دەنگی پێش دالەکەیان «ر»ە[1] تەنیا «خوێندن» نەبێت کە لە ڕواڵەتی ئێستایدا«اندن»ی نییە و دەنگی پێش دالەکەشی «ر» و «ن»ە. بەڵام وردبوونەوە لە هەندێ باری ئەم چاوگە وا دەکات مرۆڤ بچێتە سەر ئەو قەناعەتە کەوا ئەویش لە بنەڕەتدا بە هۆی «اندن»ەوە بووەتە تێپەڕ.

جارێ لە پێشەوە بێین و سەیری صیغەی ئایندەی بکەین دەبینین صیغەیەکی «اندن»ی بێ دەمەتەقەیە:

دەسووتێنێ

دەبرژێنێ

دەخوێنێ

لە شێوەی کرمانجیی سەروودا بە زۆری صیغەی ڕابوردووشی «خاندن»ە، هەرچەند «خوێندن» و «خوندن»یشی تێدا بەکار دێت، کە بگەڕێینەوە بۆ زمانی فارسی دەبینین لەوێشدا «خواندن» بەکار دێت. وا پێ دەچێت ئەم وشەیە سوان و گۆڕانێکی بە سەردا هاتووە لە هەندێک لهجەکانی کوردیدا کە وا صیغەی ڕابوردووی لە «اندن» دوور کەتووەتەوە.

٣- لە شێوەی کرمانجیی سەروودا دەنگی «ر»ی پێش دالەکە دەقرتێت و دەگوترێت:

کرن

مرن

برد

ب- چاوگی تائی:

ئەم چاوگانە دەنگی پێش نوونەکەیان دەنگی (ت)ە، وەک:

کەوتن

گرتن

---

(١) لەم بەیتەی حاجی قادردا دەنگی پێش (د)ی چاوگ (ڕ)ی قەڵەوە نەک (ر)ی لاواز:

بێ بستە فەلەک ئاشەکی وای ناوەتەوە

بۆ هاڕدنی ئێمە چ عەجاییب دەگەڕێ

هاتن

بەستن

خەوتن

رشتن

ئەم چاوگانە تێپەڕ و تێ نەپەڕیان هەیە.

تێبینی: لە باسی چاوگی دالیدا گوتمان دەنگی پێش دالەکە «ر»ە، لێرەشدا سەرنج بۆ ئەمە دەڕوا کەوا چاوگی تائی لە وشەی «گرتن»دا، دەنگی «ر» پێش «ت» هاتووە. لیژنە خەریک بوو بۆ دۆزینەوەی چاوگی تر لەم بابەتە هیچی تری نەدۆزیەوە تەنیا نەبێت لە هەندێ شێوەی کرمانجیی سەروودا وشەی «هەناردن» وادەبێت «هەنارتن» دەگوترێت.

[روونکردنەوە:

لە بەشێکی ئەو ناوچە سێ سووچییەی دەکەوێتە نێوان کۆیە و رانیە و مەرگەوە هەموو دەنگەکانی (د) کە لە پێش نوونی چاوگەوە دێن دەکرێن بە (ت) وەک (کرتن، خوارتن، هەنارتن، بوارتن) بەڵام وا دەزانم دالی (مردن) ناگۆڕێت.

دەمڕاستی لیژنە]

دووەم- چاوگی دەنگی بزوێن:

ئەم چاوگە سێ جۆری هەیە:

آ- چاوگی ئەلفی

ئەم چاوگە دەنگی پێش نوونەکەی دەنگی (ا)یە، تێپەڕ و تێ نەپەڕیشی هەیە، وەک:

| | |
|---|---|
| وێنە بۆ تێپەڕ | کێڵان |
| | شێلان |
| | پێوان |

دان

نان

وێنە بۆ تێ نەپەڕ      سووتان

ڕژان

خشان

رووشان

خنکان

لەم نموونانەوە دیارە بەشی تێ نەپەڕی ئەم چاوگە لە رووی هێزەوە لە جۆری روودانن.

لەو نموونە کارانە لیژنە کە لە وتووێژی خۆیدا باسی لێ کردوون و هێناونیە بەر سرنج، تەنیا یەک کاری ئەلفی تێ نەپەڕی دۆزیوەتەوە، کە لە شکڵی بەکارهێنانی ئێستاکەیدا هی روودان نەبێت ئەویش کاری «وەستان»ە. لە بەکارهێنانیدا وادەبێت وەک لازمێکی عادەتی نەک روودان رەفتار دەکات و دەگوترێت: (دەوەستم) نەک (دەوەستێم) کە مەبەست وەستانێکی ئیرادی بێت. دیارە کە مەبەست لە کاری «وەستان»دا روودانی رووت بێت نەک کارێکی ئیرادی ئەوسا بە پێی دەستووری خۆی دەبێتەوە کاری روودان و دەگوترێت (دەوەستێم – دەوەستێین).

[روونکردنەوە:

کاری (نان): لە بەکارهێنانی ئێستاکەیدا وەک کاری (روودان) گەردان دەکرێت و دەگوترێ (دەنێم، دەنێین، دەنێن..) ئەم کارە برادەرێکی تریشی هەیە وەک خۆی تێپەڕە وەک ئەویش گەردانی (روودان) دەکرێت...

کاری (نان) دەقێکی تری هەیە لە هەندێ شێوە ئاخاوتندا ئەویش (نیان)، ئەگەر قبووڵی بکەین بە شێوە رەسەنەکەی ئەوسا گەردانی لە گەردانی کاری (روودانی ئەلفی) دەترازێت چونکە ئەو (ێ)ەی کە لە ڕێژەی ئایندەیدا دێتەوە (دەنێم) هی ئەصلی فعلەکە دەبێت.

کاری (هەڵستان) ئەویش ئەلفییە و کاری روودانیش نییە. دیارە لە

بنەڕەتدا لە (وەستان)ەوە هاتووە.

لە هەندێ شێوەی بەکارهێنانیدا (خشان)یش دەبێتەوە (دەخشم) وەک ئەوەی لە (خشین)ەوە وەرگیرابێت.

کاری (دەڵێم) ئەویش وەک هی رووداں گەردان کراوە هەرچەند چ پێوەندیی بە (گوتم - گوتن)ەوە نەماوە. کە قیاسی لە (نام، دەنێم) بکرێ دەبێ (ڵام، دەڵێم) بووبێت کە لەمەشدا گرفتێکی تر هەیە ئەویش ئەوەیە ناشێ لامی قەڵەو لە پێشەوەی وشەوە بێت.

دەمڕاستی لیژنە]

ب- چاوگی واوی:

ئەم چاوگە دەنگی پێش نوونی چاوگیەکەی دەنگی واوە، واوەکەش واوێکی قووچاوی درێژە، تێپەڕ و تێ نەپەڕیشی هەیە، وەک:

وێنە بۆ تێپەڕ گروون

دروون

سوون

وێنە بۆ تێ نەپەڕ چوون

بوون

ج- چاوگی یائی:

ئەم چاوگە دەنگی پێش نوونی چاوگیەکەی دەنگی «ی»ە. یایەکە یایێکی قووچاوی درێژە، تێپەڕ و تێ نەپەڕیشی هەیە، وەک:

وێنە بۆ تێپەڕ نووسین

کڕین

بڕین

دزین

وێنە بۆ تێ نەپەڕ فڕین

وەڕین

وەڕین

چاوگیش وەک «کار» تێپەڕ و تێ نەپەڕی هەیە:

یەکەم – چاوگی تێ نەپەڕ:

ئەم چاوگە لە دوو سەرچاوەوە دێت:

١– لە وشەیێکی حازر بەدەستەوە، کە ئەغلەب ناوی چاوگە، وەک (ترس، لەرز، خەو...) کە ئەمانە دەبنە (ترسان، لەرزین، خەوتن...). واش دەبێت لە ناوی ئاسایی، وەیا ئاوەڵناو وەردەگیرێت، وەک:

شەل شەلین

ترش ترشان

نەخش نەخشان

٢– لە چاوگی رەسەن: کە پێشەکی نییە و لە خۆوە چاوگە، وەک:

نووستن

ڕۆیشتن

چوون

فڕین

جۆرێک چاوگی تێ نەپەڕ هەیە کە بە هۆی پاشگری «اندن»ەوە پەیدا دەبێت، هەرچەند لە بنەڕەتدا «اندن» بۆ تێپەڕاندن (تعدیە) بەکار دێت. بە گشتیش ئەم چاوگە لە ناوی دەنگەکانەوە پەیدا دەبێت، وەک:

زیرە زیڕاندن

گرمە گرماندن

لوورە لووراندن

قیژە قیژاندن

زریکە زریکاندن

دووەم – چاوگی تێپەڕ:

ئەم چاوگە لە سێ سەرچاوەوە دێت:

١- له وشەیێکی سەربەخۆ دروست دەکرێت، وەک:

پرس پرسین

دز دزین

گەز گەستن

پەست پەستان

کەند هەڵکەندن

لەم جۆرە چاوگانەدا چاوگی واوی پەیدا نابێت.

[ڕوونکردنەوە:

ڕەنگە (فەرمان، دروێنە، درووومان) بشێ پێیان بگوترێ ناوی چاوگ و (فەرموون، دروونەوە، درووون)یان لێ کەوتووەتەوە کە چاوگی واوین.

دەمڕاستی لیژنە]

٢- بە هۆی پاشگری (اندن)ەوە، وەک:

لەرزین لەرزاندن

سووتان سووتاندن

فڕین فڕاندن

وەرین وەراندن

٣- چاوگی ڕەسەن کە هەر لە خۆیەوە چاوگی تێپەڕە، وەک:

خواردن

بەستن

ڕشتن

کوشتن

هاڕین

کێڵان

تێبینی:

بەنیسبەت وشەی (بەستن)ەوە، زاراوەی (بەندوبەست) هەیە لەوەوە امکان هەیە پێی بگوترێت چاوگێکی رەسەن نییە و لە وشەی «بەست»ەوە وەرگیراوە، بەڵام دەبێت بگوترێت کە وا بە تەنیا «بەست» واتای «بەستن» ناگەیەنێت.

سێیەم: جۆرێک چاوگ لە کوردیدا هەیە کە لە بنەڕەتدا سەرچاوەکەی تێپەڕە بەڵام دەبێتە تێ نەپەڕ بە هۆی ئەوەوە کە وا کاراکەی نادیار دەبێت: ئەم چاوگانە دەشێت پێیان بگوترێت «چاوگی کارا نادیار» لەو رووەوە کە کاری لێ وەرگیرا کاراکەی نادیار دەبێت، وەک:

کوژران کوژرا

خوران خورا

گیران گیرا

چوارەم: جۆرێک چاوگ هەیە بێ زیادیی پاشگر یا پێشگر واتا نابەخشێت، وەک:

کولانەوە

چووزانەوە

حەسانەوە

هەڵواسین

دامەزران

دامرکان

لەم نموونانەوە دەردەکەوێت ئەم جۆرە چاوگە، تێپەڕ و تێ نەپەڕی هەیە.

چاوگ لە رووی فۆرمەوە:

لەم رووەوە دەکرێ بە دوو بەشەوە:

١- چاوگی سادە.

٢- چاوگی ناسادە.

د- چاوگی سادە:

ئەو چاوگەیە کە لە وشەیێک پێک هاتووە و چ زیادییەکی وەک پێشگر و پاشگری

تێدا نییە، وەک:

خواردن

نووستن

وەرین

برژان

چوون

چاوگی سادە تێپەڕ و تێ نەپەڕی هەیە، تێپەڕەکە خۆیشی دەبێتەوە بە چاوگی کارا نادیار، هەروەها تێ نەپەڕیش تێ نەپەڕی ئاسایی و تێ نەپەڕی ڕوودانی هەیە. پوختەی قسە ئەوەیە چی لە بارەی کارەوە گوتراوە لێرەدا دەشێت بگوترێتەوە.

٢- چاوگی نادادە:

بە هۆی ئەوەوە چاوگ و کار خزمی یەکترن و لە یەک سەرچاوەوە هەڵدەقوڵن، لیژنە چاوێکی بە باسی کاری ناسادەدا گێڕایەوە بۆ ئەوەی بزانێت کاری ناسادە لەم دراسەیەدا بە چەند بەش دابەش کراوە. لەوەوە دەرکەوت کاری ناسادە سێ جۆرە:

١- کاری داڕژاو (دروستکراو):

کە بریتییە لە کار و پێشگر، وەیا کار و پاشگر بە مەرجێ واتایەکی تازە پێک بهێنێت.

٢- کاری لێکدراو:

کە بریتییە لە پێشگرێکی واتادار و کارێک، وەک: «سەربڕین» لەمەشدا مەرج داهێنانی واتای تازەیە.

٣- کاری ئاوێتە:

ئەو کارەیە کە وا سەرەڕای کار، پێشگر و وشەی واتادار وەیا پاشگر و وشەی واتاداری تێدا بێت.

بەو پێیە چاوگیش دەبێت بەلای کەمەوە سێ جۆری هەبێت، چونکە هەموو کارێک چاوگی خۆی هەیە، کەواتە چاوگی ناسادەش لە سەرەتاوە وەک کار ئەم

سێ جۆرەی خوارەوەی هەیە:

١- چاوگی دارِژاو (دروست کراو):

کە بریتییە لە چاوگ و پێشگر، وەیا چاوگ و پاشگر، وەیا چاوگ و پێشگر و پاشگر، بەمەرجێک واتایێکی تازە دابێنێت، وەک:

| | | | |
|---|---|---|---|
| کردن | هەڵکردن | تێکردن | داکردن |
| چوون | هەڵچوون | تێڕاچوون | تێ هەڵچوونەوە |
| کەوتن | هەڵکەوتن | تێکەوتن | پێکەوتن |
| خواردن | خواردنەوە | (ڤەخارن) | |
| بردن | بردنەوە | تێبردن | |
| بوون | بوونەوە | لێبوونەوە | دابوون |
| کردن | کردنەوە | (ڤەکرن) | |

تێبینی:

هەروەک لە کاتی باسی کاردا روون کرایەوە لێرەشدا دەبێت روون بکرێتەوە کەوا لە زاری کرمانجیی سەروودا پاشگری (ەوە)، کە دەبێتە پێشگری (ڤە) لە زۆربەی شێوەکاندا واتای کارەکە دەگۆڕێت، بەڵام لە شێوەی بۆتانیدا وادەبێت دووبارەکردنەوەش دەگەیەنێت، وەک:

(ڤەگەڕان) بە واتای گەڕانەوە، هەروەها (ڤەمان) بە واتای مانەوە دێت.

٢- چاوگی لێکدراو:

بریتییە لە چاوگ و وشەیێکی واتادار کە لە پێشەوە دێت، وەک:

سەربڕین، دەستکەوتن.

٣- چاوگی ئاوێتە:

ئەو چاوگەیە کە وا سەرەڕای کار وشەی واتادار و پێشگر یا پاشگری تێدا بێت، وەک:

دەست پێکردن

دوورکەوتنەوە

ڕوونکردنەوە

پێ لێ هەڵبڕین

بەربوونەوە

تێبەربوون

لەم چاوگانەدا وشەی واتادار و پێشگر و پاشگرەکە بەیەکەوە لەگەڵ ئەصڵی چاوگ واتایەکی تازە دەبەخشن، کەوا لادانی هەر کەرتێک لە کەرتەکانی چاوگەکە ئەو واتایە ناهێڵێ. لە حاڵێکدا ئەم چاوگانە خرانە تصریفەوە بۆ هەموو کەسەکانی لە هەموو کاتەکاندا تێکڕای کەرتەکانیان دەپارێزرێن و هیچیان لێ ناقرتێت، بۆ نموونە:

دەست پێکردن:

(دەستم پێ کرد دەستی پێ دەکەم دەستم پێ کردبا دەستتان پێ کردبوو.)

هەروەها دەتوانرێت (ەوە)ی دووبارەکردنەوەشی بخرێتە سەر و بگوترێت:

(دەستم پێ کردەوە دەستیان پێ کردباوە دەست پێ مەکەنەوە).

زمانی کوردی ئەو قابلیەتەی هەیە کە «سارستە» یا «رستەی تەواو» یا چەند وشەیەک لە شکڵی چاوگدا تێک ببەستێت، وەک:

دەستبڕین

پیاوکوشتن

ئاوخواردنەوە

بەسەرشاخا هەڵگەڕان

سەرنخون بوون

بەیەکداماڵین

تێک هەڵقژان

ئەم جۆرە چاوگانە کاتێک واتای تازەی پێک هێنا دەشێت بە بەشێکی تازە لە بەشەکانی چاوگ حیساب بکرێن، بەڵام کە واتای تازەیان نەبوو، ئەوسا دەبنە جۆرێک لە تەعبیر کە وا لە تایبەتییەکانی زمانی کوردییە. بۆ ڕوونکردنەوە:

که دەڵێین (پیاو کوشتن) مەبەستمان ئەو واتایەیە کە لە (کوشتنی پیاو) دێتە زیهنەوە، ترکیبێکی ئیزافی ئیعتیادییە. (پیاو کوشتن) ترکیبێکی تایبەتی زمانی کوردییە (لە هەندێ زمانی تریش ئەم تایبەتییە هەیە وەک زمانی ئینگلیزی). ئەو ترکیبە بریتییە لە پێشخستنی مفعول و دواخستنی چاوگ کە فەرمانی کار بەجێ دەهێنێت، بەڵام (سەربڕین) کە بە واتای کوشتنەوەیە ئەم پێشخستن و پاشخستنە هەڵناگرێت... کە گوترا (بڕینی سەر) واتای کوشتنەوە ناگەیەنێت چونکە دەبێتە تەرکیبێکی ئیزافی عادەتی. لەبەر ئەمە تەرکیبی (پیاو کوشتن) نابێتە جۆرێکی تازە لە چاوگ چونکە واتایەکی تازەی دانەهێناوە، بەڵام (سەربڕین) پێی دەگوترێت: «چاوگی لێکدراو» چونکە واتای تازە دەبەخشێت، قیاسی چاوگەکانی تریش لەم دوو نموونەیە دەکرێت.

لە نموونەکانی چاوگی لێکدراوی وەک «نانخواردن، مەلگرتن» دیتمان چاوگ لە کوردیدا ئەو توانایەی هەیە فەرمانی کار ببینێ، لە ڕێی هەمان تواناوە چاوگی کوردیی سادە و داڕژاو و لێکدراو و ئاوێتەی هەموویان بە بەریانەوە هەیە ئامرازی نەفییان بخرێتە پێشەوە وەک دەخرێتە پێش کارەوە، بۆ نموونە:

| | | |
|---|---|---|
| نووستن | نەنووستن | نەنووست |
| گرتن | نەگرتن | نەیگرت |
| هەڵئەنگووتن | هەڵنەئەنگووتن | هەڵنەئەنگووت |
| سەربڕین | سەرنەبڕین | سەری نەبڕی |
| پێ لێ هەڵبڕین | پێ لێ هەڵ نەبڕین | پێی لێ هەڵنەبڕی |

لەو نموونانەوە دەردەکەوێت، کە وا ئامرازی نەفی هەروەک راستەوخۆ دەچێتە پێش کارەوە لە چاوگی مەنفیشدا دەچێتە پێش چاوگەکەوە. بەڵام لە شێوەی کرمانجیی سەروودا ئەداتی نەفی وادەبێت دەچێتە هەرەپێشەوە، چ وشەکە کار بێت چ چاوگ بێت بە خۆی و پێشگریەوە، وەک:

| | |
|---|---|
| رابوون | نەڕابوون |
| هەلگرتن | نەهەلگرتن |
| هەلاڤێتن | نەهەلاڤێتن |

واش دەبێت وەک شێوەی کرمانجیی خواروو ئەداتی نەفییەکە دەچێتە پێش کار و دوای پێشگرەوە، وەک:

رابوون رانەبوون

هەلگرتن هەلنەگرتن

گرێدان گرێ نەدان

هەندێ لەو چاوگانە تەنیا یەک شێوە بەکارهێنانی هەیە لە نەفیدا بە نموونە:

چاوگی «هەلاڤێتن» هەر «نەهەلاڤێتن»ی هەیە، هەروەهاش چاوگی «هەلخستن» هەر «نەهەلخستن»ی هەیە. لەو چاوگانەی پێشگری (ڤە)یان لە پێشەوەیە، ئەداتی نەفی هەمیشە دەکەوێتە هەرەپێشەوە، وەک:

ڤەدان نەڤەدان

ڤەمان نەڤەمان

ڤەبوون نەڤەبوون

ئەم صیغەیەی نەفی کە لێرەدا لە باسی چاوگدا هاتە ناوەوە درێژەی زیاتری هەیە و لەگەڵ غەیری چاوگیشدا بەکار دێت و دەورێکی تایبەتی دەبینێت لە پێکهێنانی واتای (سلبی) لە زمانی کوردیدا لە جێی موناسبی خۆی بە درێژی باس دەکرێت.

٦

# ئاوەڵکار

یەکەم - ئاوەڵکار لە رووی زاراوەوە

ئەو نووسەرە کوردانەی کە خەریکی باسی زمان بوون، لە تێکڕای باسەکانی زمان هەموویان لەسەر یەک رێباز نەڕۆیشتوون، کە یەکێک لەوان باسی ئاوەڵکارە.

ئەو نووسەرانە، سەرەڕای جودایی تصوریان لە بارەی ڕێزمانەوە، لە رووی زاراوەیشەوە، جوداییيان هەیە. لە بارەی ئاوەڵکارەوە، ئەم زاراوانەی خوارەوە دێنە بەرچاو لە نووسینەکانی ئەو نووسەرانەدا:

١- مامۆستا سەعید سدقی - لە کتێبەکەی خۆیدا (صرف و نحوی کوردی) سەرەباسێکی تایبەتی بۆ ئاوەڵکار دانەناوە. بەڵام لە کاتی باسکردنی ناودا لە لاپەڕە (٢٤) زاراوەی (اسمی زمان و اسمی مکان)ی بەکار هێناوە و دەڵێت:

اسم دوو قسمە:

١- اسمی زمان.

٢- اسمی مکان.

اسم زمان - اسمیکە معنای زمانی تێدا بێ، یعنی دلالت لە زمان بکا، وەکو: شەو، ڕۆژ، پیری مانگ، پار...

اسم مکان - اسمیکە دلالت لە مکان بکا، وەکو: سەر، ژێر، پێش، پشت، دوور ئێرە، ئەوێ، لا، ناو.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی - لە دەستووری زمانی کوردیی لاپەڕە (١٧)دا، دەڵێ: زەرف کلمەیەکە بۆ تەواوکردنی مەعنای کارێ یا سیفەتێ یان زەرفێکی تر بە کەڵک ئەهێنرێت. سیفەتێ چۆن مەعنای ناوێ تەواو ئەکا، ئەمیش مەعنای سیفەت و فیعل و زەرف تەواو ئەکا، وەک:

ئەو زۆر ئەدوێ. (زۆر زەرفە کاری «ئەدوێ» تەواو دەکات).

بەفرێکی زۆر ئەستوور باری (زۆر زەرفە ئاوەڵناوی «ئەستوور» تەواو دەکات).

ئەو زۆر خێرا رۆیی (زۆر زەرفە زەرفی «خێرا» تەواو دەکات).

٣- مامۆستا کوردوییڤ لە کتێبی زمانی کوردی ساڵی ١٩٧٠ لاپەڕە (١١٣) لە ژێر ناوی «فێلنیش» ئەڵێ: بەو وشانە دەڵێن (فێلنیش - ظرف - ئاوەڵکار) کە حاڵ و حەواڵ و قەید و تەحریکردن و بوون نیشان دەدەن.

(فێلنیش)یش بە سێ بەش دابەش دەکات:

١- هی وەختی کردن و بوون.

٢- هی جێگەی کردن و بوون.

٣- هی تەحر (جۆر)ی کردن و بوون.

٤- مەردۆخ لە فەرهەنگەکەیدا لە دوو جێگە لەو وشانە دواوە کە دەبنە (ظرف)، جارێکیان لە لاپەڕە (١٨) فەرهەنگی مەردوخدا «اسم زمان و اسم مکان» ناو دێنێت و جارێکی تر لەلاپەڕە (٢١) «ظرفی زمان و ظرفی مکان» ناو دەبات:

لە ئاست اسم زماندا دەڵێ:

(ناو بۆ ناسینی وەخت و ڕۆژگار دانریاگە، اوە پی ایژن - ناوسا - وەک: امرۆژ، سۆزی، مانگ، ساڵ، شەو...)

لە ئاست اسم مکاندا دەڵێ:

(یا بۆ ناسینی جێگە دانریاگە. اوە پی ایژن - ناوجێگە - وەک: المان، تاران، کوردستان...)

لە ئاست (ظرف مکان) دەڵێ بە میسال (لە مدرسەدا اخوێنم).

لە ئاست (ظرف زمان) دەڵێ بە میسال (لە پیرەکەوە هاتگم).

٥- رشید کورد لە کتێبی (ڕێزمانا زمانێ کرمانجی) لاپەڕە (١٠٦)دا دەڵێت: «نیر»م لە بری «ظرف» بەکارهێناوە، چونکە کرمانج دبێژن (ئیرۆ نیرەکێ تەنگە) واتە زەرفێکی تەنگە، لەبەر ئەمە (نیر) بە تەواویی مەعنای (ظرف) دەکات.

(نیر)یش دەکا بە شەش بەشەوە:

آ- نیرێ راستەدەر: وەکو (باش) لە رستەی (ئەز باشم).

ب- نیریێ تباب: وەکو (پڕ) لە رستەی (پەزێ مەمۆ پڕە).

جـ- نیریێ چاخ: وەکو (ئیرۆ) لە رستەی (ئەز ئیرۆ هاتم).

د- نیریێ لووس: وەکو (هوندور) لە رستەی (ئەز لە هوندور بووم).

هـ- نیریێ هەبوون، نەبوون، گومان:

نیریێ هەبوون: وەک وشەی (ئەرێ) لە رستەی (ئەرێ مەمۆ ئیرۆ دچە؟).

نیریێ نەبوونێ: وەک وشەی (ما) لە رستەی (ما مەمۆ ئیرۆ دچە؟).

نیریێ گومان: وەک وشەی (بەلکی) لە رستەی (بەلکی ئیرۆ بچم).

و- نیریێ پرسیار: وەک دوو وشەی (ما، کینگا) لە رستەی (ما تو کینگا دچی؟).

٦- جگەرخوێن لە کتێبەکەیدا (دەستوور و ئاوای زمانی کوردی) چاپی بەغدا، ١٩٦٠ بۆ (ظرف زمان - ظرف مكان) دوو زاراوەی (دەمناف - جێناف)ی بەکار هێناوە، وەک:

آ- بۆ دەمناف. ئیرو، پێر، نها، نووکە.

ب- بۆ جێناف. وار، ئەشکەفت، مزگەفت.

هەروەها جێناڤیشی کردووە بە دوو بەشەوە:

١- جێناڤی خوە سەر: خان، سەرا.

٢- جێناڤی پێکهاتی: کوردستان، خوندەگە، بارخانە، چایدان.

٧- نووری عەلی ئەمین لە کتێبەکەیدا ڕێزمانی کوردی، لاپەڕە ١٨٦، دەڵێت: ئاوەڵکار ئەو واژەیە یا ئەو دەستەواژەیە یا ئەو پارچە شوێن کەوتووەیە (کلۆز) کە وەسفی بەشێ لە بەشەکانی ئاخاوتن دەکات، جگە لە ناو و لە ڕاناو، وەک:

بەرخەکە باش ئەلەوەڕێ: باش (وشە).

چۆلەکەکە لەسەر دارەکە فڕی: لەسەر دارەکە (فرێز).

کە مالۆسەکەم کوشت، یەکانەکە لە ناو زەلکاوەکەدا بوو (کلۆز).

ئاوەڵکاریش دەکات بەشەش بەشەوە:

١- ئاوەڵکاری تافی، وەک (هەینی، ئێستا، بەیانی، پێرار).

٢- ئاوەڵکاری شوێنی، وەک (سەر، خوار، لا، کن...).

٣- ئاوەڵکاری چەندی، وەک: (گەلێ، هەندێ، تۆزێ).

٤- ئاوەڵکاری ئاوەڵناوی، وەک (باش، بەگەرمی، بە کوڵ، بەدڵشکاوی)

٥- ئاوەڵکاری نەفی، وەک (نە، نا، مە، نی...).

٦- ئاوەڵکاری وەرامی، وەک (بەڵێ، ئا، ئەرێ، نەخێر..).

تێبینی:

نووسەرانی تری کورد هەن لە ئاوەڵکار دواون بەڵام بەرهەمەکانیان لەبەر دەستی لیژنەدا نین بۆیە لێیان نەدوا.

لە کتێبی «دستور پارسی» دانانی (ر. ذوالنور) بۆ ئاوەڵکار زاراوەی (قید)ی بەکار هێناوە. لە شرحدا بە درێژی باسی جۆرەکانی (قید) و ئەو فەرمانەی قید بەجێی دەهێنێت و هەموو سەروبەرێکی باسی ئاوەڵکاری کردووە، ئەوەی سەرنج رادەکێشێت لە باسی (قید)دا سەرەڕای دابەشکردنی بە چەند بەشێکەوە دوو تێبینیی گرنگن:

١- کە دەڵێ (قید) هەرچەند وەسفی کار دەکات بەڵام چونکە کار لە (کارا)وە دەردەچێت لە هەمان کاتدا وەسفێکی کارا و بەرکاریش دەکات (کە کارەکە تێپەڕبێت).

٢- نیمچە رستە (فرێز)ی بە (قید) دانەناوە هەر هێندەی کردووە، قیدی لە رووی فۆرمەوە بە سادە و لێکدراو داناوە، وەک:

آهستە، دیر، زور، تند - بۆ سادە.

ئمشب، شامگاە، عاقلانە، پارسال - بۆ لێکدراو.

تێکڕای قەدیشی داناوە بە (١٨) بەش.

هەرچەند لە پێشەوە کە قید دابەش دەکات لە رووی فۆرمەوە بۆ سادە و بۆ لێکدراو باسی (نیمچە رستە = فرێز) ناکات وەک قید، بەڵام لە میسال هێنانەوەی دابەشکردنی قید بۆ (١٨) بەش ناوناوە نموونەی نیمچە رستەی هێناوەتەوە، وەک (- برای خدا، بە هیچوجە، حاشاوللا...). لە زمانی ئینگلیزیدا زاراوەی (Adverb) بۆ (ئاوەڵکار) بەکار دێت ئەمەش تەعریفەکەیەتی بە ئینگلیزی:

An adverb is a word which modifies meaning of a verb, an adjective or another adverb.

له نمایشتی وشەی (ئاوەڵکار) لە رووی زاراوەوە کە لەمەوبەر باس کرا دەردەکەوێت بەشێکی زۆری ئەو وشانەی لەو تەعریفانەدا بە (ئاوەڵکار) داندراون، پێوەندییان لەگەڵ کاردا نییە و ناشێت بە ئاوەڵکاری حیساب بکرێن، کە هات و بە ئاوەڵکاری حیساب کران یا دەبێت زاراوەیەکی تر بدۆزرێتەوە ئەوانیش بگرێتەوە یاخود کە ئەوە نەکرا زاراوەی (ئاوەڵکار) لە ئاست مەبەستدا کورت دێنێت چونکە دیارە واتەکەی ناتوانێت باوەش بەو وشانەشدا بگرێت کە پێوەندییان بەکارەوە نییە.

لە ئیستیقرای زمانی کوردی و بەراوردکردنی لەگەڵ ڕێزمانی زمانانی تر کە یەک دوویەکمان لە نمایشتەکەدا بە نموونە هێنایەوە وەک ئینگلیزی و فارسی دەردەکەوێت زاراوەی «ئاوەڵکار» بەبەریەوە هەیە پەراوێزی فراوان وەیا تەسک بکرێتەوە. ئەو ڕێزمانەی کە وشەی (نە) دادەنێت بە (ئاوەڵکار) وەک وشەیێکی کە بە صراحت وەسفی (کار) دەکات، پەراوێزی ئاوەڵکاری بۆ گەلێک بابەتە وشە پەل کردووەتەوە کە ئەگەر واتای ئاوەڵکاری بەسەردا تطبیق بکرێت لە زۆر جێگە ئەو واتایە ناتوانێت ببێتە سەرپۆشی ئەو وشانە.

لیژنە لەم سەرنج گرتنانەوە بۆ ئەم باوەڕە ڕۆیشت کەوا پێویستە لە پێشەوە باسی ئەو وشانە بکات کە هیچ گومان نییە لەوەدا بەر واتای پاتەوپاتی زاراوەی ئاوەڵکار دەکەون. لەوە بەولاوە خەریکی پشکنینەوەی ئەو وشانە بێت کە لەوانەن لە روویەکەوە ئاوەڵکار و لە روویێکی ترەوە ئەو نەبن.

لیژنە لە دوا ئەمە هاتە سەر لێکۆڵینەوە لەو بەشانەی ئاخاوتن کە پێوەندییان بەکارەوە هەیە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا لیژنە هەم لە ئیستیقرای زمانی کوردی و هەم لە دراساتی زمانەکانی بێگانە سوودی وەرگرت و سەرنجی گرتە ئەو کۆمەڵە وشانە کە لە ڕێزمانی جۆرجۆر بە ئاوەڵکار حیساب کراوە، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و سرنج گرتن بۆ لیژنە ساغ بووەوە، کە ئەمانەی خوارەوە ئاوەڵکاری بێ دەمەتەقەن:

١- بارام ژیرانە هاتە ژوورەوە. لەم رستەیەدا لیژنە وشەی (ژیرانە) بە ئاوەڵکاری چۆنیەتی (حاڵ) دادەنێت.

٢- بارام بە ژیریی هاتە ژوورەوە. ئەم تەرکیبەی (بەژیری) ئەویش وەک وشەی

(ژیرانه) ئاوەڵکارێکی چۆنیەتییه.

٣- بارام بانەوبان هات - شاخەوشاخ رۆیشت.

ئەم (بانەوبان و شاخەوشاخ)ەش روویێکی چۆنیەتیی هاتن و رۆیشتنەکە نیشان دەدات.

٤- بارام لەسەرلا - دەمەورِوو - کەوت.

ئەم (لەسەرلا و دەمەورِوو)ەش روویێکی تری چۆنیەتیی کەوتنەکە نیشان دەدات کە بە (هاتن)ەکەی رستەکەی تری بگریت.

لەم نموونانەوە دەردەکەوێت لە کوردیدا کۆمەڵێک وشە و فریز هەن چۆنیەتیی کار رادەگەیێنن. بەپێی ئەو دەورەی کە دەیبینن لە ئاخاوتندا دەبێت زاراوەی بۆ دابنرێت، لیژنە (زاراوەی ئاوەڵکاری چۆنیەتی)ی بۆ دانا.

***

دوێنێ هاتم.

سبەی دەرِۆم.

تازە باران باری.

«دەمێکە وا لەسەر پێیەک دەسووتێم».

پارناپێرار بەفرێکی ئەستوور باری.

چەند رِۆژێکی تر دەرِۆم.

لەم میسالانەدا دەردەکەوێت ئەو وشە سادە و لێکدراو و فریزانە (دوێنێ، سبەی، تازە، دەمێکە، پارناپێرار، چەند رِۆژێکی تر) کە واتای (کات) رادەگەیەنن و کاتی روودانی کارەکە دیار دەخەن، بەمەدا دەبنە (ئاوەڵکار) و بە پێی ئەو دەورەی دەیبنن پێیان دەگوترێت «ئاوەڵکاری کات».

تێبینی:

وشەی وەک (دوێنێ، سبەی، تازە، رۆژ، شەو، ساڵ...) کاتێک دەبن بە ئاوەڵکاری کات کە کاتی روودانی کارەکە نیشان بدەن، دەنا لە بنەرِەتدا ناوی کاتن.

***

١

چۆلەکەکەم لەسەر دارەکە دی

چۆلەکەکەم لە ژێر دارەکە دی

چۆلەکەکەم لەکن دارەکە دی

چۆلەکەکەم لەلای دارەکە دی

چۆلەکەکەم لە تەنیشت دارەکە دی

چۆلەکەکەم لەبن دارەکە دی

٢

وەرە سەرێ

وەرە دەرێ

وەرە خوارێ

وەرە ژوورێ

وەرەماڵێ

وەرە ناوێ

٣

منداڵەکە لەسەرەوە دانیشتبوو.

منداڵەکە لە خوارەوە دانیشتبوو.

منداڵەکە لە سەرووی منەوە تێ پەڕی.

منداڵەکە لە تەنیشت منەوە تێ پەڕی.

ئەم نموونانە و هەر نموونەیەکی تری وەک ئەوان بێت کە جێگەی ڕوودانی کار دیار بخات، هەموویان دەبنە (ئاوەڵکاری شوێن).

تێبینی ١:

وشەی وەک (سەر، خوار، تەنیشت، کن، پێش، پاش، ژێر، ناو، لا، دەر، ماڵ، ژوور...) کاتێک دەبن بە (ئاوەڵکاری شوێن) کە جێگەی ڕوودانی کارەکە نیشان بدەن، دەنا وشەکان بۆ خۆیان لە بنەڕەتدا ناوی شوێنن.

تێبینی ٢:

له شێوەی کرمانجیی سەروودا هەمان جۆری بەکارهێنانی ئاوەڵکاری کات و شوێن باوە بەڵام لەجیاتی (لە، بە) وشەکانی (ژ، د، ب، ل) بەکار دێن و لەجیاتی (ەوە) «ڤە» بەکار دێت، وەک لەو نموونانەدا بەدەر دەکەوێت:

١- منداڵ دناڤ مەڕا چوو ماڵ.

٢- منداڵ ژخارێ چوو سلاڵ.

٣- منداڵ ل خارێ روونیشتییە.

***

بارام خێرا ڕۆیشت.

بارام زۆر دەڵێ (کەم، فرە، گەلێک، نەختێ...).

بارام زوو هات (درەنگ..).

بارام جوان دەڕوات.

ئەم وشانەی (خێرا، زۆر، زوو، جوان) کەوا لە بنەڕەتدا ئاوەڵناون و هەندێکیان (چۆن) و هەندێکیان (چەند) رادەگەیەنن، لەم رستانەدا باری کارەکە و چۆنیەتی نیشان دەدات بەو پێیە، هەرچەند بە ئەصلیش ئاوەڵناوبن، توانای ئەوەیان هەیە ببن بە ئاوەڵکاری وەصفی.

سەرنج دەری دەخات رستەکان هەڵدەگرن بە جۆرێکی ئەوتۆ بەکار بێن، کە سروشتی ئەو وشانە دیار بخات کە سروشتێکی وەصفییە وەک بگوترێت:

بارام گوتنێکی زۆر دەڵێ.

بارام رۆیشتنێکی خێرا رۆیشت.

بارام لە کاتێکی زوودا هات.. هەتاد.. واتە: دەشێت بگوترێت لەو رستانەدا مەوصوفێکی قرتاو هەیە و بەمەدا سروشتی بنجیی وشەکان بپارێزرێن بەڵام فراژووبوونی زمان و بەرەوپێشچوونی ئەو توانایەی داوە بە ئاخاوتنی کوردی کە وشەکان بە ئاوەڵکار بەکار بێن.

[روونکردنەوە:

رەنگە وا باش بێ بەو جۆرە ئاوەڵکارە بگوترێ (ئاوەڵکاری ئاوەڵناوی

وەیا تەئویلکراو وەیا خوازەک - بە واتای خوازرایەوە-) وەیا هەر تەعبیرێکی بۆ روونکردنەوەی بنەمای ئاوەڵکارەکە دەست بدات.

ذەمڕاستی لیژنە]

***

منداڵەکان دوو دوو هاتن.

کەوەکان پۆل پۆل فڕین.

جارجار (جاروبار، ناوەناوە) سەرتان لێ دەدەم.

دەم بە دەم زیاتر دەشێوا.

باران تاوتاو دەبارێ.

ساڵ ناساڵ (ساڵە نەساڵێک) زەوییەکەم دەکێڵم.

ئاوەکە قوم قوم بخۆوە.

کەم کەمە بەفرەکە ئەستوور دەبێت.

لەم نموونانەدا وشەکانی (دوو، دوو، پۆل پۆل، جار جار، دەم بەدەم، تاوتاو، ساڵ ناساڵ، قوم قوم، کەم کەمە...) لە رستەدا بە دوایەکتردا هاتن (تتابع)ی کارەکە نیشان دەدەن لەبەر ئەمە پێیان دەگوترێت (ئاوەڵکاری تەرتیبی).

***

کەوەکە دیسان بە داوەوە بوو.

کەوەکە دووبارە بە داوەوە بوو.

هەرجارە بێم دیارییەکتان بۆ دەهێنم. (هەرجارێ، هەرجارەکی)

ئەوەندەی پێم گوتی نەتبیست.

چەندی پێم گوتی نەتبیست.

لەم نموونانەدا وشەکانی (دیسان، دووبارە، هەرجارە، ئەوەندەی، چەندی) لە رستەدا دووبارەبوونەوەی کارەکە ڕادەگەیەنن، لەبەر ئەوە پێی دەگوترێت (ئاوەڵکاری دووبارەکردنەوە = تەکراری).

***

تێر تێر لە ئاوەکەم خواردەوە.

پڕ بەدڵ خۆشم دەوێیت.

جوان جوان زەوییەکەی بۆ خۆی داگیر کرد.

هەڵبەت بێ تۆ سەفەر ناکەن.

بێ گومان چاوم پێی دەکەوێت.

ئاگریش ببارێت هەردەچم.

کاکە، بێ چەند و چوون پارەکەت لێ دەستێنم.

لەم نموونانەدا وشەکانی (تێر تێر، پڕ بەدڵ، جوان جوان، هەڵبەت، بێ گومان، بێ چەند و چوون...) لە ڕستەدا بۆ تەئکیدی کارەکە بەکار دەهێنرێن، لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێت (ئاوەڵکاری تەئکیدی).

***

هەرگیز دەست لە وڵاتم هەڵناگرم.

هەرگیزاو هەرگیز فەرامۆشت ناکەم.

بە هیچ کلۆجێ لێم نابێتەوە.

بە هیچ ڕەنگێ چارەم نەکرد.

لەم نموونانەدا وشەکانی (هەرگیز، هەرگیزاو هەرگیز، بە هیچ کلۆجێ، بە هیچ ڕەنگێ...) لە ڕستەدا بۆ نەفی کارەکە بەکار دەهێنرێن، لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێت (ئاوەڵکاری نەفی).

***

کەی هاتیت؟ دوێنێ هاتم.

چۆن هاتیت؟ بە سواری هاتم.

لە کوێ دابەزیت؟ لە ئوتێل دابەزیم.

باران چەند باری؟ باران زۆر باری.

لەم نموونانەدا وشەکانی (کەی، چۆن، کوێ، چەند...) لە ڕستەدا بۆ پرسیارکردن لە بارەی کارەوە هاتوون. لەبەر ئەوە پێیان دەگوترێت (ئاوەڵکاری پرسیاری).

تێبینی:

د. نەسرین دەڵێت ئەو وشانە (کەی، چۆن، کوێ، چەند...) هەموویان ئەداتن بۆ

جۆرەها مەبەستی جیاجیا، بە کورتی ئەمانە بە ئاوەڵکاری پرسیاری دانانێم.

هەتا ئێستا لەم نمایشتەدا ئەم جۆرانە لە ئاوەڵکار هاتنە بەرچاو:

١- ئاوەڵکاری چۆنیەتی.

٢- ئاوەڵکاری زەمانی.

٣- ئاوەڵکاری شوێنی.

٤- ئاوەڵکاری وەسفی.

٥- ئاوەڵکاری تەرتیبی.

٦- ئاوەڵکاری تەئکیدی.

٧- ئاوەڵکاری تەکراری.

٨- ئاوەڵکاری نەفی.

٩- ئاوەڵکاری پرسیاری.

[روونکردنەوە:

ئەم جۆرانەی (ئاوەڵکار) تاقیکردنەوەیێکیان هەیە بۆ ئەوەی راستیی ئاوەڵکار بوونیان و نەبوونیان بەرەو ئاشکرایی ببات، تاقی کردنەوەکەش لەوەوە دێت کە لە رستەی بێ کاردا سەیریان بکرێت بە تایبەتی ئەوانەی (فرێز، کلۆز)نین و وشەی رەسەنن:

(١) وشەکانی (ژیرانە، عاقلانە، بەژیری، بەعاقلی) دەست نادەن لە رستەی بێ کاردا بێن. (من ژیرانەم - من بەژیریم) نەدەگوترێ و نەڕاستیشە.

(٢) بانەویان، شاخەوشاخ دەست نادەن لە رستەی بێ کاردا بێن. (من بانەوبانم) ناگوترێ.

(٣) (من دەمەوڕووم) ناگوترێ، بەڵام (من لەسەر لام) دەگوترێ نەک بە واتای ئاوەڵکاری بگرە وەک ئەوەی بڵێی (من لەسەر بانم) کە وشەی (لا، سەر) بە جۆرێکی عادەتی لەکار هاتبن.

(٤) وشەکانی (دوێنێ، پێرێ، ئەمساڵ، دەمێکە، زوو، درەنگ..)

هیچیان لە رستەی بێ کاردا نایەن، کە دەشڵێی (من درەنگم) وشەی

درەنگت بە مەجاز بە واتای (من دواکەوتووم) بەکار هێناوە نەک حەقیقی.

(٥) دەستەواژەکانی (لەسەر دارەکە و ژێر دارەکە و کن دارەکە...) هەڵدەگرن لە رستەی بێ کاردا بێن بەڵام نەک بە ئاوەڵکاری بگرە وەک ئەوەی بڵێی (من لە بەغدام، لە ژوورم، لە دەرەوەم، لە سەربانم، لە ناو نوێنم) کە لەمانەدا (وصف)ی راناوەکە پەیدا نییە تا بڵێین ئایا ئاوەڵکارن یا ئاوەڵناون.

وشەکانی (سەرێ، دەرێ، خوارێ...) هەموویان ئاوەڵکاری حەقیقین بەڵام کە گوتت (لە سەرێ، لە دەرێ....) هەڵدەگرن ببنەوە (ناوی جێگە) وەک (بەغدا و هەولێر): (لە سەرێم - لە بەغدام - لە دەرێم - لە هەولێرم). هەروەهاش (لە سەرەوە، لە تەنیشت منەوە، لە خوارەوە...) ئەگەر (لە)کەیان لێ فڕێ درا هەر بۆ جێگە دەشێ لە رستەی بێ کاردا بێن.

(٦) وشەکانی (خێرا، زۆر، جوان...) ئاوەڵناوی بێ دەمەتەقەن، بەڵام (زوو) هەر بۆ وصفی کار و کات دەست دەدات: دەڵێی (ئێستا زووە - زوو رۆیشت) بەڵام ناڵێی (من زووم، ئەحمەد زووە...).

(٧) وشەکانی (دوو دوو، پۆل پۆل) دەشێ وصفی (ناو) بکەن و لە رستەی بێ کاردا بێن وەک ئێمە پۆل پۆلین - ئێوە جووت جووتن) بەڵام وشەکانی (جار جار، دەم بە دەم، تاو تاو، ساڵ ناساڵ، قوم قوم، کەم کەمە...) کە دەلالەتی کاتیان تێدایە ناشێ لە رستەی بێ کاردا بێن. کەس ناڵێ (منداڵەکان جار جارن - ئاوەکە قوم قومە - دەغڵەکە کەم کەمەیە - ترۆزی ساڵ ساڵە ...).

(٨) وشەکانی (دیسانەوە، دووبارە، هەرجارە، ئەوەندەی...) هیچیان لە رستەی بێ کاردا نایەن و نابنە وصفی ناو و ڕاناو...

(٩) وشەکانی (تێرتێر، پڕ بەدڵ..) و هەموو ئەوانەی تەئکیدیان تێدایە ئەوانیش نە لە رستەی بێ کاردا دێن و نەدەشبن بە وصفی ناو و راناو... دیارە تەئکید بۆ رووداو دەبێت نەک بۆ شتی (جامد).

(١٠) هەرگـيـز، هـيچ رەنگـێ و هـيچ كلۆجـێـك بۆ نـەفـيـی روودانـن لە رابردوو و ئايندەدا، لەبەر ئەمـە لە حـازردا كـە (كـار) پەيدا نـەبێ ئەم وشانە جێيان نابێتەوە مـەگەر لە رووی نەشارەزاييیەوە بەكار هاتبێتن. تۆ دەتوانـی بلـێـی (هـەرگـيـز لێـرە نـەبووم، هـەرگـيــز لێـرە نابم) بەڵام ناتوانی بلـێـی (هەرگيز لێرە نيم) هـەروەهـاش ناتوانـی بلـێـی (هـەرگـيـز من دز نيم). دەشـێ دەســـتـــەواژەی وەك (بە هـيـچ رەنـگـێ، بە هـيـچ كلۆجێ) بكرێتـەوە بە تەركـيـبی عـادەتی و لە ئاوەڵكاری دەربهـاوێژرێت ئەوســا لە رســتـــەی بـێ كــاردا بێـت وەك ئەوەی بلــێـی (من بەهـيـچ تەئويلێك - بەهـيـچ كلۆجـێـك - بەهـيـچ رەنـگێـك - لەبەر تيـشكـی هـيـچ راستييێكدا - كەمتەرخەم نيم...).

(١١) وشــەكـانی (كـەی، كـوێ) كـە بۆ كـات و جـێـگـەن لەگـەڵ وشـەی غەيری مناسبی خۆياندا بەكار نايەن وەك كە بلێی (كوێ خۆشە، كوێ خـۆش بوو) وەياخـود (كـەی خـۆشـە، كـەی خـۆش دەبێ) لەم حـاڵەتەدا (كـوێ) دەبێتـە (چ جێگايەك)، (كـەی) دەبێتە (چ كـاتێـك) و هـەردووويان لە ئاوەڵنـاوی دەكـەون و دەبنە نـاوی جـێـگە و كـات و فـەرقـيـان نامـێنـێ لەگەڵ (بەهـار خـۆشە، شـەو خـۆشە، بەغدا خـۆشـە..) ناگـوترێ (بەغدا كـەيە؟ من كـوێم؟ ئـەوان كـوێ دەبن). كـە پريپـۆزيشـنی (لە، بۆ، تا...) چوونە سەريان وەزعيان دەگۆڕێت: (لە ئينگليزی و عـەرەبيدا باری ئەو وشـانە تا بلـێـی جـودايە. وشـەی (Where) هـەم بە واتای (كـوێ) دێت هـەم بە واتـای (لە كـوێ). لە عـەرەبيـدا (الی اين، من اين) بەكـار دێت بەڵام (في أين) ناگـوترێ.. بە پێـی تەفـصـيـلاتێـك كـە لێـرەدا جـێـی بۆ ناكرێتەوە.

(چۆن، چەنـد) دەشـێ ببنە پرسـيـار لە بارەی چۆنايەتی و چەندايـەتيی ناو و راناو بێ ئـەوەی ئاوەڵكار بن هـەروەك (جـوان، زۆر) چۆنايەتی و چەندايەتی رادەگـەيـەنن، تەنيـا فـەرقـی (پرس) لە نێـوانيـانـدا هـەيە: (تۆ چۆنيت؟ مەڕەكان چەندن؟ تۆ جوانيت. ئێوە زۆرن).

كـەسێـك بيـەوێ، دەتوانـێ ئـەم تاقيـكردنەوەيە بكا بە پێـوانەی ئاوەڵكار بوون و ئاوەڵكار نـەبوونی وشــەكــان و دەسـتــەواژەكــان، هـەروەهـاش

باشتر بۆی روون دەبێتەوە نەهاتنی وشەی ئاوەڵکاری حەقیقی لە رستەی ئەوتۆ کاری ئاشکرای تێدا نەبێت ئەوە بە ئیسپات دەگەیەنێ کە رستەی بێ کار لە کوردیدا هەیە و زۆریشە.

دەمڕاستی لیژنە]

جگە لە مانەش کۆمەڵێک وشە هەن هەڵدەگرن موناقەشە بکرێن لە رووی ئاوەڵکار بوون و نەبوونیانەوە بە تایبەتی کە لە دەستووری زمانی فارسیدا، لە ژێر عینوانی (قید) بە ئاوەڵکار ژمێرراون، لەمانە:

١- قیدی تصدیق، وەک بەراستی، هرآینە، بە تحقیق، هتاد...

٢- قیدی شک و تردید، وەک: گویا، شاید، پنداری...

٣- قیدی تمنی (ئاوات)، وەک: کاشکی، بود...

٤- قیدی سوێند، وەک: بەخدا، توخدا...

٥- قیدی تشبیه، وەک: چنین، چنان، همانا، اینگونه...

٦- قیدی شرط، وەک: أگر، چنانچە، ور، هرگا...

٧- قیدی استثناء، وەک: مگر، جز، الا، غیر، سوی...

٨- قیدی تدرج، وەک کم کم، اندک اندک.

لیژنە بە پێی تصوری خۆی لە سروشتی زمانی کوردی و ئەو دەورەی ئاوەڵکار دەیبینێ لە رستەدا ئەم کۆمەڵە وشانەی بەلاوە ئاوەڵکار نین، دەشێت لە ژێر عینوانێکدا دابەش بکرێن.

[روونکردنەوە:

بەلای منەوە بەشێک لەو وشانەی کە لە زمانی فارسی بە (قید) حیساب کرابوون هەڵدەگرێ ببێتە (ئاوەڵکار). ئەوەی پێی گوترا (قید تدرج) و نموونەکەشی (کم کم - اندک اندک) بوو خزمی ئەو ئاوەڵکارەیە کە لیژنە ناوی نا (ئاوەڵکاری تەرتیبی) نموونەکانیش (قوم قوم - کەم کەمە) بوون.

بەرانبەر نموونەی (بەڕاستی) کە لە لیستەی ڕێزمانی فارسیدا بە (قید تصدیق) حیساب کرابوو، لە لێکۆڵینەوەی لیژنە نموونەی

(بەژیری) هاتووە و خراوەتە ژێر ناونیشانی ئاوەڵکاری چۆنیەتییەوە. هەرچەند چۆنیەتی و (تحقیق) یەک ناگرنەوە، بەڵام داڕشتنی نموونەکان (بەڕاستی، بەژیری) یەک داڕشتن. دەڵێی (بەڕاستی ئازایت) بەڵام (بەجوانی، بەژیری..) کاریان دەوێت هۆیەکەش ئەوەیە کە (بەڕاستی) بۆ (تحقیق و تأکید)ە و دەخلی بەسەر کارەوە نییە و بۆ هەموو حاڵ و بارێک دەست دەدات.

لەگەڵ ئەمەشدا لە یەکترچوون وەیا یەکبوونی داڕشتنەکان دەبێ حیسابیان بۆ بکرێ. هی تریش هەیە لەو لیستەیەدا لێکۆڵینەوە هەڵدەگرێ.

دەمڕاستی لیژنە]

لیژنە لە دوای لێکۆڵینەوە و چاو پێداگێڕانەوەی دەستووری زمانەکانی تر، ئەم تەعریفەی بۆ ئاوەڵکار پەسەند کرد:

ئاوەڵکار ئەو بەشەیە لە ئاخاوتن کە پێوەندیی راستەوخۆی بە کارەوە هەبێت لە رووی چۆنیەتی وەیا کات، وەیا شوێن و جۆری روودان و روونەدانی، وەیا هەر بارێکی تریەوە بێت.

دووەم: ئاوەڵکار لە رووی فۆرمەوە.

لیژنە بە ئیستیقرا بۆی دەرکەوت کە ئاوەڵکار لە رووی فۆرمەوە دابەش دەکرێت بە چەند بەشێکەوە بە تایبەتی لە دوا ئەوەی کە بە دوور و درێژی لە جۆرەها نموونەی ئاوەڵکاری کۆڵییەوە لە رووی واتاوە:

١- ئاوەڵکاری سادە.

٢- ئاوەڵکاری ناسادە.

٣- ئاوەڵکاری سارستە.

ئاوەڵکاری سادە: ئەو ئاوەڵکارەیە کە لە تەنیا وشەیێک پێک هاتبێت، وەک «کەی، کەم، پاش» - ئەگەر لە رستەدا وەسفی کار بکات-.

ئاوەڵکاری ناسادە: دوو چەشنە.

١- داڕژاو (دروست کراو): ئەو ئاوەڵکارانەن کە بە یاریدەی پاشگر یان پێشگر ساز دەبن. بۆ نموونە:

| وشە | ئاوەڵکاری داڕژاو | |
|---|---|---|
| سەر | سەرێ | وەرە سەرێ. |
| خوار | خوارێ | چوومە خوارێ |
| هاوین | هاوینێ | هاوینێ دروێنە دەکرێت. |
| شەو | شەوەکی | شەوەکی کەوتمە رێ. |

٢- لێکدراو: ئەو ئاوەڵکارەیە کە لە دوو ریشە یا پتر پێک هاتووە، بۆ نموونە:

شاخەوشاخ، چێشتەنگاو، کەوتورەوت، کەم کەم، تاوتاو، تێرووپڕ.

ئاوەڵکاری سارستە: ئەو ئاوەڵکارەیە کە لە کۆمەڵە وشەیێک پێک دێت، بەبێ ئەوەی کارێکیان لەگەڵدا بێت و بە تەنیاش ئەنجام نادەن بە دەستەوە تا لە رستەدا نەبێت، وەک:

هەفتەی ئایندە.

مانگی داهاتوو

لەمەولا

بەبەرگەوە

بەدڵشکاوی

لیژنە بە پێویستی نەزانی بە دوورو درێژی لە ئاوەڵکار بکۆڵێتەوە لە رووی فۆرمەوە، یان لەمە زیاتر نموونە بهێنێتەوە، چونکە لە بەشی ئاوەڵکار لە رووی واتاوە نموونەی زۆر هێنراوەتەوە.

تێبینی:

دوای بە سەرچوونی پشووی هاوینە لیژنە گەڕایەوە بۆ سەر تەواوکردنی لێکۆڵینەوەکانی لە رێزمانی کوردیدا، ئەم لێکۆڵینەوەی لەمەولا سەرەتای دەست پێکردنەوەی چالاکیی لیژنەیە لە کۆڕێکی نوێدا و بەم جۆرەی خوارەوە بەسەریدا رۆییوە.

لیژنه له سەرەتای چالاکیی نوێیدا چاوێکی به کارەکانی کۆڕی پێش هاوینەیدا گێڕایەوە لەوەوە مەعلومی کرد کە تا ئێستا لە باسەکانی خوارەوە دواوە:

١- ناو

٢- راناو

٣- ئاوەڵناو

٤- کار

٥- چاوگ

٦- ئاوڵکار

لیژنە لەم باسەنە بە پێی ئەو دەرفەتەی کە هەیبوو و بە گوێرەی ئەو فەرمانەی بەسەر شانییەوە بوو، تا رادەی پێویست درێژەی داوە بە لێکۆڵینەوەکانی.

لە سەرەتای دەست پێکردن لەم لێکۆڵینەوانە لیژنە رەچاوی دوو احتمالی کرد بۆ بەرنامەی ئیشی خۆی. یەکەمیان ئەوەبوو کە بەنیسبەت بەشەکانی ئاخاوتنەوە پەیرەوی رێزمانەکانی ولاتەکانی رۆژاوا بکات و ئەو «٨» کەرتە بکاتە بنکە کە لە رێزمانی ئینگلیزیدا ناویان هەیە. دووەمیان ئەوەبوو کە ئەگەر ئیستیقرا دەری خست سروشتی ئاخاوتنی کوردی داخوازیی پتر یا کەمتر لەو هەشت بەشە بکات، ئەوسا بەپێی ئەو داخوازییە، ئاخاوتنی کوردی دابەش بکرێت. لە ماوەی پشووی پێش هاوینەدا لیژنە لەو (٦) باسەی لای سەرەوە دوابوو، کە لە راستیدا پێنج بەشی سەربەخۆن لەو رووەوە کە «کار و چاوگ» لە بنەڕەتدا یەک بەشن.

بە پێی سەرنجدان دوای ئەو (٥) یا (٦) بەشە چی دەمێنێتەوە، سێ بەشەکەی (Preposition, Conjunction, Interjection)ی زمانی ئینگلیزی و کۆمەڵە ئامرازەکانی ترە، کە بەبەریانەوە هەیە بە پێی سروشتی زمانی کوردی دابەش بکرێن بە چەند بەشێکەوە، وەک:

برای من (ی)

پیاوەتی (ەتی)

پارەدار (دار)

بێ وەفا (بێ)

هەڵگرتن (هەڵ)

هەڵگرتنەوە (هەڵ... وە).. هەتاد.

لیژنە وتووێژێکی قووڵ و ئیستیعراضیکی بەرفرەوانی کرد لەبارەی ئەو بەشانە کە لەسەرەوە تۆمار کران و هەتا ئێستا لێیان نەدواوە.

بۆ ماوەیەک دەمەتەقێی لەسەر ئەوەبوو وشەکانی زمانی کوردی کە غەیری پێنج بەشە باس لێکراوەکان بن، ئاخۆ چەندن جۆرن، چەندێک لەو وشانە بەر عینوانێک دەکەون؟ لە ئەنجامدا بریار درا چوونە قووڵاییی ناو ئەم باسە بخرێتە بەر لێکۆڵینەوە و سرنج راگرتنی ئەندامانی لیژنە بە درێژاییی ئەو ماوەیەی کە تۆژینەوەی زمانزانانەی تێدا دەکات. وەک هەنگاوێکی سەرەتایی لەم مەیدانە بەرفراوانەی لێکۆڵینەوە و سرنج راگرتنەدا، لیژنە لە پێشەوە کەوتە سەر لێکۆڵینەوە لەو بەشە ئاخاوتنەی کە لە ئینگلیزیدا پێی دەگوترێت:

## ٧

# پریپۆزیشن

لە کـتـێـبی ڕێزمـانی ئینگلیـزی An English Grammar Book لە دانانی Evan C.penglis تەعریفی پریپۆزیشن بەم جۆرەی خوارەوە دەکات:

A Preposition is a word placed before a noun or its equivalent to show its relation to another word.

بەم وشانەی خوارەوەش دەڵێ بەشێکن لە پریپۆزیشن:

to, in, at, on, of, by, into, with, over, for, from, under, etc.

دواتر دەڵێت پریپۆزیشنی تریش هەن کە وا دەشێ وەکو Adverb یش بەکار بێن وەک:

about, across, along, among, back, before, between, behind, down, in front of, off, round, away.

بە دوا ئەم نموونانەدا تێبینیێکی گرنگ ئەمەیە کە دەڵێ وا دەبێ پریپۆزیشن لەگەڵ Adverb, Conjunction تێکەڵ دەبێ واتە بەوان حیساب دەکرێت، بەڵام ئەم تێکەڵییە هەمیشە بەوە دەرەوێتەوە کە Adverb, Conjunction هەرگیز پێوەندییان بە ناو و ئاوەڵەکانیەوە نابێت کە ئەمە پێچەوانەی کاری پریپۆزیشنە.

نووسەرانی کوردیش کە لەم باسە دواون ئەمانەن:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە ڕێزمانەکەیدا (صرف و نحوی کوردی) کاتێک باسی (أدوات) دەکات (بۆ، تا، لە، بە) دێنێتە ناو میسالانەوە و هیچ عینوانێکی تایبەتی بۆ دانەناون.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردی، فقرە (٦٩)دا دەڵێت: ئەداتی تەواوی کەلیمەیەک کە لە جوملەیێکا بۆ پێشاندانی لاقەی مانای ناوێ، سیفەتێک و کەلیمەیێکی تر بە کەڵک ئەهێنرێت، وەکو:

ئێمە لە مەرگەوە هاتین (لە...وە)

پیاوەکەی تۆش ڕۆی (ی)

جامانە سەرپۆشێکی ناقولایە (ی)

مامۆستا توفیق وەهبی «ئەداتی تەواوی» لەبری «حرف جری عەرەبي و پریپۆزیشنی ئینگلیزی» بەکار دەهێنێت، لەو دەستوورەدا هەر ئەو دوو نموونەی (لە......وە) و (ی)یەی ناو هێناوە.

٣- کوردوییف لە کتێبەکەیدا (زمانی کوردی ساڵی ١٩٧٠) لە ژێر عینوانی (بەرناف)دا دەڵێت: بەرناف سێ بەشە. بەرناڤی کۆن، بەرناڤی تازە، بەرناڤەکانی بەجوت.

آ- بەرناڤە کۆنەکان، وەکو (ژ، ل، ب، د، بۆنا، با، بێ، دوو، هەتا، پەی، سەبا، جەم، گەل).

ب- بەرناڤە تازەکان، وەکو (سەر، بەر، ناڤ، پاش، پێش، ڕەخ، بن).

جـ- بەرناڤە بە جوتەکان، وەکو (دگەل، لەگەڵ، بەرب) هەروەها بەرناڤە کۆنەکان لەگەڵ تازەکان پێکەوە بەکار دێن، وەکو (ل سەر، ب سەر، ل بەر، ژبەر، دناڤ، ژناڤ...).

دیاریشە مامۆستا کوردوییف وشەی (بەرناڤ)ی بۆ حەرفی (جر) بەکار هێناوە.

٤- رشید کورد لە کتێبەکەی «ڕێزمانا کرمانجی» لە ژێر عینوانی (حروف الجر، پێربەست)دا دەڵێت: پێربەست وشەیێکە کە ناوەکان و بەرناڤەکان[1] دەکات بە مفعولی صریح، وەک:

«من قەلەمەک ژ کوڕێ خوەڕاکڕی» لەم رستەیەدا «دژ» و «ڕا» پێربەستن. پێربەست لە زمانی کوردیدا ئەمانەن:

(بۆ، ب، د ژ، ل، ڕا، ئانگۆ، پاشێ، ژبۆ، ل پێش، قاندی...).

٥- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا «ڕێزمانی کوردی» چاپی ١٩٦٠ دەڵێت:

---

(١) لێرەدا بەرناف لە بری (راناو - ضمیر) بەکار هاتووە. لە نووسینی کوردوییڤدا لە بری (حرف الجر) بەکارهاتوە.

ئامـرازی پێـوەندی ئەو واژەیەیـە، کـە لە پێش «ناو، ڕاناو، ئاوەڵناو»ەوە بەکـار دەهێنرێت بۆ دەرخـسـتنـی علاقـەی ناوەکە، یا ڕانـاوەکە، یا ئاوەڵناوەکە لەتەک وشەکانی تری ڕستەکەدا، ئامرازی پێوەندیش دەکات بە دوو بەشەوە:

١- سادە (بە، لە...)

٢- لێکدراو (لەسەر، بەبێ، هەتا...)

ئەمانەش بە ئامرازی پێوەندی (حروف الجر)ی عەرەبی دادەنێت:

١- بـۆ (لۆ) ٢- لـە ٣- بە (پـەی) ٤- تا (هـەتا، هـەتاکـــو، هەتـاوەکـــو..) ٥- ی ٦- پیتی(ە) ٧- وە ٨- وەک (وەکو) ٩- پێ ١٠- لێ ١١- تێ.

تێبینی:

ئامرازی (پێ، تێ، لێ) لەتەک فرماندا بەکار دێن.

٦- مـەردوخ لـە فـەرهـەنگـەکـەیدا لەلاپـەڕە (٢٥) لە نێـوان تێکڕای باسـی حـروف و ادوات تەنیـا ناوی (تا، لە) دەبات کـە بەر واتای پرێپـۆزیشن دەکـەون، بێ ئەوە هیچ عینوانێکی تایبەتیان بۆ دابنێت، وەیا تەعریفێکیان بکات.

٧- کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی یەکەمی ناوەندی چاپی دووەم ساڵی ١٩٧٢ کە لاپەڕە (٢٥، ٢٦، ٢٧)دا لە پارچەکانی ئاخاوتن دەدوێت لە بەشی شەشەمدا دەڵێت:

ئەگەر وشـەکە بۆ دەرخـسـتنی پێوەندیی ناوێ، یا ڕانـاوێ، یا ئاوەڵناوێ بەکار هێنرا لەتـەک وشـەکانی تری ڕسـتـەکـەدا پێی دەگوترێت «ئامـرازی پێوەندی». تەنیاش (لە، بۆ، ی) لە ڕستەدا بە میسال هێناوەتەوە.

پار ئێوە و ئەوان چوون بۆ هەولێر (بۆ)

ئێمە دواکەوتوو کەی دەگەینە ڕیزی گەلان (ی)

دۆشاو لە ترێ دروست دەکرێت (لە)

٨- لە کتێبی دەستووری پارسی دانانی ر. ذوالنور لاپەڕە (٢٥٤) و بەرەوخـوار لە ژێر عینوانی (حرف) باسـی ئەو وشانـە دەکات کەوا بەر مـفهومی پرێپـۆزیشن دەکەون و دەیانخـاتە بەر بەشی حەرفی نحوی، بەشـێکی تریش لە ژێر عینوانی حەرفی صرفی دادەنێت کە پێوەندیی بە پرێپۆزیشنەوە نییە.

لەو حرفانەی کە پێیان دەڵێت (حرف نحوی) و واتای پریپۆزیشنیان تێدایە، تێبینیی ئەوە دەکات کە ئەو حرفانە وجوودی سەربەخۆیان هەیە بەڵام واتای تەواوی سەربەخۆیان نییە، لە حاڵێکدا حرفەکانی صرفی نە وجوودی سەربەخۆ، نە واتای سەربەخۆیان هەیە. ئەم وشانەی خوارەوەشی داناوە بە حەرفی نەحوی: بە، با، بر، تا، از، در، را، برای.

لەم نمایشتەوە دەردەکەوێت سەرپاکی رایەکان لەوەدا یەک دەگرنەوە کە ئەو وشانەی بەر واتای پریپۆزیشن دەکەون، سەربەخۆ بەکار نایەن و واتای تەواو بە دەستەوە نادەن تا دێنە ناو رستە و دەبنە دەستەیاری وشەیەکی تر. کتێبەکەی رێزمانی فارسی سەرەڕای ئەم لایەنە شتێکی تری ئیزافە کردووە کە پریپۆزیشن لە ئەداتەکانی (صرفی) جودا دەکاتەوە بەوەدا کە دەڵێت (حروفی نحوی) وجوودی سەربەخۆیان هەیە هەرچەند واتای سەربەخۆشیان نەبێت، ئەم تێبینییەی کتێبەکەی فارسی رای ئەو جودا دەکاتەوە لە رای گەلێک لەو نووسەرانەی کە باسمان کردن. بە نموونە بە پێی تەعریفی کتێبە فارسییەکە (ی) ئیزافە و وەسف لە کوردیدا نابن بە پریپۆزیشن کەچی لە کتێبەکەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین و هی قوتابخانە بە پریپۆزیشن دانراوە.

بە دوا ئەو شیکردنەوەیەدا لیژنە هاتە سەر لێکۆڵینەوە لە دۆزینەوەی زاراوەیەک بۆ پریپۆزیشن کە دەست بدات و بگونجێت لەگەڵ ئەو دەورەی دەیبینێ لە رستەدا. بۆ ئەم مەبەستە تەماشایێکی ئەو زاراوانە کرا کە هەتا ئێستا لەلایەن نووسەرانی زمانی کوردییەوە بەکار هێنراون:

١- مامۆستا سەعید سدقی، لەم باسە بێ دەنگە.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی، ناوی ناوە (ئەداتی تەواوی).

٣- مامۆستا کوردوییف، ناوی ناوە (بەرناف).

٤- مامۆستا رەشید کورد، ناوی ناوە (پێربەست).

٥- نووری عەلی ئەمین، ناوی ناوە (ئامرازی پێوەندی).

٦- لە کتێبی قوتابخانەکاندا دیسان (ئامرازی پێوەندی) بۆ بەکار هاتووە لە هەندێ شوێنیشدا ئامرازی (بەندیواری) بۆ بەکار هاتووە.

لیژنە موناقشەی ئەم زاراوانەی کرد لەگەڵ هەندێ زاراوەی تر، وەک (نێوکار،

رستەهۆن، وشەهۆن). هەروەها لیژنە سەرلەنوێ موناقەشەیەکی دوور و درێژی دەوری پریپۆزیشنی کرد لە ئاخاوتندا، لەو بەینەدا هەموو ئەو تەعریفانەی خستە بەرچاو کە لە کتێبەکانی ڕێزمان بۆ پریپۆزیشن دانراوە، لە کۆتاییی هەموو لێکۆڵینەوەیێکدا گەیشتە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- پریپۆزیشن رواڵەتی سەربەخۆی هەیە بەڵام واتای لەتەک وشەی تردا دەردەکەوێت. لەمەدا لە هەموو ئەو ئامرازانە جودا دەبێتەوە کە رواڵەتی سەربەخۆیان نییە، وەک (ی) ناوی واتا لە وشەی (جوانی)دا، یاخود ئامرازی دووبارەکردنەوەی کۆتاییی کاری وەک (هاتەوە).. هەتاد...

٢- دەوری پریپۆزیشن لە داڕشتنی رستەدا دەردەکەوێت، واتە بەشەکانی رستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە و پێوەندیی ناوەکییان بەیەکەوە دروست دەکات.

لەم دوو تێبینیە گرنگەوە و دوای چەند پێشنیازێک کە لە کۆتاییی نرخاندندا رەت کراوەتەوە، لیژنە ئەم تەعریفەی بۆ پریپۆزیشن پەسەند کرد:

(پریپۆزیشن ئەو بەشەی ئاخاوتنە کە وجوودی سەربەخۆی هەیە و واتاکەی لەپاڵ وشەی تردا دەردەکەوێت و پێوەندیی نێوانی «ناو» و «ئاوەڵەکانی» لەگەڵ بەشەکانی تری ئاخاوتن پێک دێنێت لە داڕشتنی رستەدا).

بۆ دۆزینەوەی زاراوەیەک کە لەگەڵ سروشتی واتای پریپۆزیشن بگونجێت، لیژنە دیسانەوە بە دوور و درێژی لێکۆڵییەوە و هەموو ئەو زاراوانەی خستەوە بەرچاو کەوا تا ئێستا بۆی بەکار هاتووە. لە ئەنجامی موناقەشەیێکی درێژخایێندا لیژنە وای پەسەند کرد جارێ هەر زاراوەی (پریپۆزیشن)ی بۆ بەکار بێت تا ئەو کاتەی لە لایەن لیژنە خۆی یاخود کۆڕەوە زاراوەیێکی کوردی مناسبی بۆ دەدۆزرێتەوە.

تێبینی:

بەلای لیژنەوە زاراوەی «پێوەندی» لە هەموو زاراوەکانی تری کوردی گونجاوتر بوو لەگەڵ واتای پریپۆزیشن، بەڵام دەرکەوت کە وا ئەنجومەنی کۆڕ ئەم زاراوەی بۆ «حروف العطف» هەڵبژاردووە، لەبەر ئەمە لیژنە ئەم زاراوەی بەلاوە ناو بەشێوەیێکی کاتی گەڕایەوە بۆ زاراوەی Preposition بەجگە لەمە لیژنە هات و نمایشتێکی ئەو وشانەشی کرد کە نووسەرانی زمانی کوردی لێرە بە پێشەوە بە پریپۆزیشنیان لە قەڵەم داوە و ئەم لیستەیەی ژێرەوەیان لێ پێک هێناوە:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە میسالدا «بۆ، تا، لە، بە»ی بەکار هێناوە.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی «لە، ی ئیزافە و وەصف»ی لە بەرگی یەکەمی «دەستووری زمانی کوردی»دا بەکار هێناوە، (بە، بێ، پێ، تا، تێ، بۆ، وەک...)ش لە فەرهەنگەکەیدا.

٣- کوردوییف «ژ، ل، ب، د، بۆ، بۆنا، با، بێ، دو، هەتا، سەبا، جەم، گەل، سەر، بەر، ناڤ، پاش، پێش، رەخ، بن، دگەل، لەگەل، بەرب...».

٤- رشید کورد «ژ، را، بۆ، ب، د، ر، ل، ئانگۆ، پاشی، ژبۆ، ل پێش، ل پاش».

٥- نووری عەلی ئەمین «بۆ، بە، لە، تا، هەتا، هەتاوەکو، هەتاکو، تاکو، ی وەصفی و ئیزافە، بزوێنی (ە) دوای کاری وەک - چوومە بازاڕ - هەروەها ئامرازی «وە» بە واتای «بە»، وەک، وەکو، هەروەکو، پێ، لێ، تێ، لەسەر، بەبێ، لەبەر... هی تریش لەم شێوەیە».

تەماشاکردنێکی سەرپێیی کە قووڵبوونەوەشی تێدا نەبێت دەری دەخات، ئەم کۆمەڵە وشانەی سەرەوە بەشێکیان بێ دەمەتەقە لە هەموو روویەکەوە بەر ئەو تەعریفە دەکەون کە لیژنە پەسەندی کردووە بۆ پریپۆزیشن، ئەم تاقمە بریتییە لەم وشانەی خوارەوە:

١- بۆ (لۆ، پەی، ئەڕا)

٢- لە (ل، ژ، د، دە)

٣- تا (تاکو، هەتاکو.....)

٤- وەک (وەکو، هەروەکو....)

٥- بێ

٦- بە

ئەمانە پریپۆزیشنی سادەی بێ گومانن:

١- (لە) شێوەیەکی تری بەکارهێنانی هەیە کە لەگەڵ تەواوکەری «ەوە، ڕا، دا» دێت، وەک:

لە منەوە بۆ تۆ.

لە کەرکووکرا هاتم.

لە خانووەکەدا دەژیم.

٢- (بە) ئەویش وەک (لە) تەواوکەری (ەوە، دا)ی هەیە، وەک:

بەمەدا دەردەکەوێت.

بەدارەکەوە نیشتەوە.

بە لای لیژنەوە ئەم زیادییە تەواوکەرێکە، کە سروشتی واتای ئەم دوو پریپۆزیشنە داوای دەکات و لە سادەییان ناخات.

لە نێوان ئەو شەش پریپۆزیشنە سادەیەی سەرەوە دوو پریپۆزیشنی (بۆ، بێ) هەڵدەگرن پریپۆزیشنی تریان لە پێشەوە بێت بێ ئەوەی واتایان بگۆڕێت، لە هێزیان زیاد دەکات وەک:

من لەبۆ تۆمە تۆ لەبۆ کێتە.

بەبێ من کتێبەکە مەخۆێنەوە.

تێبینی:

لە هەندێ ناوچەی کوردستانی خوارووی وشەی (چون) بە واتای (وەک) بەکار دێت، رواڵەتی وشەکە وادەگەیەنێت کە لە ئێرانەوە هاتبێت چونکە فارسیش هەر وشەی (چون) بەکار دەهێنێت.

وشەی (وەسە) بە واتای (وەک) لە کوردستانی سەروو و لە هەندێ ناوچەی کوردستانی خوارووشدا بەکار دێت، بەڵام ساغکردنەوەی سادەبوون و نەبوونی ئەم وشەیە لێکۆڵینەوەی قووڵتری پێ دەوێت.

لیژنە وای پەسەند کرد کە چەند نموونەیێک بهێنێتەوە بۆ پریپۆزیشنە سادەکان، واتە ئەوانەی کە گومانیان لێ ناکرێت، وەک:

١- (بۆ): دەچم بۆ بازاڕ.

٢- (لە): لە هاویندا سەرتان لێ دەدەم.

٣- (تا): تا کەرکووک دەچم.

٤- (وەک): مامۆستا وەک باوکە بۆ قوتابی.

٥- (بێ): بێ ئێوە هیچ ناکەم.

٦- (بە): نووسراوێکم بە پۆستەدا بۆ ناردن.

٣- هەندێ لەم پریپۆزیشنانە وا دەبێت لەگەڵ وشەی تردا پریپۆزیشنی لێکدراو دروست دەکات. ئەوەی سرنجیش رادەکێشێت لەم دیاردەیەدا ئەوەیە زۆرینەی وشەکان زەرفن، وەک لەم نموونانەی خوارەوە دەرکەوتووە:

به سەر کێوەکە کەوتم.

لە ژێر دارەکەدا دانیشتم.

بە کن تۆدا ڕابوردم.

بۆ کن ئاوەکە کشا.

بەناو ژوورەکەدا گەڕام.

بەلای ئێوەدا تێ پەڕیم.

لەتەک ئەودا خۆی نانوێنێت.

بە تەنیشت ئەوەوە دانیشت.

لەگەڵ تۆدا دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ.

لێرەدا د. نەسرین هەندێ تێبینیی هەبوو، لەو رووەوە کە بۆ خۆی لێرە بە پێشەوە بە پێی شێوازێکی تایبەتی ئەم موضوعەی بە دەرز گوتووەتەوە و لەسەری نووسیوە. لەم میانەدا بۆ لیژنەی روون کردەوە کە ئەو باسی پریپۆزیشنی لە نێوانی تێکڕای باسی ئامرازدا (أداة) کردووە. بەلام لەگەڵ ئەمەشدا دەرکەوت ئەویش وەک ئەندامانی تری لیژنە لەو باوەڕەدایە پریپۆزیشن هەر ناوێکی هەیبێت ئەو سێ تایبەتییەی تێدایە کە لیژنە زووتر لێی دواوە و لەوەوە تەعریفی دروست کردووە بۆ پریپۆزیشن، تایبەتییەکانیش ئەمانەن:

١- پریپۆزیشن رواڵەتی سەربەخۆی هەیە.

٢- لەتەک وشەی تردا واتای تەواو بە دەستەوە دەدات.

٣- لە رستەدا کار دەکات.

تێبینی:

لیژنە روونکردنەوەی هۆی بەکارهێنانی (تەواوکەر)ی لەگەڵ هەندێ پریپۆزیشن وەک: «لە من ەوە» «لە من دا» «لە کەرکووک ڕا» خستە کاتێکی تر.

لە دوای ئەمە لیژنە هاتە سەر لێکۆڵینەوە لەو تاقمە وشەیە کە بەلای هەندێ زمانزانەوە پریپۆزیشن و لەگەڵ کاردا بەکار دێن، وەک (تێ، لێ، پێ، ە):

١- نووری عەلی ئەمین لە بارەی (تێ، لێ، پێ، ە) کە لەگەڵ کاردا دێن دەڵێت، ئەمانەن هەموویان لە رواڵەتدا پریپۆزیشن و گومان لەمەدا نییە، بەڵام لە رووی مەعناوە بە پێی بەکارهێنان دەگۆڕێن.

٢- سادق بەهائەدین دەڵێت: ئەگەرچی «پێ، تێ، لێ، ژێ» لە بنەڕەتدا پریپۆزیشن بوون بەڵام ئێستە دەوری پریپۆزیشن نابینن چونکە لە بنەڕەتدا: «پێ» لە «بوی - یان - بوێ» دروست بووە.

«تێ» لە «دوی - دوێ» دروست بووە.

«ژێ» لە «ژوی - ژوێ» دروست بووە.

«لێ» لە «لوی لوێ» دروست بووە.

بەڵام «ە»ی دوا کاری (ئەچمە بازاڕ) پریپۆزیشن نییە لەگەڵ ئەفعالی انتقال بەکار دێت، وە لە هەندێ شێوەی کرمانجیی سەروودا نییە.

٣- مەسعوود محەمەد دەڵێت: ئەم وشانە کە بوون بە پێشگر لەوە دەشۆڕێن پێیان بگوترێت «پریپۆزیشن» چونکە دەوریان حصر دەبێت لەناو وشە نەک لە ناو رستە، بە نموونە:

چێشتەکەم لێ نا    چێشتەکەم تێ کرد

بارەکەت لێ نا    چراکەمان پێ کرد

ئەم رستانە بریتین لە (مفعول «چێشتەکە» - فاعل «م» - فعل «لێنا») (مفعول «بارەکە» - فاعل «ت» - فعل «لێنا») (مفعول «چراکە» - فاعل «مان» - فعل «پێکرد»). بەڵام کە هاتین و گوتمان (چێشتەکەم لە قاپەکان کرد، بارەکەم لە وڵاغەکە نا، چراکەم بە ئاگر کرد) ئەوسا ئاشکرایە سێ وشەی (لە، لە، بە) پریپۆزیشن دەوریشیان لە رستەدایە. رستەی (چێشتەکەم لێنا) و رستەی (چێشتەکەم خوارد) بایی نوختەیێک جوداوازیی لە نێوانیاندا پەیدا نییە لە رووی دەوری کاری (لێ نا، خوارد)ەوە: هەروەک لە کاری (خوارد) پریپۆزیشن نییە لە کاری (لێ نا)شدا هەست بە دەوری (لێ) ناکرێت.

ئەم باسەش درێژەی یەکجار زۆرە لێرەدا ناتوانم بیخەمە سەر کاغەز. بەنیسبەت بزوێنی (ە)ەوە: لە لایێکەوە رواڵەت تایبەتی نییە تا پێی بڵێین پریپۆزیشن، لە فەرزی دەوری لە رستەشدا دەوری پریپۆزیشن بێت چونکە ئێمە لە زوەوە گوتوومانە یەک لە سێ تایبەتییەکەی سروشتی پریپۆزیشن ئەوەیە رواڵەتی سەربەخۆی هەبێت. من لە گوتاری (بەکارهێنانی «ی» لە رێزمانی کوردیدا) کە لە یەکەم ژمارەی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردا بڵاو کرایەوە نەختێک بە درێژیی باسی ئەم (ە)م کردووە دام ناوە بە کەرتێکی ئەو فعلانە کە (انتقال) دەبەخشن، لێرەشدا هەر لەو باوەڕەدام و بە پریپۆزیشنی دانانێم بگرە بەشێکی فعلە تەنانەت لە تصریفدا دەشگۆڕێت:

نۆڕیمە خانووەکە – نۆڕیمێ

کەوتمە باغەکەوە – کەوتمێ

خستمە گیرفانمەوە – خستمێ

لە فۆلکلۆر هەیە دەڵێت:

هەی زێرینێ و زێرینێ   کۆیێ خۆشە بابچینێ

حاجی قادر دەڵێت:

خانەقاکەی کەنەفی ئەمنە ئەدەبخانەیی عام

جیێ قەزای حاجەتە عالەم بە زەروری دەچنێ

٤– دکتورە نەسرین دەڵێت:

«پێ، لێ، تێ، ژێ» ئەمانە ئێستا پێشگرن هەرچەندە لە بنەڕەتدا لە پریپۆزیشن پێک هاتوون چونکە ئێستا لە رواڵەت و لە ناوەڕۆکدا لێی دوور کەوتوونەتەوە و دەوری پێشگر دەبینن.

من ئەمانە بەو پێشگرە تازانە دادەنێم کە لە ئەنجامی بەرەوپێشەوەچوونی زمان پێک هاتوون و دەشتوانین زۆرجار لە رستەدا بیانگەڕێنینەوە سەر ئەو بنجانە. بەڵام «ە» گەلێک شتە لە زماندا، هەندێک جار پاشگرە، وەک راست – راستە، هەندێک جاریش لە فعلی انتقالیدا جێگەی بۆ دەکرێتەوە، هەندێک جاریش فعلی مساعدە.

[ڕوونکردنەوە:
وەک لە بەراییی قسەکانم گوتوومە ئەم باسە درێژەی هەیە، لێرەشدا هەمان تێبینی دووبارە دەکەمەوە: نە ئەوسا توانیم نە ئێستاش مەودام هەیە لە هەموو رووییێکەوە بە درێژی لە باسەکە بکۆڵمەوە، بەڵام بە کورتی دەڵێم هەرچەند بوونی ئەو پریپۆزیشنانە بە پێشگر دەوریان لە چارچێوەی کارەکاندا حەصر دەکات دیسانەوە بەشێکی سروشتی کۆنیان بۆ ناو کارەکان دەهێنن. ڕاستی ئەم تایبەتییە لەو کارانەدا بەدیار دەکەوێت کە تێ نەپەڕن و جارێکیان لەگەڵ پێشگری عادەتیدا دێن و جارێکی تریش لەگەڵ ئەو پێشگرانەی کە ئەسڵیان پریپۆزیشن بێ. بە نموونە کارەکانی (کەوتن، بوون، چوون، گەڕان، هاتن) دەخەینە تاقیکردنەوەوە لەگەڵ پێشگری عادەتی و ئەوانی تردا:

هەڵکەوت: دارا باش هەڵکەوت

«پێ» کەوت: دارا لە نەخۆشییەکانی بەهار پێ کەوت - گاشەکەی پێ کەوت

«تێ» کەوت: دارا حەوزی دیت و تێ کەوت

وشەی (هەڵکەوت) هەڵناگرێ پێشگرەکەی لێ بپچڕێتەوە بە هۆی هێنانی راناوی لکاوەوە و بڵێی (هەڵم کەوت، هەڵیان کەوت، هەڵی کەوت). بەڵام دەتوانی بڵێی (سەرمایەکە بوو دارا پێی کەوت، ئێمە پێی کەوتین - بەردێک هات و پێمان کەوت) هەروەهاش دەتوانی بڵێی (ئاوم دیت و تێی کەوتم - منداڵەکان بزربوون و لێیان گەڕام - لێمان گەڕان) تەنانەت ئەگەر وشەی وەک (تێبەربوون)یش بێ ئەم پێشگرەی (تێ) قابلیەتەکەی نادۆڕێنێ بە هۆی پێشگری (بەر)ەوە چونکە دەڵێی (تێیان بەر بووین - ئاگرەکە هات و تێیان بەربوو).

ئەم خاسیەتە هەر هی ئەو پێشگرانەیە کە بە ئەسڵ پریپۆزیشن بوون ئەوانیش (تێ، لێ، پێ)ن، هیچ یەکێک لە پێشگرەکانی (هەڵ، دا، را، وەر) هەروەها ئەو وشانەی کە ناوی جێگە (ظرف مکان)ن و دەوری پێشگر دەبینن وەک (دەر، سەر، لا، بەر، ژێر - بەمەرجێک وەک پێشگر

بەکار هاتبن) ناتوانن راناوی لکاو بۆ خۆیان بدزنەوە: لە کاری وەک (هەڵکەوتن، دەرکەوتن، داکەوتن، وەرکەوتن، لاکەوتن) ناکرێ بگوترێ: (هەڵی کەوت، دەری کەوت، دای کەوت، وەرتان کەوت، لام کەوت) بەڵام دەگوترێ (تێی کەوت، پێمان کەوت، لێمان کەوت..). پێشگری تر هەیە بە ئەسڵ لە پریپۆزیشن پەیدا نەبووە بەڵام ئەو واتایەی تێدایە کە دەیکات بە خـــزمی (تێ، لێ، پێ) ئەویش وەک ئەوان راناوی لکاو بەخۆیەوە دەگرێ. پێشگرەکە وشەی (رێ)یە کە لە نێوان بەشێکی زۆری عەشرەتەکانی کوردستانی عێراق و لە دیوی کوردستانی ئێرانیشدا بەکار دێت. هەروەک دەتوانی بڵێیت (تێتان کەوت، پێمان کەوت...) دەشتوانی بڵێیت (رێمان کەوت - واتە، بەدوایدانایین).

ئەم قابلیەتەی پێشگرەکانی لە بنەڕەتدا پریپۆزیشن بوون لەوەوە دێت کە فعلەکان بەرەو واتای تێپەڕ دەبات لە رێی (تێپەڕکردنی بە واسطە) کە لە عەرەبیدا پێی دەڵێن (التعدیة بالواسطة) و سیغەی (بناء للمجهول)یشی لێ وەردەگرن وەک (یُنام في الغرفة - یُمشي في الحدیقة - یُطار الي السماء..). لە کوردیدا سیغەی (بناء للمجهول) بەم پێشگرانە دروست نابن بەڵام وادەبێ بەهۆی چەسپانی واتای (تێپەڕ) لە فعلە تێ نەپەڕەکەدا هەندێ کەسی نەشارەزا سیغەی (مبنی للمجهول)ی لێ هەڵدەستێنێت، بە نموونە:

کاری (گەیشتن) وەک دەزانین تێ نەپەڕە، بەهۆی پێشگری (تێ)وە دەکرێتە (تێگەیشتن). کە دەڵێی (دەرسەکە تێ گەیشتم) بە دڵی خۆت واتایێکی تێپەڕت بەکار هێناوە وەک لە عەرەبیدا دەڵێی (فهمت الدرس) وەیا لە ئینگلیزیدا کاری understand بەکار دەهێنێت هەردووکیشیان تێپەڕن. ئەم راستییە وا دەکا ناوناوە خەلق بڵێن (دەرسەکە تێ ناگەیشترێ) دەشزانین بەپێی دەستووری ئاخاوتن ناشێ کاری تێ نەپەڕ بدرێت بە سیغەی کارابزر (مبنی للمجهول). لە کوردیدا یەکەم شەقڵی کاری تێپەڕ ئەوەیە بتوانرێ کارەکە وەک تێپەڕ گەردان بکرێ لە هەموو رێژە و کاتێکدا، بە نموونە:

کاری (گرتن) تێپەڕە، کە پێشگری (هەڵ)ی لەگەڵدا بێت لە رابردوودا

دەڵێی (هەڵمان گرت) کە دەزانین راناوی (مان) کارایە. جا ئەگەر (تێگەیشتن) تێپەڕ بوویایە دەبوو بڵێین (ئێمە تێمان گەیشت) (مان)ەکەش کارا بێت، کەچی (مان) کەوتووەتە بەر حوکمی (پریپۆزیشن)ەوە واتاکەشی ئەوەیە کە گوتبێتت (ئەو لە ئێمە گەیشت)، سەیری چۆن پریپۆزیشنی (لە) هاتەوە جێگەی خۆی. کەواتە کاری گەیشتن بە هۆی (پریپۆزیشن)ەوە بەرەو تێپەڕی دەڕوات، ناشبێتە تێپەڕ چونکە گەردانی ناگۆڕێت واتاکەشی لە بنجدا هەر تێ نەپەڕ دەمێنێتەوە.

ئەم باسە پتری بەبەرەوە هەیە، زۆریش نوێیە، بەڵام دەرفەتم نییە چی تری لەسەر بڕۆم چونکە پێویستە بە درێژی لەسەر هەر تاکێکی ئەو پێشگرانە لێکۆڵینەوە بکرێ و بەیەکتر و بە پێشگرەکانی تر بگیرێن و دەوریان لە هەر تاکێکی کارەکان سەرنجی لێ بگیرێت وەک ئەوەی کە پێشگری (تێ) لەگەڵ (کەوتن)دا کارێکی بەرەو تێپەڕ دروست دەکات و دەشێ بگوترێ (تێیان کەوتین) بەڵام لەگەڵ (چوون) کە دەبێتە (تێچوون - بە واتای فەوتان و لەناوچوون) ناتوانێ راناوی نەلکاو بەخۆیەوە بگرێ و بگوترێ (تێمان چوو، تێیان چووین) چونکە لێرەدا تەنیا وەک (هەڵچووین، هەڵچووم) بەکار دێت. کاتێک دەگوترێ (تێیان چووین) کە بە واتای (چوونە ناو) بێت نەک (لەناوچوون) کە تەفسیری درێژەی هەیە.... بە پەرۆشەوە باسەکە جێ دەهێڵم.

دەمڕاستی لیژنە]

ئەنجا لیژنە هاتەوە سەر تەواوکردنی پریپۆزیشن.

ئەوەی لە پریپۆزیشن ماوەتەوە و جێی موناقەشەیە (ی)ی وەسف و ئیزافەیە، وەک:

پیاوی ئازا (ی - لێرەدا وەسفییە)

پەڕی مەل (ی - لێرەدا ئیزافییە)

لە ئەنجامی موناقەشەدا: نووری عەلی ئەمین رای وایە ئەمیش هەر پریپۆزیشنە بەڵام بۆ ئەو دوو ئامانجە بەکار دەهێنرێت.

مامۆستا سادق بەهائەدین دەڵێت: ئەم (ی)یە پریپۆزیشن نییە لە هەردوو بارەکەیدا، تەنانەت لە زاری کرمانجیی سەروودا تەزکیر و تەئنیسیش دەکرێت، وەک: کچا جوان - کورێ ئازا.

د. نەسرین فخری دەڵێت: ئەم (ی)یەم بە ئامراز داناوە، بەڵام ناکەوێتە گەڵ ئەو تاقمەی کە پێی دەگوترێت پریپۆزیشن.

مامۆستا مەسعوودیش دەڵێن: ئەم (ی)یەی وەسف و ئیزافە دەداتن بۆ دەربڕینی واتای وەسف و ئیزافە و بەس. دەوریشی لە رستەدا نییە بەنموونە کە گوترا: برای بارام هات، دەتوانرێت «بارام» و ئەداتی ئیزافە حەزف بکرێن و رستەکەش واتای تەواوی هەبێت (برا هات). جگە لەمە دیارە ئەم (ی)ە کورت کراوەی (هی) ئەداتی ئیزافەیە.

دەوری پریپۆزیشن لە ئاخاوتندا:

لەمەوبەر لیژنە لەوە دوا کە پریپۆزیشن چ دەورێ دەبینێت لە رستەدا لە بەستنەوەی کەرتەکانی بەیەکەوە. سەرەڕای ئەمە پریپۆزیشن لە داڕشتنی وشە و فرێزیشدا دەور دەبینێت، وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

گوڵ بەدەم

نا بەدڵ

چنگ لەسەر شان (چنگ لەسەر چنگ)

دەست لەسەر سنگ

سەربەسەر

بەکوڵ، بەناز، بەجەرگ

بێباک (ناوی علم)، بێ سوود، بێکەس

دیزە بە دەرخۆنە

دەربەدەر

دوور لە رووت

ئەم شێوە داڕشتنە لە کوردیدا بە هۆی پریپۆزیشنەوە زۆر باوە و بۆ گەلێ مەبەست بەکار دێت، تێکڕای ئەو مەبەستانە بەلێگەڕان لە زماندا دەردەکەوێت، کە

ئەمەش کارێکە لە پەراوێزی فەرمانی لیژنە دەردەچێت، بۆیە بەم چەند نموونەیەی خرایە بەرچاو اکتفای کرد.

مەبەست لە بەکارهێنانی تاک تاکی ئەو وشانە:

١- پریپۆزیشنی (بۆ):

ئەم پریپۆزیشنە اتجاه و ئامانج رادەگەیەنێت، وەک:

دەچم بۆ کەرکووک.

بۆ خوێندن هاتووم.

من لە بۆ تۆمە، تۆ لە بۆ کێتە؟

٢- پریپۆزیشنی (لە):

ئەم پریپۆزیشنە بە تەنیا و لەگەڵ تەواوکەری «دا» ظرفیەت رادەگەیەنێت، وەک:

لە هەولێر بووم.

دارەکە لە خانووەکەدایە.

بەڵام لەگەڵ تەواوکەری (ەوە، ڕا) سەرەتا رادەگەیەنێت، وەک:

لە ماڵەوە دەچم بۆ قوتابخانە.

لە بەسرەڕا تا بەغدا بە شەمەندەفەر هاتم.

پریپۆزیشنی «لە» وادەبێ لەگەڵ تەواوکەری «ەوە» کە بە هەندێ وشەی ظرفەوە دەلکێت، ظرفیەت رادەگەیەنن نەک سەرەتا، وەک:

لە ماڵەوە بووم.

لەلای تۆوە دانیشتم.

لە سەرەوە بوویت یا لە خوارەوە؟

ئەمانە و هی تریش وەک هەموویان ظرفیەت دەگەیەنن.

٣- پریپۆزیشنی (بە):

ئەم پریپۆزیشنە بە تەنیا و لەگەڵ تەواوکەری «دا، ەوە، ڕا»دا بەکار دێت و بەپێی جێگای لە رستەدا ئەم واتایانە رادەگەیەنێت:

أ- ديارخستنی واسیتە، وەک:

گۆشتەکەم بە چەقۆ ورد کرد.

پارەکەی بە فێڵ لە دەستم دەرهێنا.

یاریم بە گوێز کرد.

ب- بەستنەوەی مفهومی ناو رستە بە وشەی دوای خۆیەوە، وەک:

بە ئەحمەدیان گوت برۆ.

بە خوام سپاردن.

بە دەست خۆم نییە. خۆشم دەوێیت.

بە من بێت وانەکەم.

جـ- بۆ سوێند، وەک:

بەخوا بەهار خۆشە.

بەسەری تۆ نایەم بۆ ئەوێ.

بە شێخەکەی کانی کەوە ئەم زەوییە بۆ گەنم باشە.

د- بۆ حاڵەت بەکار دێت، وەک:

چێشتەکە بە گەرمی مەخۆ.

فەقیرەکە بە دڵشکاوی رۆی.

هەتا ئێرە لە پریپۆزیشنی (بە) بەرووتی دواین، ئەنجا لەگەڵ تەواوکەرەکەیدا لێی دەدوێین:

أ- لەگەڵ تەواوکەرەکەی «د»دا بۆ ئەم مەبەستانە بەکار دێت:

١- بۆ ظرفیەت، وەک:

باخەوانەکە بە بێستانەکەدا گەڕا.

چاوی بە کتێبەکەدا خشاند.

٢- بۆ واسیتە، وەک:

پارەکەم بە قادردا بۆ ناردی.

ئەم گوڵە بە بۆنەکەیدا لە مێخەک دەچێت.

٣- بۆ حاڵەت، وەک:

بە ڕۆیشتنەکەیدا لە دارا دەکات.

بە کۆڵوانەکەیدا دیارە بڵباسە.

ب- لەگەڵ تەواوکەری (ەوە)دا بۆ ئەم مەبەستانە بەکار دێت:

١- بۆ مصاحەبەت، وەک:

نانەکەم بە دۆوە خوارد.

قەڵەمەکەم گرت بە دەستەوە.

ڕێوییەکە بە تەڵەوە رای کرد.

٢- بۆ حاڵەت، وەک:

چایەکەم بەپێوە خواردەوە.

دارەکەم بەڕەگەیەوە هەڵکەند.

[ڕوونکردنەوە:

نموونەی یەکەم حاڵەتی کارا، هی دووەمیش حاڵەتی بەرکار نیشان دەدات.

دەمڕاستی لیژنە]

٣- بۆ ظرفیەت، وەک:

باڵندەکە بەسەر دارەکەوە نیشتەوە.

کۆلارەکە بە تەڵەکەوە گیرسایەوە.

٤- پرپیۆزیشنی (تا):

لێرەدا مەبەست ئەو (تا)یەیە کە لە شکڵی پرپیۆزیشدا بەکار دێت، نەک ئەو (تا)یەی کە وەک عطف وەیا شرط وەیا زەرفی زەمان بەکار دێت، بە نموونە:

تا ئێوە هاتن من نامەکەم نووسی (عطف).

تا ئێوە نەیەن نامە نانووسم (شرط).

هەتا تۆم ئاشنا بووی ئاشنا بوون (ظرف).

ئەم وشەیەی (تا) لە شێوەی پریپۆزیشنداچ بە سادەیی و چ بە لێکدراوی (تاکو، تاوەکو، هەتا، هەرتا، هەرتاوەکو...) واتای کۆتاییی ئەو شتە رادەگەیەنێ کە بۆی بەکار هاتووە، وەک:

تا رەواندز دەچم و دەگەڕێمەوە.

هەتا ئێرە بەیەکەوە بووین.

دوێنێ شەو هەتاکو بەیانی نووستم

٥- پریپۆزیشنی (وەک):

ئەم پریپۆزیشنە لە شێوەی سادە و لێکدراوی چەند جۆرێکی هەیە. شێوەی سادەی ئەمانەن (وەک، وەکی، وەکو)، شێوەی لێکدراویشی ئەمانەن (هەروەک، هەروەکی، هەروەکو)، بەڵام سادە بێ یا لێکدراو بۆ «تشبیە» بەکار دێت:

وەک قومری سەر باڵم شینە

کار و پیشەم هەر گرینە

هەر وەکوو قەوس قەزەح با دەست لە گەردەن دانیشین

تۆ بە سوخمەی ئاڵ و سەوز و من بە رەنگی زەردەوە

وەکو من بوو بە ظاهیری جاهیل

باطینەن شاعیرێکی زۆر کامیل

[ڕوونکردنەوە:

لە هەندێ شێوە ئاخاوتندا وشەی «وەک» جێگەی «ظرف»یش دەگرێ:

(وەک هاتم نیوەڕۆ بوو - بە واتای «کاتێک هاتم»).

دەمڕاستی لیژنە]

٦- پریپۆزیشنی (بێ):

ئەم پریپۆزیشنەش وێنەی سادەی هەیە کە (بێ)یە، وێنەی لێکدراویشی هەیە کە (بەبێ)یە، لە هەردوو وێنەیدا دژی پریپۆزیشنەکانی تر نەفیی پێوەندی دەکات لەناو رستەدا، بەم پێیە پێوەندیی ناو رستە هەرچییەک بێت وەک (وجوود، بەشداری،

هاوڕێیی...) یا هەر شتێکی تر بێت، پریپۆزیشنی (بێ) لە رستەدا لەو ناوە و ئاوەڵەکانی دوور دەخاتەوە وەیا دای دەبڕێ کە لەگەڵیاندا بەکار هاتووە وەک لەم نموونانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

١- بێ پارە گوزەران ناکەیت (لێرەدا نەفی وجوود دەکات).

٢- بە بێ تۆ ناچمە سەفەر (لێرەدا نەفیی هاوڕێیی دەکات).

٣- ئاهەنگی بێ مۆسیقا ناخۆشە (لێرەدا نەفیی بەشداربوونە).

٤- قوماشەکەم بێ مەقەست بڕی (لێرەدا نەفی واسطەیە کە وا پریپۆزیشنی «بە» داخوازیی دەکات).

ئەم پریپۆزیشنە لە هەندێ ناوچەدا کە خرایە پێش ناوی تایبەتی (اسم علم) و راناوی جوداوە دەنگی (ی) تێک بەستنی بە دوادا دێت:

بێی دارا سەفەر ناکەم.

دوێنێ بێی تۆ باغم ئاودا.

# ٨

## ئامرازی "عطف - Conjunction"

یەکەم – لە رووی زاراوەوە:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە لاپەڕە (٦٥)ی صرفی و نحوی کوردیدا وشەی (عطف)ی بۆ داناوە لە نموونەدا دەڵێت: (ئەحمەد و مەحموود و محەمەدیش چوون بۆ مەکتەب). لەم رستەیەدا دەردەکەوێت، کە تەنیا (و، ش)ی بە ئامرازی عطف داناوە.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردیدا لە لاپەڕە (١٥) لە باسی بەشەکانی ئاخاوتندا وشەی (لێکدەر)ی بەکار هێناوە، هەروەها لە لاپەڕە (١٩) بەندی (٧٠) ئەداتی (یەکخەر)یشی بەکار هێناوە و ئەم رستەیەی بە وێنە هێناوەتەوە: بەفر و باران پێکەوە بارین.

٣- مامۆستا کوردییف لە کتێبی رێزمانی کوردی کە ساڵی ١٩٧٠ لە چاپ دراوە لە لاپەڕە (١٢١)دا، وشەی (پەڤ گرێک)ی بۆ داناوە، وەکو:

گور و رۆڤی رێدا دچوون.

٤- نووری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٤٦)ی قواعدی زمانی کوردی ساڵی ١٩٥٨ ئامرازی (پێبەست)ی بۆ بەکار هێناوە، وەک:

ژیان و ئەرکی ناخۆشی، پەپوولەی ئارەزووی کوشتم
شەرابی جامی دڵداری، لە تافی لاویا رشتم

٥- مامۆستا رشید کورد لە کتێبەکەیدا «رێزمانا زمانێ کرمانجی» لاپەڕە (١١٢) ئامرازی (پێوەند)ی بەکار هێناوە.

٦- مامۆستا جگەرخوێن لە کتێبەکەیدا «آواو دەستوورا زمانێ کوردی» لاپەڕە (١٩٨) «تیپێ پێوەند»ی بەکار هێناوە.

٧- لە کتێبی قوتابخانە ئامادەییەکاندا «زمان و ئەدەبی کوردی»، ئامرازی

«بەستنەوە» بەکار هێنراوە.

٨- لە ڕێزمانی عەرەبیدا لە کۆنەوە (حروف العطف)یان بۆ بەکار هێناوە.

٩- لە ڕێزمانی فارسیدا، ر. ذوالنور لە کتێبی (دستور پارسی) وشەی (ربط و عطف)ی بۆ بەکار هێناوە.

١٠- لە ڕێزمانی ئینگلیزیشدا Conjunctionی بۆ بەکار هێنراوە.

بە دوا ئەم نمایشتەدا لیژنە ئەمەی تێبینی کرد کە پێشنیازی کۆڕی زانیاری کورد بۆ زاراوەی (العطف = Conjunction) لە نامێلکەی (زاراوەی هەمە چەشنە - لاپەڕە ٢٤) دوو وشەی (پەیوەستی و پێوەندی)یە.

بەڵام تا ئێستا بڕیاری دوایەکی لەسەر نەدراوە لەلایەن ئەنجوومەنی کۆڕەوە.

دووەم- لە ڕووی پێناسینەوە:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە صرف و نحوی کوردیدا، تەعریفی ئەم زاراوەیە ناکات، بەڵام ئەمانە بە ئامرازی «عطف» دادەنێت:

آ- ئامرازی (ش)، وەکو (من دەچم تۆش بچۆ) ئەگەر حرف معطوف بە (ش) حرف علە نەبوو لەپێش «ش»ەکەوە حرف (ی) زیاد دەکرێ، وەکو (عەلی هات لەپاشا ئەحمەدیش هات). وە ئەگەر حرفی علە بوو زیادکردنی حرف (ی) غلطە وەکو (ئاگرم کردەوە و دەرگاکەشم داخست، پەردەشم پێوە گرت)، «دەرگایشم، پەردەیشم» نابێت، چونکە شێوە دەگۆڕێ.

ب- ئامرازی (و)، وەکو (ئەحمەد و محموود و محەمەد چون بۆ مکتب). وە هم بۆ عطفە لەگەڵ معنای ملازمتا، یعنی بۆ جوێ نەبوونەوەی معطوف عەلیە لە معطوف، وەکو (ملا و مزگەوت، صوفی و خانقا)، وەهم بۆ عطفە لەگەڵ معنای تبعیدا؛ یعنی بۆ دوورخستنەوەی معطوف عەلیە لە معطوف، وەکو (من و قومارکردن، تۆ و درۆکردن) یعنی هەردووکمان دوورین.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستوورەکەیدا بەم شێوەیە تەعریفی دەکات (لاپەڕە - ١٩ - بەندی ٧٠):

ئەداتی «یەکخەر» ئەداتێکە کە دوو کلیمە یا دو کۆمەڵە کلیمە بەیەکەوە دەبەستێت، وەکو:

بەفر و باران پێکەوە بارین.

سەربانی ماڵی ئێوە و چنارەکەی مەکتەب لە دوورەوە دیارن.

من لێرەم بەڵام گوڵچین لە ماڵەوەیە.

لە جوملەی یەکەمدا ئەداتی یەکخەری (و) دوو ناوی، لە دووەمدا ئەداتی یەکخەری (و) دوو کۆمەڵە کلیمەی، لە سێیەمدا ئەداتی یەکخەری (بەڵام) دیسانەوە دوو کۆمەڵ کلیمەی پێکەوە نوساندووە.

٣- مامۆستا کوردییف لە کتێبەکەیدا «زمانێ کوردی» وەسفی عطفی کردووە و چی لە کتێبەکەیدا نووسراوە، لەلایەن مامۆستا «سادق بەهائەدین»ەوە کورتەیێکی خرایە سەر رێنووسی کوردی بەم جۆرەی خوارەوە:

پەڤگرێک:

ڤان خەبراڕا دبێژن پەڤگرێک (پەڤگرێدان) یێ کو ناڤا، فێلا و جوملا ب هەڤرا گرێ ددن.

زمانێ مەدا دوو کۆم پەڤگرێک هەنە:

آ- پەڤگرێکێد یەکتا.

ب- پەڤگرێکێد دوتا.

آ- پەڤگرێکێد یەکتا، وەک (شاگرت دچن **و** تێن - با هات باگەر **ژی** پێڕا هات - من گوت بکە، **لێ** تەنەکر - ئەز هاتم **کو** خەباتا خوە بقەدینم.

ب- پەڤگرێکێد دووتا وەک (مێر **ژی**، ژن **ژی** جڤاتێ بەرەڤ بوونە - ئەو شغول **نە** ئوسا **نە** چاوا دبێژی - وەلاتێ مەدا **نە** بێ خەباتکاری هەنە **نەژی** بەلەنگازی هەنە - جەم مە گەرمە **یانێ** سارە - لە جەم مە **هن** گەرمە **هن** سارە... وهتاد.

٤- نووری عەلی ئەمین لە کتێبەکەیدا «قواعدی زمانی کوردی» لاپەڕە ١٤٦ بەم جۆرە تەعریفی ئەدات عطف دەکات:

ئامرازی پێبەست واژەیەکە بۆ بەستنەوەی دوو واژە، یا دوو دەستەواژە، یا دوو رستە بەکار دەهێنرێت. ئەمانەی خوارەوەش بە ئامرازی عطف دادەنێت:

«و، وە، (بەڵام - بەڵان)، وەلێ، (تا - هەتا - تاکو - هەتاکو - هەتاوەکو)، (نەک - نەوەک - نەکو - نەوەکو)، کەی، (ئەگەر- گەر - مەر - مەگەر - ئەر)، (ئەرنا -

ئەگەنا – ئەگینا – دەنا)، نەء، (یا – یان – یاخو – یاخود – یاخوت)، (ئەنجا – ئینجا – ئنجا)، هەم، (ش، یش)، کە، کەچی، چونکە، (بەشکو – بەشکم، بەشکە، بەشکەم، بەڵکو – بەڵکم، بەڵکە)، (جگە، بێجگە).

– مامۆستا رشید کورد لە کتێبەکەیدا «رێزمانا زمانێ کرمانجی» بەم جۆرە تەعریفی دەکات:

پێوەند پرسەک نەگو هێزە کو پرسێن وەک هەڤ یان گوفتێن وەک هەڤ دپەڤەکەکێدا (رستە) ب هەڤ ددە گرێدان، ئەڤ ژی دو برِن پێوەندین دوروست، ئێن نە دوروست.

پێوەندا دوروست وەک: مەمو ئو بوزو هەڤالێن هەڤن.

ئەڤ پرسێن وەک: ئو، یان، پێوەندن چکو پارچە ئو چەنگێن ڤان هەردوو پەڤەکان گهاندنە هەڤ.

پێوەندێن دوروست ئەڤن: یان، لە، ئو، نە.. نە، ژی، وەک: رەمو نە دچە نە دمینە.

پێوەندا نە دروست: پرسەک نەگوهێزە، دوو گوفتان یان دوو پەڤەگان دگهینە هەڤ. وەک: قەنجو هەسپێ خوە فرووت، کو مهینەکە بکرِە.

پێوەندێن نە دوروست ئێن پێشدەتر ئەڤن: کو، ژبەرکو، چکو، ژبووکو، مینا، هەم.

٦– لە کتێبی «زمان و ئەدەبی کوردی» بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی لاپەرە (١٣) بەم جۆرە تەعریف کراوە:

«ئامرازی بەستنەوە ئەو وشانەن کە دوو وشە یا دوو رستە بەیەکەوە دەبەستن و هەریەکەیان بۆ مەبەست و واتایەک بەکار دەهێنرێت».

ئەم وشانەشی بە ئامرازی عطف داناوە (و، تا، بەلام، بەلان، نەک، ئەگەر، یا، هەم، ش، بەشکە، کە، کەچی، چونکە).

٧– مامۆستا جگەرخوێن لە کتێبی «آوائو دەستورا زمانی کوردی» لاپەرە ١٩٨ بەم جۆرە تەعریفی دەکات:

«تیپێ پێوەند ئەون کۆ بوان چەند گۆتنا یا چەند پەیڤا ب هەڤرِە ل پەی دن گرێدان و پەرچێ پاشی دکن هەمکارێ ئێ پێشی.»، وەک:

(و): زۆروستەم ل من دبارن.

(هەم): شیرین هەم ژیر و هەم جوانە.

(ژی – ش): فەرهاد چوو، شێرکۆ ژی چوو.

نەسرین هات، شێرینش هات.

٨- ر. ذوالنور لە کتێبی (دستور پارسی) لاپەڕە (٢٥٩)دا بەم جۆرە تەعریفی ئامرازی عطف دەکات:

حرفی ربط یا عطف حرفێکە، کەوا دوو کەلیمە، یا دوو عیبارەت، یا دوو جملە بەیەکەوە ربط دەدات. مشهورترین حەرفی ربطیش عیبارەتن لە:

١- حرفی ربطی بسیط:

٢- (و، اما، یا، تا، کە، پس، نە، چون، چە، هم، نیز، اگر، ولی، کجا).

حرفی ربطی مرکب: (چونکە، چندانکە، زیراکە، همیکە، تا اینکە، چنانکە، چنانچە، بلکە، همانکە، آنجاکە، اگرچە، اکنون کە، ازانکە، هرگاه، هروقت کە، پیش از آنکە، بس کە، بە شرط آنکە، تا بوکە، جایی کە، بی آنکە، درحالیکە).

٩- لە کتێبی

AN ENGLISH GRAMMAR BOOK
by
Evan C. Penglis

بەم جۆرە تەعریفی Conjunction دەکات:

"A Conjunction Joins One Word to Another Word, or One Sentence to Another Sentence"

بە دوا ئەم تەعریفەدا «کۆنجەنکشن» دەکا بە دوو بەشەوە:

Co - ordinating.

(1)

(2) Subordinating.

دوای تەعریفی دوو بەشەکان، لەگەڵ هەر بەشێکیاندا ئەو وشانەی نووسیووە کە بەری دەکەون.

دوای ئەم نمایشتە لیژنە کەوتە سەر هەڵبژاردنی زاراوەیەک بۆ ئەم بەشەی ئاخاوتن. بە پێی ئەمە کە لیژنە سەر بە کۆڕە و لە ئەنجامدا لێکۆڵینەوەکانی دەچێتەوە بەردەستی کۆڕ، لەبەر ئەمە وای پەسەند کرد ئەو زاراوەیەی بۆ دابنێ کە لەلایەن کۆڕەوە پێشنیار کراوە، ئەویش وشەی (پێوەندی) و (پێوەستی)یە.

لیژنە لەمانە وشەی (پێوەندی) هەڵبژارد، بە تایبەتی چونکە لەلایەن زۆربەی نووسەرانەوە بەکار دێت و خوێندەوارانی کوردیش پێی راهاتوون.

بەڵام نووری عەلی ئەمین وا پێشنیاز دەکات کە وشەی (پێوەندی) بۆ ئامرازی (تعلق) و وشەی (لێکدەر) بۆ ئامرازی عطف بەکار بهێنرێت.

مامۆستا مەسعوودیش ئەمەی خوارەوەی روون کردەوە و گوتی:

«هیچ رەخنەیەکم نییە لە بارەی رایەکەی (نووری عەلی ئەمین)ەوە، لەلایەن جوداکردنەوەی دەوری ئامرازی عطف و ئامرازی تعلق بۆ دەرخستنی جوداوازیی ئەو دەورە لە رێی زاراوەی رێکوپێکەوە. ئەوەی من بۆی دەچم، دەوری ئامرازی (تعلق) لە دروستکردنی پێوەندیی ناو جوملەدایە، لە حاڵێکدا ئامرازی (عطف) وشەکان، وەیا کەرتەکانی رستە دەخاتەوە سەریەک بێ ئەوە تێکەڵ بە دارشتنی مەعنای رستە ببێت، هەرچەند لە رستەشدا دەور ببینێت.

لیژنە تا ئێستا زاراوەیەکی کوردیی بۆ ئامرازی (تعلق) دانەناوە، جارێ (پریپۆزیشن)ی بەکار هێناوە، کە ئەمە بەلای منەوە لەگەڵ دەوری ئامرازەکانی تعلق رێک ناکەوێت، چونکە (پریپۆزیشن) وەک زاراوەی (پێش پرتک) تەنیا لە پێشەوە هاتنی ئامرازەکان رادەگەیەنێت. پوختەی قسەم لەم رووەوە ئەمەیە، دەبێت بۆ پریپۆزیشن زاراوەیەک بدۆزرێتەوە، کە دەوری وشەکە لەناو رستەدا دیار بخات. بە نیسبەت زاراوەی (پێوەندی)شەوە، بۆ عطف لەوە بەولاوە کە لەلایەن کۆڕەوە پەسەند کراوە، چ بەڵگەیەک نادۆزمەوە جگە لەو بەڵگە بێ هێزە، کە ئامرازەکان جۆرێک پێوەندی پێک دێنن.

بێ گومان کاتێک ئەم باسە خرایە بەرچاوی ئەنجومەنی کۆڕ موناقەشەی دووردرێژی لێ هەڵدەستێت.

دوای ئەم روونکردنەوانە لیژنە بڕیاری دا، جارێ زاراوەی (پێوەندی) بەکار بهێنێت.

به ئیستیقراش لەو نووسینانەی لەبەر دەستی لیژنەدایە دەردەکەوێ، ئەم وشانەی خوارەوە بە ئامرازی عطف (پێوەندی) دانراون:

یەکەم – لە کوردیدا:

١- و (ئو).

٢- وە.

٣- ش (یش)، ژی، ژی ژی.

٤- هەم.

٥- بەڵام (بەلآن).

٦- وەلێ (لێ).

٧- یا (یان، یانێ، یاخو، یاخود، یاخوت، وەیا).

٨- نەء.

٩- نەک (نەوەک، نەکو، نەوەکو).

١٠- تا (هەتا، تاکو، هەتاکو، هەتاوەکو).

١١- کەی (کەنگێ، کەنگی، کەنگێن).

١٢- کە.

١٣- چوون (چونکە).

١٤- گەر (ئەگەر، ئەر – ئەرنا، ئەگەنا، ئەگینا).

١٥- دەنا.

١٦- ئەنجا (ئینجا، ئەمجا).

١٧- بەشکو (بەشکم، بەشکە، بەشکەم....).

١٨- بەڵکو (بەڵکم، بەڵکی، بەڵکە....).

١٩- جگە (بێجگە، بەجگە، جگە...).

٢٠- هن .. هن.

٢١- ئۆسا (ئۆساژی).

٢٢- جارا (جارا ژی..).

٣٢- نه ... نەژی.

٢٤- چ قاس ... ئەوقاس.

٢٥- نه... نه.

٢٦- هەرکە.

٢٧- کەچی.

دووەم - لە زمانی فارسیدا:

پێشتر لیستەی وشەکان تۆمار کرا، بۆی بگەڕێوە.

سێیەم - لە زمانی ئینگلیزیدا:

Still, Yet, How ever, Nevertheless, Therefore, Then, Sothen, For, Else, Notonly, as well as, Butalso, After, Where, Because, That - 1- As... As, If, That - 2 -.

چوارەم - لە زمانی عەرەبیدا:

لە کتێبی (جامع الدروس العربية الجزء الثالث تأليف الشيخ مصطفي الغلايني) لاپەڕە ٢٤٥ لە ژێر سەرەباسی (المعطوف بالحرف)دا، ئەم وشانە بە ئامرازی عطف دانراون:

١- (و) جاء علي و خالد.

٢- (الفاء): جاء علي فسعيد.

٣- (حتي): يموت الناس حتى الانبياء.

٤- (ثم): جاء علي ثم سعيد.

٥- (أو): تزوج هنداً أو اختها، جالس العلماء أو الزهاد، اذهب الى دمشق أو دع ذلك، فلا تذهب اليوم.

٦- (أم): أعليّ في الدار أم خالد؟ (سواء عليهم أأنذرتهم أم لم تنذرهم)، (هل يستوي الأعمى والبصير؟ أم هل يستوي الظلمات والنور؟).

٧- (بل): ليقوم علي بل سعيد، ما قام سعيد بل خليل، لا يذهب سعيد بل خليل.

٨- (لكن): للاستدراك: ما مررت برجل طالح، لكن صالح.

٩- (لا): جاء سعيد لا خالد.

ليژنه دوای ئەم نمایشته هاته سەر لێکۆڵینەوە بۆ دۆزینەوەی تەعریفێک، کە هەر نەبێت ئەو وشانە بگرێتەوە لە لیستەی وشەکانی کوردیدا نووسراون، لەگەڵ ئەمەشدا لیژنە ئەو لایەنانەی لە بیر بوو، کە زمانەکانی تریش وەک کوردی وان بۆ ئەو تەعریفەی کە لەو زمانانەدا وشەکانی عطفی گرتووەتەوە؛ هەرچەند دەشێت ناوناوە بە پێی تایبەتی هەر زمانە جوداوازیی پەیدا بێت لەلایەن گرتنەوەی وشەیەک، وەیا چەند وشەیەک لە تەعریفەکەدا، کە لە تەعریفی زمانێکی تردا بۆ عطف ئەم وشەیە (وەیا ئەم چەند وشەیە) بەری نەکەوتووە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لیژنەی گێڕایەوە بۆ بەسەرکردنەوەی بەشی پریپۆزیشن، کە لە ساڵی رابووردودا لێی کۆڵرابووەوە، چونکە عطف و پریپۆزیشن لەوەدا دەگەنەوە یەک، کە دەوری (بەیەکتر بەستنەوە) دەبینن، تەنانەت وا هەیە یەک وشە لە زمانێکدا جارێکیان بە پریپۆزیشن و جارێکیان بە عطف دانراوە. لە ئاکامی لێکۆڵینەوە و بەراوردکردندا لیژنە هاتە سەر ئەو باوەڕە، کەوا بۆ دۆزینەوەی تەعریف پێویستە لەپێشەوە چۆنیەتی و مەبەستی وشەکانی عطف لە رستەدا بە نموونە روون بکاتەوە، دوای ئەوە بە پێی دەرخستی هەموو مەبەستە جۆرجۆرەکانی وشەی عطف، تەعریفێک دانێ کە هەموو وشەکان و مەبەستەکانیان بگرێتەوە:

١- و:

ئەم وشەیە لە ڕستەدا بەم جۆرانە بەکار دێت:

آ- بەیەکەوە بەستنێکی سادەی نێوان دوو وشە پێک دێنێت، وەکو

من و تۆ هاتین.

ئازاد و ئاسۆ بران.

من و قادر قوتابین.

ب- بەیەکەوە بەستێکی سادەی نێوان دوو دەستەواژە (فریز) پێک دێنێت، وەک:

مانگا دۆشین و قەزوان کرۆشتن نەگوتراوە.

دەفتەرێکی سەد پەڕەیی و قەڵەمێکی خۆنووسم کڕی.

جـ- بەیەکەوە بەستنێکی سادەی نێوان دوو رستە پێک دێنێت، وەک:

جووتیارەکە زەوییەکەی کێڵا و تۆوەکەی پێوە کرد.

پیاوەکە نوێژەکەی کرد و هەڵستا.

د- بەهار و جوانی.

تۆ و درۆ.

لەم نموونانەدا واوەکە سەرەڕای (عطف) واتایێکی تریشی بە دەستەوە داوە.. لە نموونەی یەکەمدا ئاشنایی و گونجانێک هەیە لە نێوان وشەی «بەهار» و وشەی «جوانی»دا، لە نموونەی دووەمدا دوورکەوتنەوەیەک هەیە لە نێوان وشەی (تۆ) و وشەی (درۆ)دا.

هـ- هەندێ جار دەبێتە یاریدەدەر بۆ دروستکردنی وشەیەک لە لێکدانی دوو وشە، وەک:

کشتوکاڵ (کشتوکێڵ)، تێروتەسەل، شتومەک، مشتومڕ، قنجوقیت، زرنگوزیت، چەوتوچوێڕ (چەوتوچوێڵ)، گەرموگوڕ، کتومت، وشکوبرنگ، تێکەڵوپێکەڵ (تێکەڵ پێکەڵ)، شڕوشاڵات (شڕوشاتاڵ)، کەلوپەل، جرتوفرت، خاووخلیسک، قەپوقیڕ (قەپوقڕ)، ڕێکوپێک، هاتوچۆ، گفتوگۆ، کتوپڕ، هەڵسوکەوت، گرموهۆڕ (هوڕ)، ساردوسڕ، شرتوشۆ، کوڵوکۆ، دەمودەست، سەروبەر، کەشوفش. ئەم وشانە لەلایەن واتای کەرتەکانیانەوە دابەش دەکرێن بە سێ بەشەوە:

١- ئەو وشانەی هەردوو کەرتەکانیان واتادارن، وەک:

زرنگوزیت

شۆخوشەنگ

سەروبەر

چەوتوچوێر

تێبینی (١):

وا هەیە وشەکان سووانێکیان بەسەردا هاتووە و جۆرە گۆڕانێک کەوتووەتە ڕواڵەتیانەوە، وەک:

هاتوچۆ (لە بنەڕەتدا - هاتن و چوون - بووە).

هەڵسوکەوت (لە بنەڕەتدا - هەڵسان و کەوتن - بووە).

٢- ئەو وشانەی یەک کەرتیان واتادارە، وەک:

شتومەک (وشەی - شت - واتادارە).

تەپوتۆز (وشەی - تۆز - واتادارە).

شڕوشاتاڵ (وشەی - شڕ - واتادارە).

٣- ئەو وشانەی هەردوو کەرتەکەیان بێ واتان، وەک:

جرپوجۆپان

خرتوپرت

تێبینی (٢):

مامۆستا سادق بهائەدین گوتی لەو وشە لێکدراوانەی کە بە ئامرازی (و)ی عەتف پێک هاتوون و لەمەوبەر لێیان دواین ئەم وشانە لە شێوەی بادیناندا نین:

کشتوکاڵ، شتومەک، زرنگوزیت، قنجوقیت، گورجوگۆڵ، وشکوبرنگ، شڕوشاڵات، کەلوپەل، جرتوفرت، قەپوقیڕ، خاووخلیسک، ڕێکوپێک، کوتوپڕ، هەڵسوکەوت، کوڵوکۆ، کەشوفش.. لەبری (تێروتەسەل)یش وشەی (تێروپڕ) بەکار دەهێنرێت.

و- وشەی (و)ی عەتف لەگەڵ وشەی (ش)ی عەتفدا بەکار دێت بۆ مەبەستی کۆکردنەوە و تەئکید، وەک:

منیش و تۆیش دوێنێ بەسەر کراینەوە.

میوەکە دەشکرم و دەشیخۆم.

دەشچم و پێشی دەڵێم.

تێبینی:

هەست بەوە دەکرێت تەئکیدەکە لە (ش)ەکەوە دێت، هەرچەند واهەیە وشەی (ش) بە تەنیا تەئکید نابەخشێت، وەک بڵێیت (منیش چووم).

ز- لە هەندێ بەکارهێناندا وشەی (و) بە سەریەکەوە بوون و ئیستمرار دەگەیەنێت، وەک:

دەشت و دەشت ڕۆیی.

ئاو و ئاو چوو.

ح- وشەی (و)ی عەتف لە هەندێ بەکارهێناندا جێگۆڕکێی بەردەوام لە دووبارەکردنەوەی وشەدا رادەگەیەنێت، وەک:

١- وەرزێرەکە دەشتاودەشت هات.

٢- ئەم کاغەزە دەستاودەست دەگاتە خاوەنی.

٣- شاخەوشاخ دەڕۆم بۆ کوێستان.

٤- دارا بانەوبان هاتە ماڵمان.

تێبینی:

لەم نموونانەدا وشەی (و) لەگەڵ بزوێنێکی تردا هاتووە، کە بە وشەی پێشەوەی دەبەستێتەوە. ئەگەر لە وشەکەدا بزوێنی (ا) هەبووە بزوێنەکە دەبێتە (ە)، وە ئەگەر لە وشەکەدا بزوێنی (ا) نەبوو بزوێنی (ا) دێت. ئەگەر کۆتاییی وشەش بزوێنی (ا) بوو تەنیا (و) بەدوایدا دێت.

ط- وشەی (و)ی عەتف وادەبێت لە رواڵەتدا وەک حاڵەتی پێشوو کە لە بەندی (جـ)دا روون کرایەوە بەکار دێت، بەڵام جێگۆڕکە ناگەیەنێت بگرە لە دووبارەکردنەوەی وشەوە ئیستیمرار و ئیتیجاه (بەریان) دەگەیەنێت، وەک:

دەماودەم کەوت.

پشتاوپشت گەڕایەوە.

تەنیشتاوتەنیشت بەلادا هات.

ی- وشەی (و)ی عەتف وادەبێت لە دروستکردنی فرێزی ئاوەڵکاری بەشدار دەبێت، وەک:

بارام و ئارام دەستەویەخەی یەکتربوون.

دەستەوئەژنۆ دامەنیشە.

قوتابییەکان چەنگاوبازی یەکتربوون.

ک- وشەی (و)ی عەتف وادەبێت لە رستەدا (اتجاه) نیشان دەدات وەک:

ماڵەکەمان پشتەو ڕۆژە.

کابرا بەرەو قیبلە دانیشت.

دارا رووەو چیا ڕۆیشت.

ئەم ڕێیە سەرەوژێر دەبێتەوە بۆ ناو دۆڵەکە.

[ڕوونکردنەوە:
وا دەزانم ئەم بەکارهێنانە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە بنەڕەتدا (پشت بەڕۆژ - پشت وەڕۆژ، بەرقیبلە - بەر وەقیبلە...) بووە.
دەمڕاستی لیژنە]

ل- وشەی (و)ی عەتف وادەبێت هەندێ جار کات پیشان دەدات، وەک:

دەمەوبەهار دەچین بۆ سەیران.

دانیشتبووین، وەختەوناو دارا گەیشتەجێ.

م- وشەی (و)ی عطف وادەبێت لەگەڵ (نە)ی عطف کۆ دەبنەوە و سەرەڕای دەوری عەتف، دەورێکی تریش دەبینن، ئەویش ئەوەیە کە بەیەکەوە نەفی دەخەنە سەر دوو شت؛ وەیا پێوەندیی نێوان دوو لایەن نەفی دەکەن، وەک:

نەقادر و نەبارام هاتن.

نەقادر خواردی نەبارام.

قادر نەدەخوات و نەدەڕوات.

نەمن هاتم و نەتۆ هاتیت.

نەدەمنووسی و نەدەمخوێند.

نەبنووسم و نەبخوێنمەوە.

نەبچۆ و نەبخۆ.

لەم نموونانەدا دەردەکەوێت، کە ئەم (نە)یەی نەفییە کار ناکاتە سەر ڕواڵەتی وشە، بەنموونە ئەگەر (نە)ی نەفیی عادەتی لە ڕستەدا بەکار بهێنین دەبوو لە جێگەی ئەو ڕستانەی سەرەوەدا ئەمانەی خوارەوە بێن:

نەمدەنووسی و نەمدەخوێندەوە.

نەمنوسیبوو نەمخوێندبووەوە.

نەنووسیم و نەخوێندمەوە.

من و تۆ نەهاتین.

قادر و بارام نەهاتن.

قادر ناخوات و ناڕوات.

هەرچەند لە بنەڕەتدا ئەم جۆرە عەتفە بۆ نەفیی دوو شتە، بەڵام (تطور)ی زمان وای کردووە بۆ زیاتر لە دوانیش بەکار بێت، وەک:

نەدەخۆم و نەدەڕۆم و نەدادەنیشم....

ن- جاری وا هەیە لەگەڵ (و) عەتفدا، (نە)ی عەتف و (ش)ی عەتفیش بەکار دێت لە ڕستەدا، وەک:

نەمنیش و نەتۆیش چووینە حەج.

نەدەشخۆین و نە دەشڕۆین.

بە کورتی چی لە بارەی (نە) و (و)ەوە گوتراوە لێرەدا دووبارە دەبێتەوە.

س- هەندێ جار وادەبێت (و)ی عەتف لە نێوان دوو ڕستەدا دێت، جگە لە ئەرکی خۆی کە (عطف)ە، ئەو لایەنەش کە «فاصیلە» نییە لە نێوان ڕوودانی دوو کاری ڕستەدا رادەگەیەنێت، وەک:

هەرهات و هەرای نایەوە.

نوست و هەڵنەستایەوە.

باری خۆت بگرە باجی خۆت بسێنە.

تێبینی:

ئەم (و)ی عەتفە لە کوردیدا دوو حاڵەتی هەیە:

حاڵەتی یەکەم: کە بە دوا بزوێندا بێت خۆی دەبێتە کۆنسنانتێکی وەستاو، وەک: (سەرما و گەرما، ئازا و مەرد، دزی و فزی، دێ و شار، چەقۆ و هەسان) بەڵام کە بەدوا واوی بزوێنی تیژدا هات، واوەکەی عەتف دەبێت کورتە بزوێنێکی پێ بدرێت بۆ ئەوەی دیار بکەوێت، وەک کە بمانەوێت بە دوا وشەی «بەڕوو»دا واوی عەتف بێت، واوە عەتفەکە بزوێنێکی وەک (ضمە)ی عەرەبی بدرێتێ، کە ئەگەر بەڕێنووسی عادەتی بینووسین بەم شکڵە دەنووسرێت (بەڕوو وو مازوو) بەڵام نووسەران لە حاڵەتی وەهادا لە جیاتی زیادکردنی کورتە بزوێنی واو بە دوای واوی عەتفدا تەنیا واوێک دەنووسن لە وشەی پێش خۆی دوور دەخەنەوە، وەک:

(دوو و سێ، دەزوو و دەرزی).

حاڵەتی دووەم: کە بە دوا کۆنسنانتدا دێت بۆ خۆی دەبێتە بزوێن، وەک:

بەرد و دار

هەنار و سێو

گورگ و مەڕ

٢- (وە):

ئەم ئامرازی عەتفە، کە لەلایەن بەشێکی زۆر لە نووسەرانی کوردەوە بەکار دێت بە تایبەتی لە سەرەتای رستەوە، واش دەبێت لە نێوان دوو رستە، یان دوو وشەدا، وا پێ دەچێ کوردی نەبێت و (واو العطف)ەکەی عەرەبی بێت، کە لە ئەنجامی سەقافەتی عەرەبییەوە کەوتووەتە نێو نووسینی هەندێ لە نووسەرانی کوردەوە، لەبەر ئەوە لیژنە پێویستی نەدیت لێی بکۆڵێتەوە، سەرەڕای لێ نەکۆڵینەوە داواش دەکات لە نووسەران واز لە بەکارهێنانی ئەم ئامرازە بهێنن.

٣- (هەم):

ئەم ئامراز وەک لە بەکارهێنانی جۆر جۆردا دیار دەکەوێت، واتایێکی نزیک بە واتای دوو ئامرازی عەتفی (و) و (ش)ی هەیە وەک لەم میسالەدا دەردەکەوێت:

دارا هەم ئامۆزامە، هەم پووررزانە.

ئەم رستەیە وەک ئەوەیە کە بگوترێت (دارا ئامۆزاشمە و پووررزاشمە) لە هەردوو رستەدا سەرەڕای عەتفی سادە، تێک بەسترانێکی نێوان هەردوو رستەش بەدەستەوە دراوە. بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە وشەی (هەم) لە بەکارهێناندا بە جۆرێکی سەربەخۆ دەچێتە رستەوە لە حاڵێکدا ئامرازی عەتفی (ش) رواڵەتی سەربەخۆی نییە، وشەی (هەم) پتر تەئکید دەبەخشێت، لەلایەکی تریشەوە هاتنی (هەم) لە سەرەتای رستەوە جۆرێک گرنگی پێ دەدات، کەوا نە لە (وە)دا هەیە و نە لە (ش)دا.

ئەم رستانەی خوارەوەش هەندێ جۆری تری بەکارهێنانی (هەم) دەردەخەن، کە جارێکی تریش خزمایەتیی ئەو لەگەڵ دوو ئامرازە عەتفی (و) و (ش) دیار دەخات:

١- دارا هەم ئامۆزامە و هەم پوورزامە.

٢- دارا هەم ئامۆزاشمە هەم پوورزاشمە.

٣- دارا هەم ئامۆزاشمە و هەم پوورزاشمە.

لەم رستانەدا دەردەکەوێت چۆن دەشێت (هەم) بە تەنیا بێتە ناو رستەوە، وەیا لەگەڵ تەنیا وشەی (ش)، یاخود تەنیا وشەی (و) کۆ ببێتەوە، هەروەک دەشێت هەرسێ ئامرازەکە لە رستەدا بەیەکەوە بێن. دیاریشە تاکو ژمارەی ئامرازەکان لەیەک رستەدا پتر بێت، پتر تەئکید دەبەخشن.

هەندێ جار ئامرازی (هەم)ی عطف لەگەڵ ئامرازی (دیسان)ی عطف یەک دەگرن، پێکەوە وشەیێکی عطفی لێکدراو پێک دەهێنن و دەبنە (هەمدیسان)؛ لە شێوەی ئاخاوتنی سلێمانی دەبێتە (هەمیسان)، وەک:

هەمیسان هاتەوە سەر بای بەرەکۆن (پەندی پێشینان).

هەراکە دوای کوژانەوەی، هەمیسان هەڵگیرسایەوە.

جاری واش دەبێت ئامرازی (هەمیسان)ی لێکدراو، پاشگری (ەوە) دەکرێتەوە پاشکۆی، وەک:

هەمیسانەوە دەستی پێ کردەوە.

٤- (ش، یش - ژی، ژی ژی):

ئەم ئامرازە لەلایەن نووسەرانی کوردەوە بەم شێوەیە باس کراوە:

١- مامۆستا سعید سدقی لەلاپەرە (٦٤)ی صرف و نەحوی کوردیدا دەڵێت:

«ش» بۆ عطفە، وەکو (من، دەچم، تۆش بچۆ). ئەگەر ئاخری (معطوف) بە (ش)، حرفی ئیملا نەبوو لەپێش «ش»ەکەوە حرفی (ی) زیاد دەکرێ وەکو (عەلی هات لەپاشا ئەحمەدیش). وە ئەگەر حرفی ئیملا نەبوو زیادکردنی حرفی (ی) غلطە، وەکو (آگرم کردەوە و دەرگاشم داخست، پەردەشم پێوە گرت)، دەرگایشم، پەردەیشم، نابێ چونکە شێوە دەگۆڕێ.

٢- نووری عەلی ئەمین لە لاپەرە (١٥٠)ی بەرگی دووەمی رێزمانەکەی هەر ئەوەندە دەڵێت: (ش، یش) ئامرازی عطفن، وەک:

ئەی «ئەسیری» هێندە عەشقی میللەتی کوردت هەیە

بشمری لام وایە، قەبری گردی سەیوانت ئەوێ

٣- لە کتێبی «زمان و ئەدەبی» پۆلی شەشەمی ئامادەیی چاپی دووەم لاپەڕە (١٥)دا لە وشەی (ش) بەم جۆرە دەدوێت:

دەفتەرەکانم ریز کرد، لە پاشا کتێبەکانیشم ڕێک خست.

من دەچم تۆش بچۆ.

ئامرازی (ش) کە لەو رستانەدا بەکار هاتووە، هەروەکو «و» بۆ بەستن بەکار هاتووە، ئەگەر وشەکەی پێشی بە دەنگی بزوێن دوایی هاتبوو بە شێوەی «ش» یا «یش» دێت.

٤- مامۆستا تۆفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردیدا بەرگی یەکەم لە بارەی وشەی (ش)ی عطفەوە نەدواوە.

٥- کوردییێف لە کتێبەکەیدا لە بارەی وشەی (ش)ی عەتفەوە، کە «ژی» دادەنێت، تەنیا بەمیسال لێی دواوە.

٦- رەشید کوردیش لە کتێبەکەیدا وەک کوردییێف تەنیا لە میسالدا لە وشەی «ژی» دواوە.

٧- جگەرخوێنیش دیسان هەر بە میسال لە وشەی (ژی)ی عەتف دواوە.

لیژنە لەپێشەوە لە ڕواڵەتی ئەم ئامرازە[1] کۆڵیوەتەوە، لە ئەنجامدا ئەم خاڵانەی خوارەوەی بۆ دەرکەوت:

٢- بە زۆری بە دوای بزوێندا لە شێوەی «ش»دا بەکار دێت، بەڵام هەندێ کەس، یاخود هەندێ لەهجە، وەیاخود ناوەناوە شێوەی «یش» دەپارێزێت، وەک:

آ- شێوە بەکارهێنانی «ش»:

چووشم و نووسیشم.

دەشڕۆم و دەشنووسم.

کێلاشم و درووشمەوە.

(١) سوود لە وتارەکەی مامۆستا (شوکور مستەفا) وەرگیراوە کە لە گۆڤاری (بەیان)دا بلاو کراوەتەوە.

ب- شێوە بەکارهێنانی «یش»:

ئەمەیش هەر کاری ئەوە.

قاوەیش بەقەد چایی دەخورێتەوە.

کابرایش لە خۆمانە.

لەمەوە وا دەردەکەوێت ئەم ئامرازە لە بنەڕەتدا «یش» بووبێت، بەلام بەپێی بەرەوپێشچوون و ئاسانبوونی ئاخاوتن لە حالێکدا ئامرازەکە کەوتە دوای بزوێن، بە زۆری روالەتی «ش» بەکار دێت. لەگەل ئەمەشدا وەک لەو نموونانەی هێنرانەوە دیار کەوت، تا ئێستاش روالەتی (یش) دەشێت بە دوا بزوێندا بێت.

٣- بەکارهێنانی ئەم ئامرازە بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

أ-

وادەبێت بە تەنیا بەکار دێت، لێرەشدا دوو جۆرە بەکارهێنان دێتە بەرچاو:

یەکەم - لە تاکە رستەدا بەکار دێت و رستەی (معطوف عەلیە) بە بیردا دێنێت، بێ ئەوەی بېێژرێت، وەک:

منیش یەکێکم لە ئێوە.

تۆیش یەکێکیت لە هونەرمەندان.

قالۆنچەش بالدارە.

لەم رستانەدا ئامرازی (ش - یش) وا دەکات، بە بیری بیسەردا بێت، کە وا پێشتر باسی شتێک کرابێت و ئەم گوتانەیان بە دوادا هاتبێت.

دووەم - دوو رستەی بێژراو بەیەکەوە دەبەستێتەوە، وەک:

تۆ دابەزە، منیش دادەبەزم.

ئەو نەهات، منیش رۆیشتم.

ئەحمەد بەرەومال بووەوە، ئازادیش تووتنەکەی ئاو دەدات.

سێیەم - وا دەبێت ئامرازی (یش) لە هەموو رستە بێژراوەکاندا بە تەنیایی بەکار دێت، وەک:

بەهاریش هات، هاوینیش رۆیی، پایزیش دێت.

سەریشی تیاچوو، مالیشی....

رێکەوت وابوو، ئەحمەدیش ژنی هێنا، فەرەجیش چوو بۆ حەج، منیش هیچم بە هیچ نەکرد.

ب-

وادەبێت ئەم ئامرازە (ش، یش) لەگەڵ ئامرازی تری عەتفدا بەکار دێت:

یەک - لەگەڵ ئامرازی (و)ی عەتفدا، وەک:

١

دار و بەردیش لە بەهاردا دەگەشێتەوە.

ئێمەش دەمرین و دەبینە خاکی سەرەڕێ.

لەم رستانەدا دەردەکەوێت، کەوا دەشێت ئامرازی (یش) پێش بکەوێت، هەروەک دەشێت ئامرازی (و) پێش بکەوێت لە رستەدا.

٢

حاجی قادریش و بابەتاهیریش شاعیرن.

دارا دەشخوات و دەشخواتەوە.

منیش و داراش دەشخۆین و دەشخۆینەوە.

لەم رستانە و ئەوانی پێشووتردا جۆری بەکارهاتنی ئامرازی (ش) لەگەڵ (و) کە هەرجارە یەکێکیان پێش دەکەوێت، وەیان لە هەریەکەیان جووتێک، وەیا زیاتر دێت، دیار دەکەوێت.

بێ گومان لەم جۆرە بەکارهێنانە هی تریش هەن کە ئەوانیش لە پەراوێزی ئەم نموونانە دەرناچن لە رووی جۆری بەکارهێنانیانەوە

دوو - لەگەڵ ئامرازی (هەم)ی عەتفدا:

هەروەک دەشێت ئامرازی (هەم)ی عەتف لە رستەدا بکەوێتە پێش ئامرازی (یش)ەوە، هەروەها دەشێت بە پێی داخوازیی ئاخاوتن ئامرازی (یش) لەپێشەوە بێت. لێرەدا بۆ مەبەستی روونکردنەوە ئەو رستانە دەهێنینەوە، کە لەمەوبەر لە باسی ئامرازی (هەم)دا بە نموونە هێنراوەتەوە:

١- دارا هەم ئامۆزاشمە، هەم پوورزاشمە.

٢- دارا هەم ئامۆزاشمە و هەم پوورزاشمە.

بە دوای ئەم رستانەدا ئێستاکە رستە نموونەی پێشکەوتنی ئامرازی (یش) دێنینەوە لە ئاخاوتندا:

١- داراش هەم ئامۆزامە و هەم پوورزامە.

٢- داراش هەم ئامۆزاشمە، هەم پوورزاشمە.

لە دوو رستەی پێشووتردا هاتنی ئامرازی (یش) بەدوا وشەی «ئامۆزا»دا تەعەدودی پێوەندیی خزمایەتی دەبەخشێت، بەڵام هاتنی بە دوا ناوی «دارا»دا تەعەدودی خاوەن پێوەندییەکە، واتە شەخسەکە و خزمەکە دەبەخشێت.

لە هەموو رستەکاندا چی لەمەوپێش و چی ئەم جارە بە نموونە هاتوون، دەتوانرێت کورتکردنەوە بەکار بێت و بگوترێت:

١- دارا هەم ئامۆزامە و هەم پوورزا.

٢- دارا هەم ئامۆزاشمە، هەم پوورزا (هەم پوورزاش).

٣- دارا هەم ئامۆزاشمە و هەم پوورزا (هەم پوورزاش).

٤- داراش هەم ئامۆزامە و هەم پوورزا.

٥- داراش هەم ئامۆزاشمە، هەم پوورزا (هەم پوورزاش).

بە ئیستیقرا دەشێت نموونەی تریش وەک ئەمانە بدۆزرێتەوە بۆ جۆری بەکارهێنانی ئامرازی (یش)، چ بە تەنیا چ لەگەڵ ئامرازی عەتفی (هەم)، (و)دا.

سێ - لەگەڵ ئامرازی (کە)ی عەتفدا:

-١

١- کە منیش دەرچووم دەبمە کاربەدەست.

٢- کە هەوڵ بدەیت، دەگەیتە ئامانج.

٣- منیش کە هاتم، تۆ جارێ نەهاتبوویت.

لەم رستانەدا ئامرازی (یش) لەگەڵ ئامرازی (کە)دا هاتووە، بەڵام لە یەکەم و سێیەمدا سەرەڕای (عطف) بوونی، ئاوەڵکاریشە کەچی لە رستەی دووەمدا ئامرازی مەرجە، سەرەڕای ئەوەی کە دەوری عەتف دەبینێت.

-٢

١- كە تۆش سەرۆکیت، خزمەت بکە.

٢- ئای کە دارتاشیش سەربەگۆبەنە.

٣- «کە تۆی قیبلە دەمت سا بێنە قوربان».

لەم رستانەدا ئامرازی (کە) ئامرازێکی عەتفی تەحقیقییە؛ لە رستەی یەکەمدا بەهاوڕێتیی (ش) هاتووە و دوو رستەی پێکەوە بەستووە. لە رستەی دووەمدا لە تاکە جوملەدا لەگەڵ ئامرازی (ش) هاتووە، بەڵام لە مەعنادا رستەکەی بە رستەیێکی خەیاڵییەوە بەستووەتەوە. لە رستەی سێیەمدا بە تەنیا هاتووە بۆ تەحقیقی سادە.

چوار - لەگەڵ ئامرازی (بەڵام)ی عەتف:

ئازاد نووسەرە بەڵام گۆرانیبێژیشە.

ئازاد نووسەرە بەڵام داراش نووسەرە.

داراش نەخوێندەوارە، بەڵام هەم بوێژیشە و هەم وێنەگریشە.

فەرهاد باش دەست دەداتە کار، بەڵام ناشیباتە سەر.

لەم رستانەدا جۆری بەکارهێنانی ئامرازی (یش) لەگەڵ ئامرازی (بەڵام) چ بە تەنیا و چ بەپاڵ ئامرازی عەتفی تردا بێت، دێنە بەرچاو، بێ گومان بە خەریکبوون و بە دوادا گەڕان و زۆر جۆری تری بەکارهێنانی ئەم جووتە ئەمرازە دەدۆزرێتەوە چونکە هەردووکیان ئەمرازی بەهێزوپێزن و دەتوانن لە زۆر مەیداندا دەور ببینن.

پێنج - لەگەڵ ئامرازی (یا)ی عەتف و وێنەکانی:

١- یا تۆش وەرە، یا منیش نایەم.

٢- یا دانیشە، یانیش برۆ.

٣- یان دەستی مەدەرێ، یانیش بیبەرەسەر.

لەم رستانەدا شێوەی بەکارهێنانی ئەم دوو ئامرازە بەیەکەوە دەردەکەوێت، هەر لەوانیشدا دەزانرێت:

١- ئامرازی (یا) لە بنەڕەتدا «یان»ە و نوونەکەی سوواوە.

٢- له رستەدا دووبارە دەبێتەوە.

شەش - ئامرازی (نەء):

١- ئەحمەدیش هات، نەء بارامیش هات.

٢- هەنجیرەکەشم کڕی، نەء ترێیەکەش.

لە بەکارهێنانی جووتە ئامرازی عەتفی (نەء) و (یش) پێکەوە، دوو تێبینی دەکرێت:

١- ئامرازی (نەء) بۆ راستکردنەوەی هەڵەیە.

٢- رستەی یەکەم کە هەڵەیە دەبێت ئامرازی (یش)ی تێدا بووبێت، بۆ ئەوە بتوانرێت لە رستەی دووەمدا، کە راستە و جێگری رستە هەڵەکەیە، ئامرازی (نەء) بەکار بێت.

حەوتەم - لەگەڵ ئامرازی (نەک)ی نەفیدا:

برزووش هات نەک وریاش.

ئەم رستەیە دەلالەتی هەیە کە وا لەپێشەوە هاتنی کەسێک، وەیا چەند کەسێک باس کراوە، دواتر بە بیردا هاتووە، کە وریاش هاتبێت بەڵام دەردەکەوێت «وریا» نەهاتووە بگرە ئەوەی هاتووە «برزوو» بووە. لەمەوە دەردەکەوێت هاتنی ئامرازی (یش) لەگەڵ ئامرازی (نەک) لە حاڵی نەفیدا دوو مەرجی پێویستە:

١- هەڵەیەک راست کرابێتەوە.

٢- لە رستەی هەڵەدا ئامرازی «یش» هەبووبێت.

کە بێین و بەراوردی بەکارهێنانی ئەم ئامرازە بکەین لەگەڵ بەکارهێنانی (نەء)دا دەردەکەوێت، کە وا لێرەدا رستەی راست لەپێشەوە دێت و رستەی هەڵە دەکەوێتە دوای ئامرازی (نەک)ەوە، بە پێچەوانەی دەوری ئامرازی (نەء) کە دیتمان رستەی هەڵەی خستە پێش خۆیەوە.

هەشت - لەگەڵ ئامرازی (نەک - نەوەک)ی نەفی و تەعەلیلدا:

ناوی دارا مەهێنە نەوەک ئەویش پێوە بێت.

ئەوەندەش مەکەرە سەری نەوەکو بێزار بێت.

سێوەکانیش بخۆ نەوەکو ئەوانیش بڕزن.

منیش ئەمەم گوت نەوەک گلەییم لێ بکرێت.

لەم رستانەدا ئامرازی (نەک)' و (نەوەک)، یەک واتا دەبەخشن، هەردووکیشیان لە هێنانەوەی مەبەستی نەفی، تەعەلیلیش بە دەستەوە دەدەن و بەزۆری رستەی تەعەلیلی دەکەوێتە دوای ئامرازەکانەوە. ئەمە دەستووری بنچینیە بەڵام دەشێ رستە تەعلیلییەکان پێش بخرێن و بگوترێت:

نەک من لەبیرم بچێت، تۆش خەبەرێکی لێ بگێڕەوە.

وەک دەبینین لەم حاڵەتشدا رستەی تەعەلیلی بە دوای ئامرازی «نەک»دا، دێت.

تێبینی:

ئەم دوو ئامرازە «نەک» و «نەوەک» لە شێوە ئاخاوتنەکانی کوردیدا، رواڵەتی تریشیان هەیە، وەک «نەوەکو، نەوەکی، نەوەکە، نەکو، نەوەکونی، نەوەکینێ،...».

نۆ – لەگەڵ ئامرازی (تا)ی عەتفدا:

١- تا بەهاریش بەسەرچوو، کانییەکە وشک نەبوو.

٢- دەرسەکە بخوێنەرەوە، تا دەشتوانیت لێی ورد بەرەوە.

٣- تا سەری شاخەکەش چووم، کەوم نەدی.

٤- تا کۆتایی ساڵیش کۆشا، دەریش نەچوو.

ئەم رستانە جۆری بەکارهێنانی جووتە ئامرازی «تا» و «ش» بەیەکەوە دەردەخەن، دیارە ئیستیقرا جۆری بەکارهێنانی تریشیان، کە هەبێت لە ئاخاوتندا دەردەخات. پێویستە بزانرێت ئەم ئامرازەی «تا» چەند رواڵەتێکی تریشی هەیە هەموویان یەک واتان، دەتوانرێت یەکێکیان لە جێگەی ئەوانی تر بەکار بێت، رواڵەتەکان ئەمانەن: «تاکو، تاوەکو، هەتا، هەتاکو، هەتاوەکو، هەتاوەکی، هەتاوەکینێ».

ده - لەگەڵ ئامرازی (کەی) عەتفدا:

١- کەی من هاتم، تۆش وەرە.

٢- کەی منیش هاتم، تۆش وەرە.

لەم رستانەدا دەردەکەوێت ئامرازی (کەی) سەرەڕای واتای (عطف)، واتای مەرجیش دەگەیەنێت، هەر لەمەیشەوە دەردەکەوێت، کاتێک وشەی (کەی) بۆ پرسیار بەکار هات دەوری عەتف نابینێت، وەک:

کەی گوڵەکانت رواند؟

کەی هاتیتەوە؟

یازدە - لەگەڵ ئامرازی (چونکە)ی عەتفدا:

١- چونکە ئازادیش قوتابییە، بۆیە ژمارەیان دەگاتە چل.

٢- لێت دەبوورم، چونکە تۆش برادەریت.

٣- لێتیش ببوورم، سوودی نییە، چونکە قانون رێی لێ بووردن نادات.

٤- بشتانبینم، ناتان دوێنم چونکە لێتان تۆراوم.

٥- چونکە برسییە، دەریشی بکەیت، هەر دێتەوە.

٦- چونکە منیش ڕۆیشتم، دراوسێکەم ڕۆیشت.

٧- تۆش وەرە چونکە منیش دێم.

٨- بە بایزیش و بە ئەحمەدیش چار ناکرێت چونکە کار لە کار ترازاوە.

لەم رستانەدا دەردەکەوێت، کە ئامرازی (یش) لەگەڵ (چونکە)دا چۆن بەیەکەوە دێن، جاری ئەوتۆ هەیە لە رستەکەدا ئامرازی (چونکە) پێش دەکەوێت و ئامرازی (یش)ی بە دوادا دێت، وەیا بەپێچەوانەوە. بەڵام ئەم پێش و پاشییە بە پێی داخوازیی رستە دەبێت، کە مەبەستی بێژەر دەردەخات.

لە زارەکانی کوردیدا ئامرازی «چونکە» بەم شێوانەش بەکار دێن (چونکو، چونکی، چونکینێ، چکو، چوکنێ...)، هەروەها لە کرمانجیی سەروودا ئامرازی (نێ) و (پانێ) بە واتای «چونکە» بەکار دەهێنرێت، وەک:

سەردار نەهات، نێ کاری هەبوو.

تە نەگوتە من، پانێ ژبیرا من چوو.

دوازده – لەگەڵ ئامرازی (ئەگەر)ی عەتفدا:

١- ئەگەر ناتەوایشی تێدا بێت، هەر بە سوودە.

٢- ئەگەر ئەو بێت، منیش دێم.

٣- ئەگەر بشیکوژێت، لە قسەی خۆی نایەتە خوارەوە.

٤- ئەگەر گوڵ نیت، دڕکیش مەبە.

ئەم رستانە نموونەی بەکارهێنانی جووتە ئامرازی (ئەگەر) و (یش) بەیەکەوە پێشان دەدەن و هەرجارەش بە پێی مەبەست پێش و پاش دەکەون.

هەروەها ئەم شێوانەشی لە زارەکانی کوردیدا بەکار دێن (گەر، ئەگەرکو، ئەگەرەکونێ، ئەگەرەکینێ، ئەر...)، لە کرمانجیی سەروودا (هەکو، هەکە، هەکی...) بە واتای (ئەگەر) لە رستەدا بەکار دەهێرێت.

سێزدە – لەگەڵ ئامرازی (ئەنجا)ی عەتفدا:

من خەوتم، ئەنجا ئەویش خەوت.

تۆ باسەکەت کردەوە، ئەنجا ئەویش کەوتە گفتوگۆ.

بارانیش باری، ئەنجا ئەو بەڕێ کەوت.

سوێندیشت بۆ بخوات، ئەنجا نابێت باوەڕی پێ بکەیت.

ئەمانەش نموونەی بەکارهێنانی جووتە ئامرازی (ئەنجا) و (یش) پێکەوە دەردەخەن، هەرجارەش بە پێی مەبەست یەکێکیان پێش ئەوی تریان دەکەوێت.

وادەبێت ئەم ئامرازە بە تەنیا، یا لەگەڵ «یش» لە تاکە رستەدا دێت، واتە بە رواڵەت دوو رستەی بەیەکەوە نەبەستووەتەوە، بەڵام لە راستیدا رستەیەکی تێ بردراو و سوواو هەیە، کە لەم شێوە بەکارهێنانە رەوانبێژییەدا پێویست نییە دەرکەوێت، وەک:

ئەنجا ئەمەش حاڵە؟

ئەنجا ئەمە حاڵە؟

ئەم ئامرازە لە زارەکانی کوردیدا شێوەی تریشی هەیە، وەک (ئەمجا، ئیمجا، ئینجا، ئەمجار، ئەوجا، ئەوجار، ئەوجاوەکو، ئەو جاوەکی، ئەوجاوەکونێ،

ئەوجاوەکینێ). ئاشکرایە لە بنەڕەتدا وشەکە لە (ئەمجار)ەوە هاتووە.

لە زاری کرمانجیی سەروودا لە بری (ئەنجا) ئامرازی (ڤێجا، ڤێجار)، هەروەها (وێجا، وێجار)یش بەکار دەهێنرێت.

چواردە - لەگەڵ ئامرازی (بەشکو)ی عەتفدا:

ئەم دەرمانانەش دەخۆم، بەشکو پێی چاک ببمەوە.

دەستم بگرە، بەشکو منیش بتوانم سەربکەوم.

ئەم گوللەیەش دەتەقێنم، بەشکو بەرازێکی تریش دەکوژم.

ئەم رستانە بوون بۆ جۆری بەکارهێنانی جووتە ئامرازی (بەشکو) و (یش) پێکەوە لە رستەدا، ئەمانەش وێنەکانی تری (بەشکو)ن لە زارەکانی کوردیدا (بەشکە، بەشکی، بەشکم، بەشکمی...).

ئامرازی (بەڵکو)، هاوواتای (بەشکو)ە، دەتوانرێت لە رستەدا جێگر و بریتیی ئەو بێت، ئەویش وەک (بەشکو) چەند وێنەیەکی تری هەیە لە ئاخاوتندا، کە ئەمانەن خوارەوەن:

(بەڵکە، بەڵکی، بەڵکم، بەڵکمێ....).

پازدە - لەگەڵ ئامرازی (جگە)ی عەتفدا:

١- جگە لە تۆ داراش هات.

٢- داراش هات جگە لە تۆ

٣- کرێی خانووەکەشت وەرگرت جگە لە هی دووکانەکەش.

لەم رستانەدا جۆری بەیەکەوە هاتنی جووتە ئامرازی (جگە) و (یش) لە ئاخاوتندا دەردەکەوێت. ئەوەی سەرنج رادەکێشێت لەو نموونانەدا ئەوەیە کە ئامرازی (جگە)ی عەتف رستە و دەستەواژەی بەیەکەوە بە ستووەتەوە. لێرە بەولاوە لە چەند رستەیەکدا نموونەی بەستنەوەی شارستە و پارستە بەیەکەوە لە رستەدا بە هۆی ئامرازی (جگە)وە نیشان دەدەین:

جگە لەوەی دوێنێ کردت، ئەمەی ئەمڕۆشت کارێکی باش بوو.

جگە لەوەی کە دەزانم نایەیتە لام، دەزانم کاغەزیشم بۆ نانووسیت.

لەم نموونانەدا ئەو بەشەی ئامرازی (جگە)ی تێدایە پارستەیە[1].

چونکە واتاکەی بەستراوەتەوە بە رستەی دووەمەوە، کە شارستەیە[2].

ئامرازی (جگە) چەند شێوەیێکی تری هەیە، وەک (بێجگە، بەجگە، جگەر، بێجگەر...)

لە شێوەی کرمانجیی سەروودا وشەی (ژبل) یان (بل ژی) یان (بل ژێ) بەکار دێت.

شازدە - لەگەڵ ئامرازی (هن - هن ژی)ی عەتفدا:

١- ل جەم هن گەرمە هن سار. (هن - هن).

٢- شاگردێت مەکتەبێ هن کوردی دخینن هن ژی عەرەبی. (هن - هن ژی).

٣- ئەو چاوا هات، ئووساژی چوو. (چاوا - ئووساژی).

٤- د وڵاتێ مەدا نە دەریا هەیە، نەژی بەندەر. (نە - نەژی).

٥- ئەم چقاس خەبتین ئەو قاس ژی مەفێدە کرد. (چ قاس - ئەو قاس ژی).

ئەم ئامرازانەی سەرەوە کە لەگەڵ ئامرازی (ژی) عەتفدا بەکار هاتوون لە شێوەی ئاخاوتنی کرمانجیی سەروودا و لە کتێبی «زمانێ کوردی»ی قەناتی کورد وەرگیراون.

حەڤدە - لەگەڵ ئامرازی (هەرکە)ی عەتفدا:

١- هەرکە هاتیت، منیش دێم.

٢- هەرکە منیش گەیشتمە ئەوێ، ئەو پەیدا بوو.

٣- هەرکە دیتیشم، بیری دەخەمەوە.

ئەمانە شێوەی بەکارهێنانی جووتە ئامرازی (هەرکە) و (یش)ن بەیەکەوە: لەو نموونانەدا دەردەکەوێت، کە ئامرازی (هەرکە) کەوتووەتە ناو پارستەوە، بەڵام ئامرازی (یش) وادەبێت لە پارستەدا، واش دەبێت لە شارستەدا دێت. (هەرکە)

---

(١) پارستە: رستەی تابیع.

(٢) شارستە: رستەی رەئیسی.

ئەم شێوانەشی بەرچاو دەکەوێت (هەکە، هەکو...). لە هەندێ شێوە ئاخاوتندا (وەکو) و (وەکی) بەواتای (هەرکە) و ئاوەڵەکانی بەکار دێت.

هەژدە - لەگەڵ ئامرازی (کەچی) عەتفدا:

بەڵێنی دامێ، کەچی نەشهات.

بەڵێنیشی دامێ، کەچی نەهات.

بەڵێنیشی دامێ، کەچی نەشهات.

بەڵێنیشی دامێ، کەچیش نەهات.

نەشمنارد بە شوێنیدا، کەچی هاتیش.

نەشمدواند، کەچی هەرخۆشی هێنایە پێشەوە.

لەم رستانەدا نموونەی بەکارهێنانی جووتە ئامرازی (کەچی) و (یش) بەیەکەوە دەردەکەوێت. بەوردبوونەوە دوو تایبەتی لەم رستانەدا سەرنج رادەکێشێت:

١- ئامرازی (کەچی) هەمیشە لە بەشی کۆتاییی نموونەکانەوە دێت.

٢- دوو رستەی تەواو بەیەکەوە بەستراونەوە.

بە دوا ئەم لێکۆڵینەوەیەدا پێویستە خاڵێک روون بکرێتەوە:

لیژنە لە نمایشتی هاتنی ئامرازی (یش) لەگەڵ ئامرازەکانی تری عەتفدا، دوو مەبەستی رەچاو کرد.

١- ئیمکانی هاتنی زیاتر لە ئامرازێکی (عطف) لە رستەدا.

٢- زیادە چالاکیی ئامرازی (یش) لەچاو ئەوانی تردا.

لیژنە ئەو کات و دەرفەتەی نییە درێژە بدات بە لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە بارەی تاک تاکی سەرلەبەری ئەو ئامرازانە لە رووی بەیەکەوە هاتنیانەوە، خوێنەری کورد دەتوانێت لێکۆڵینەوەی لێرە بەپێشەوەی لیژنە بکات بە رۆشنایی و چەند و چۆنی پێکەوە هاتنی ئامرازەکانی تری پێ ساغ بکاتەوە.

لێرە بەدواوە لە تاک تاکی ئامرازەکانی تر دەکۆڵرێتەوە بێ ئەوە هاتنیان بەیەکەوە لێی بکۆڵرێتەوە.

٥- (بەڵام - بەڵان):

زمانەوانەکانی کورد لەم ئامرازە بەم شێوەیەی خوارەوە دواون:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (١٩)ی کتێبەکەیدا (دەستووری زمانی کوردی) دەڵێت: «من لێرەم بەڵام گوڵچین لەماڵەوەیە».

ئەداتی یەکخەری (بەڵام) دیسانەوە دوو کۆمەڵ کەلیمەی پێکەوە نووساندووە، لە فەرهەنگەکەشیدا دەڵێت واتای (Moreover, But) دەبەخشێت.

٢- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانی کوردی بەرگی دووەم لاپەڕە (١٤٨)دا دەڵێت، وشەی (بەڵام) ئامرازی عەتفە، وەک:

راستە من ڕێبوارم، سەرپێیی ئەڕوانم

بەڵام واجوانی تۆ کاری کرد لە گیانم

٣- لە کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) لاپەڕە (١٤) بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی گوتراوە:

ئامرازی (بەڵام) و (بەڵان) دوو رستە، کە واتایان دژی یەک، یا جیاوازە، بەیەکەوە دەبەستن، وەک:

فەرهاد دەوڵەمەندە بەڵام رەزیلە.

تۆ خۆت بە تەنیا سەرکەوە بەڵان منداڵەکە بدە بەمن.

٤- کوردوییف لە کتێبەکەی خۆیدا دەبێژێت:

دێ و ئۆ باقێ من مان ئەلەگەزێ، لێ ئەز هاتم و ئەرێڤانێ من گوت بکە، لێ تە نەکر

٥- لە فارسیدا وشەی (ولی) بە واتای (بەڵام) بەکار دێت، لە کتێبی (دستور فارسی ر. ذالنور) ئامرازی (ولی) وەها باس کراوە (أز حروف ربط تفریقی است) واتە وشەی بەڵام (ولی) بە حرفی پێوەندی لێک ترازاندن دانراوە.

لیژنە لەجیاتی ئەوەی رای خۆی دەربېڕێت دەربارەی ئەم ئامرازی عەتفە، چەند رستەیێکی بە نموونەی روونکردنەوەی مەبەست هێنایەوە، وەک:

١- فلانەکەس دەوڵەمەندە بەڵام رەزیلە.

٢- هاوینی بەغدا گەرمە بەڵام شەوانی فێنکە.

٣- تێم گەیاند بەڵام هەر لەسەر قسەی خۆی ڕۆیشت.

٤- تێم گەیاند بەڵام وازی نەهێنا.

٥- تێم گەیاند بەڵام ئەو زۆرتر تێوە گلابوو.

٦- ئەوان مانەوە بەڵام من گەڕامەوە.

٧- جام دەڵێت بشکێم بەڵام نەزرینگێم.

***

٦- ئامرازی "کە"ی عەتف:

ئەم ئامرازە لەم شێوانەدا بەرچاو دەکەوێت:

١- بۆ پێوەندی (عطف)ی سادە: لەم حاڵەدا دوو ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە، وەک:

من نەمبیستووە، کە تۆ شاعیر بیت.

بۆچی نازانیت، کە شەننە لە مەننە کەمتر نییە؟

سەیری ئەم دارستانە بکە، کە چەند چڕە.

کە تۆ نەشارەزایت بۆچی خۆت لەشت هەڵدەقوتێنیت؟

٢- بۆ پێوەندیی (عطف) لە شێوەی ئاوەڵکاری کاتدا (ظرف زمان) کە لەوێشدا دوو ڕستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە:

کە من گەیشتمە جێ، ئەو ڕۆیشتبوو.

بەهاران کە باران دەبارێت، گژوگیا دەبووژێتەوە.

کەس نییە کە فێڵی لێ دەکرێت دڵی نەیەشێت.

٣- بۆ پێوەندیی (عطف) لە شێوەی ئامرازی مەرجدا، وەک:

کلکی شێر مەگرە، کە گرتت بەری مەدە.

کە بەڵێن بدەیت بیگەیەنە جێ.

کە گەورە ئاوی ڕشت، گچکە پێی لێ دەخشێنێت.

٤- وەک ڕاناوی لێکدەریش بەکار دێت، کە دەوری پێوەندیی نێوانی دوو ڕستە دەبینێت، وەک:

ئەو خورمایەی کە تۆ خواردووتە، دەنکەکەی لای منە.

ئەو کەسە کەسە، کە ئەلفێکی بەسە.

دۆست ئەوەیە کە دەتگریەنێ، دوشمنیش ئەوە کە بەپێکەنینت دێنێ.

تێبینیی مەسعوود محەمەد:

هەندێ بیروڕای تایبەتی خۆی هەیە بە نیسبەت تێکڕای باسەکەوە لە کاتی پێویستدا باسیان دەکات. لێرە بەپێشەوە لە نووسیندا دەری بڕیوە کەوا راناو هەر ئەوانەن پێیان دەگوترێ (راناوی کەسی)، بەو پێیە وشەی (کە) بەلای ئەوەوە راناو نییە.

سەرەڕای ئەم چوار شێوە بەکارهێنانە کە لە هەموویاندا وشەی (کە) دەوری پێوەندیی دەبینێت لە شێوەی تریشدا بەکار دێت، بەڵام بێ ئەوە واتای پێوەندیی ببەخشێت، وەک کە دەبێتە ئامرازی تعریف:

پشیلەکە گۆشتەکەی خوارد.

کتێبەکەم بۆ بێنە.

جگە لەمانە وادەبێت ئەم رواڵەتەی (کە) لە پێکهێنانی گەلێک وشە بەشدار دەبێت و هەرجارەش بۆ مەبەستێکی سەربەخۆ، وەک:

| | |
|---|---|
| لەت | لەتکە |
| فڕ | فڕکە |
| بن | بنکە |
| لووت | لووتکە |
| خڕ | خڕکە |
| دڕ | دڕکە |
| سوور | سوورکە |
| شل | شلکە |
| شەل | شەلکە |
| دان | دانکە |
| پەل | پەلکە |

٧- ئامرازی (یا)ی عەتف:

١- لیژنە نەکەوتە بەرچاوی کەوا مامۆستایان توفیق وەهبی و سەعید سدقی، کوردوییف و رەشید کورد لە کتێبەکانیاندا لەم ئامرازە دوابن.

٢- نووری عەلی ئەمینیش لە کتێبەکەی خۆیدا لاپەڕە (١٤٩) وشەکانی (یا، یاخوو، یان، یاخوت) بە ئامرازی (عطف) دادەنێت و ئەم میسالەی هێناوەتەوە:

ئیتر رابورد من پیربم یان دڵم بمرێ

یا بلوی شادمانیم، هەرگیز گەرد بگرێ

٣- لە کتێبی «زمان و ئەدەبی کوردی» پۆلی شەشەمی ئامادەیی چاپی دووەم ساڵی ١٩٧٢، لاپەڕە (١٥) بەم جۆرە لەم ئامرازە (یا، یان، یاخو، یاکوو، یاوەکو، یانەکوو) دواوە:

نازانم بەتەمای خوێندنی یا کاسبی.

بە گۆران بڵێ یا خۆی، یا وەکو دلێر، سبەینێ بەرچنەیەک هەنجیر، یاخو هەرمێم بۆ بهێنێ.

ئەم ئامرازانە دوو رِستە، یا دوو وشە - کە دەشێت واتای یەکێکیان بێتەجێ - بەیەکەوە دەبەستێت.

بە زۆری ئامرازی (یا) دووبارە دەکرێتەوە، ئەگەرچی هەندێ جار، یەکێکان لادەبرێت، وەک:

یا برِۆ بۆ دانشگا، یا وەرە دانیشە.

برِۆ بۆ دانشگا، یا وەرە دانیشە.

لیژنە لەم رستانەی خوارەوەدا جۆری بەکارهێنانی ئەم ئامرازە نیشان دەدات:

١- ئێمە یا مامۆستاین یا قوتابین.

٢- ئێمە یا مامۆستاین یا قوتابی.

٣- ئێمە یا دەخۆین یا دەڕۆین.

٤- ئێمە یا دەخۆین یا ناخۆین.

٥- ئێمە یا دەخۆین یا نەء... .

٦- یا ئێمە دەبین یا ئێوە دەبن.

٧- یا ئێمە دەبین یا ئێوە.

لەم رستە خەبەریانەدا هەر جارە دوو «یا»ی عەتف بەکار هاتووە. بەڵام ئەو وشەیەی لە هەردوو رستەی دەوری «یا»ی عەتفدا دووبارە بووەتەوە، دەشێت لە رستەی دووەمدا بقرتێت، وەک لە نموونەی (٥) و (٧)دا دەردەکەوێت، تەنانەت لە رستەی حەوتەمدا ئەو رستەیەی کە قرتاوە بریتییە لە کاری «دەبن» ئیسنادەکەشی جودایە لە ئیسنادی کاری رستەی بەرایی چونکە ئەویان بۆ یەکەمی کۆیە، قرتاوەکەش بۆ کەسی دووەمی کۆیە.

١- ئەم رستانەی خوارەوەش جۆرێکی تری بەکارهێنانی ئەم ئامرازە نیشان دەدەن:

أ- سێوەکە بخۆ یا هەنارەکە.

سێوەکە یا هەنارەکە بخۆ.

ب- من دەخوێنم یا ناخوێنم تۆ حەقت چییە بە سەرمەوە.

تۆ گەورەیت یا بچووکیت بەمن چی؟

لەم نموونانەدا یەکەم «یا»ی عەتف لە رستەکاندا قرتاوە، چونکە دەبوو بەم جۆرەیە بێت:

١- یا سێوەکە بخۆ یا هەنارەکە.

٢- یا دەخوێنم یا ناخوێنم.

٣- یا گەورەیت یا بچووکیت.

لە رستەی (سێوەکە یا هەنارەکە بخۆ) هەم (یا) لە سەرەتاوە قرتاوە و هەم کاری (بخۆ) لە کۆتایی رستەدا (یا سێوەکە بخۆ)، کەواتە هاتن و نەهاتنیان لەو شوێنانەدا جەوازییە. هەردووکیشیان رستەی ئینشائین.

٢- ئەم نموونانەی خوارەوەش جۆرێکی تری بەکارهێنانی ئامرازی «یا»ی عەتف دەخاتە بەرچاو، وەک:

أ- تۆ کوردیت یا عەرەب؟ (یا عەرەبیت)

ب- تۆ دەڕۆیت یا نەء؟ (یا ناڕۆیت)

لەم نموونانەدا قرتانی «یا» لە بەشی پێشەوەی رستەکاندا وجوودییە؛ دیاریشە رستەکان بۆ پرسیارن.

٣- ئەم نموونانەی خوارەوە جۆری چوارەمی بەکارهێنانی ئامرازی (یا)ی عەتف نیشان دەدەن، وەک:

أ- دەڕۆیت نارۆیت کەیفی خۆتە.

ب- بێت نەیێت وەک یەکە.

جـ- با بێت باران بێت بەو چی.

لەم نموونانەدا قرتانی «یا»ی ئامرازی عەتف لە هەردوو کەرتی هەریەک لەو رستانە جەوازییە.

جۆرێکی تری بەکارهێنانی «یا»ی عەتف، جۆری (بلاغی)، وەیا ئیدیەمییە، کەوا لەوێدا پەیڕەوی رواڵەتی دەستوور ناکرێت و سووان و قرتان بەسەر ئەو رستانەدا دێت کە «یان»یان تێدا بەکار هاتووە.

(یا دارستان، یا شارستان)، کە ئەمە کورتکراوەی (یا لە دارستان بژی، یا لە شارستان بژی).

(یا من، یا تۆ)، ئەمەش کورتکراوەی (یا من دەبم، یا تۆ دەبیت)ە ئاشکراشە بۆ هەڕەشەیە.

ئەم ئامرازە، ئەم شێوانەشی لە ئاخاوتندا بەرچاو دەکەوێت (یان، یانێ، یاخو، یاخوت، یاخود، وەیا، وەیاخو، وەیاخود...).

ئەمانە هەموویان دەشێت لە جێی «یا» بەکار بێن، بەڵام مەرج نییە هەموویان لە هەموو جێگەیەکدا شوێنی «یا» بگرنەوە، بە نموونە (یاخود - وەیاخود) هیچیان ناچنە جێی «یا» لە پەندی (یا من، یا تۆ)، بەڵام لە رستەیێکی وەک (ئەم دەفتەرانە، یا ئەو کتێبانە هەموویان بۆ خۆت بەرە) دەشێت بگوترێت (ئەم دەفتەرانە، وەیاخود ئەو کتێبانە هەموویان بۆ خۆت بەرە).

***

٨- ئامرازی "نەء"ی عەتف:

ئەم ئامرازە (نەء) بە پێی ئەو سەرچاوانەی کە لە بەردەستی لیژنەدایە،

دەردەکەوێت تەنیا لەلایەن (نووری عەلی ئەمین)ەوە لە کتێبی قواعدی زمانی کوردی لاپەڕە (١٤٩)دا باس کراوە و ئەم میسالەی بۆ هێناوەتەوە:

سێوەکەم خوارد    نەء    هەنارەکەم خوارد.

لیژنە ئەم چەند نموونانەی هێنایەوە بۆ دەرخستنی دەوری ئامرازی (نەء)ی عەتف، وەک:

با قادر بڕوات   نەء   با ئەحمەد بڕوات.

با قادر بێت   نەء   با قادر نەیەت.

تۆ وەرە   نەء   با قادر بێت.

لەم نموونانەدا دەردەکەوێت، کە ئامرازی (نەء)ی عەتف دوو رستە بەیەکەوە دەبەستێت، ئیتر یا هەڵە راست دەکاتەوە، یا جێگرێک دەخاتە شوێنی یەکێکی تر.

مامۆستا مەسعود محەمەد دەڵێت: وادەبێت ئەم ئامرازە دەکەوێتە بەراییی رستەوە بۆ هەمان مەبەست بەڵام لەم حاڵەدا شتێکی قرتاو لە پێش ئامرازەکەوە هەبووە، وەک:

نەء تۆ مەیە با قادر بێت.

لێرەدا دیارە پێشتر یەکێک ویستویەتی بێت لە وەڵامدا پێی گوتراوە (نەء تۆ مەیە).

نووری عەلی ئەمین تەئیدی رایەکەی مامۆستا مەسعوود دەکات.

ئەم ئامرازە وادەبێت لە ئاخاوتندا بە (نەخێر) دەردەبڕێت، وەک:

بەرازێکم کوشت   نەخێر گورگێکم کوشت.

٩- ئامرازی (نەک)ی عەتف: ئەم ئامرازە بە پێی ئەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستی لیژنەدان، دەردەکەوێت، کە ئەمانە لێی دواون:

١- نووری عەلی ئەمین لە کتێبەکەی خۆیدا لاپەڕە (١٤٨) لێی دواوە و ئەم میسالانەی بە نموونە بۆ هێناوەتەوە:

لە زڕەی زنجیر دڵت نەلەرزێ

پێوەند بۆ لەشە نەوەک بۆ گیان

گورجوگۆڵم نەک گێژم   بۆیە نەمام ئەنێژم

نەکو ئێوە نەچن، من جارێ چۆن ئەچم.

دوای گوتەی ئەوان ناکەوم نەکوو دەستم ببڕن.

٢- لە کتێبی «زمان و ئەدەبی کوردی» پۆلی شەشەمی ئامادەیی لاپەڕە (١٤) ئەم میسالانەی بەنموونە بۆ هێناوەتەوە:

آ- هەڵسە خۆت بگۆڕە نەکو بێن بە شوێنماندا.

ب- نامەیەکی تری بۆ بنووسە نەوەکو ئەوەی یەکەمی پێ نەگەیشتبێت.

جـ- ئەو لێرە هەڵهات نەوا بیگرن.

د- لەگەڵ پیاوی خراپ هەڵمەستە نەک خووت خراپ بکات.

لیژنە ئەم نموونانەی خوارەوەی هێنایەوە بۆ دەرخستنی جۆری بەکارهێنانی ئامرازی (نەک)ی عەتف لە رستەدا:

١- ئەم کێوانە بەرزن نەک ئەو کێوانە.

٢- پەلە مەکە نەک تێ بکەویت.

٣- تۆش پێی بڵێ نەکو لە بیری بچێت.

٤- ئێستا بڕۆین نەک تۆزێکی تر.

٥- سەرما خۆشە نەک گەرما.

٦- فەرهاد دەوڵەمەندە نەک دەستبلاو.

٧- نەک دەوڵەمەند، هەژاریش دەچێتە حەج.

٨- نەک بە من و نەک بە تۆ بە کەس چار ناکرێت.

٩- نەک هەنار، رێواسیشم خوارد.

١٠- خۆت لادە نەک بتشێلن.

لە رستەکانی (١، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ٩)دا ئامرازی نەک هەر جارە بە شێوەیەک جێگرێکی لە شوێنی یەکێکی تردا داناوە.

لە رستەکانی (٢، ٣، ١٠)دا سەرەڕای واتای نەفی، تەعلیل و تەسبیبێکیش دێتە بەرچاو، لە هەموو حاڵەتیشدا دەوری (عطف)ی دیوە.

هەروەها ئەم رواڵەتانەشی لە زارەکانی کوردیدا بەرچاو دەکەوێت (نەکو، نەوەک، نەوەکا، نەوەکو، نەوەکی، نەوەکێنێ، نەوەکانێ، نەوا، نەباکو....).

١٠- ئامرازی "تا"ی عەتف:

لەناو ئەوانەدا، کە لە زمانی کوردی دواون:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە «دەستووری زمانی کوردی»دا لەم ئامرازە نەدواوە بەڵام لە فەرهەنگەکەیدا بە ئامرازی عەتفی داناوە.

٢- مامۆستا سەعید سدقی لە کتێبەکەی «صرف و نحوی کوردی» لاپەڕە (٥٤) بە ئاداتی ئینتیهای دەداتە قەڵەم و دەڵێت:

دەخوێنم هەتا دەمێنم.

هەروەها لە لاپەڕە (٦٩) شدا ئەم نموونانەی هێناوەتەوە بۆ هەمان مەبەست:

تا ماوم دەخوێنم.

هەتا مردن کردنە.

٣- کوردیێف و ڕەشیدی کورد و جگەرخوێن لە دەستوورەکانیاندا، بەرچاو نەکەت کە لەم ئامرازە دوابن.

٤- نووری عەلی ئەمین لە قواعدی زمانی کوردیدا لاپەڕە (١٤٨) لێی دواوە و ئەم نموونانەی بۆ هێناوەتەوە:

پێچ بدە بەخۆت لە چەم، لە کێوان

هەتا ئەچیتە سەر ئاوی سیروان

تاکو ڕانە مەڕەکە نەگاتە ناو دێ، من ناڕۆم.

نایەم بۆ سەردانتان هەتاوەکو گەرمای هاوین نەبزوێ.

٥- لە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی شەشەمی ئامادەیی، لاپەڕە (١٤)، بەم جۆرە لە ئامرازی (تا) دەدوێت و دەڵێت: (تا) کاتێ کە ئامرازی بەستنەوە بێت، ئەم واتایانەی هەیە: [لەوە بە دواوە لە ڕێی نموونە هێنانەوەوە دەیەوێ بڵێت وشەی «تا» بە پێی بەکارهێنانی واتای: ١- مەرج ٢- کاتێکی تر ٣- ئەنجام ٤- دوایی و پایان ٥- چەند ٦- هەمیشەیی و «استمرارية» دەبەخشێت].

لیژنە لە دوا ئەم نمایشتە هاتە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی دەربارەی ئەم ئامرازە، لەم ڕستانەی خوارەوەدا جۆر و مەبەستی بەکارهێنانی «تا»ی عەتف بەدیار دەکەوێت:

نموونەی یەکەم:

١- تا دەمێنم، دەخوێنم.

٢- تا لێمان ون بوو، بەغار رۆیی.

٣- تا دەتوانیت، تێ بکۆشە.

نموونەی دووەم:

١- تا نەینایە تەبەق، نەیگوت ئەڵڵاهو سەدەق.

٢- تا هاتینەوە ئەوان ڕۆیشتبوون.

نموونەی سێیەم:

١- تا پتر بخۆیت، درەنگتر برسیت دەبێت.

٢- تا سوار نەگلێ، نابێتە سوار.

نموونەی چوارەم:

١- هاتم تا بزانم، چیت کردووە.

٢- پارەم بۆ ناردیت تا خەرجی بکەیت.

لە نموونەی یەکەمدا هەردوو رستەی بەیەکەوە بەستراو، بە هۆی ئامرازی (تا)ی عەتفەوە هاوتای یەکترن.

لە نموونەی دووەمدا ئامرازی (تا)ی عەتف بە گشتی بە دوا یەکتردا هاتنی هەردوو رستە دەگەیەنێت، بەڵام وەک دیارە لە رستەی یەکەمدا سەرەڕای بە دوا یەکتردا هاتن (تعاقب) جۆرێک تێک بەسترانیش لە نێوانی روودانی رستەی یەکەم و دووەمدا بەدی دەکرێت، واتای روودانی رستەی دووەم بەندە بە روودانی رستەی یەکەمەوە.

لە نموونەی سێیەمدا ئامرازی (تا)ی عەتف لە بەیەکەوە بەستنەوەی رستەکاندا واتای مەرج پێک دێنێت.

لە نموونەی چوارەمدا ئامرازی (تا)ی عەتف رستەی یەکەم دەکاتە هۆی روودانی رستەی دووەم.

لە زارەکانی کوردیدا ئامرازی (تا)ی عەتف ئەم رواڵەتانەشی هەیە (هەتا، تاکو، هەتاکو، هەتاوەکو، تاوەکو، هەتاوەکونێ، هەتاوەکینێ، هەتانەکونێ، هەرتا....).

١١- ئامرازی "کەی" عەتف:

کەی پێت کرا، سەرێکمان لێ بدە.

کەی بەهار هات، گوڵیش دێت.

کەی مامۆستا بێتە ژوورێ، لە بەری هەڵدەستین.

لەم نموونانەدا ئامرازی (کەی) دوو رستەی بەیەکەوە دەبەستێتەوە، بەڵام لەم حاڵەتەدا ئەو واتایە بە دەستەوە نادات کە لە حاڵی پرسیاردا بە دەستیەوە دەدات چونکە لێرەدا پرسیار نییە. بە نموونە لە رستەی (کەی هاتیتەوە؟)دا، مەبەست زانینی کاتی هاتنەوەیە و بەس، بەڵام کە گوترا (کەی من هاتم، تۆش وەرە) سەرەڕای بە دەستەوەدانی کات، دوو مەبەستی تریشی پێک هێناوە:

١- دوو رستەی بەیەکەوە بەستووەتەوە.

٢- وشەی (کەی) خۆی لە واتای پرسیار دابڕیوە.

ئەم رواڵەتانەی ئامرازی (کەی) عەتف لە زارەکانی کوردیدا بەرچاو دەکەون (کەنگێ، کەنگین، کەنگینێ، کەینێ...).

١٢- ئامرازی "چۆن"ی عەتف:

چۆن هاتیت، وەها برۆ.

چۆن لەگەڵمدا بجووڵێیتەوە، وەها لەگەڵتدا دەجووڵێمەوە.

چۆن چۆنی بنووسێت، خەتی خۆشە.

هەرچۆنێک بێت، لەوان باشترە.

لەمەولا چۆن رابوێرن، ئێمەش وەها رادەبوێرین.

لەم نموونانەدا ئامرازی (چۆن)ی عەتف و هاوەڵەکانی (چۆن چۆن، هەرچۆنێک) دوو رستەیان بەیەکەوە بەستووەتەوە بەبێ ئەوە هیچ پرسی تێدا بێت. بەنیسبەت ئامرازی (هەرچۆنێک)یشەوە هەرگیز بۆ پرس بەکار نایەت، بەڵام (چۆن چۆن)،

وەک (چۆن) دەشێت لە عەتفیەت بشۆردرێت و بۆ پرس بەکار بهێنرێت، وەک:

چۆن چۆنی باسەکەی لەگەڵدا بکەمەوە.

وشەی (چۆن) و ئەو هاوەڵانەی کە وەک ئەو بۆ پرس بەکار دێن، دەشێت لە رستەی پرسدا واتای تەعەجوب، وەیا شتی وەک تەعەجوب، کە یەکێکیان پەشیمانییە، رابگەیەنێت، وەک:

چۆن چۆنی ئەمەم بە خۆم کرد!

چۆن نەتزانی فلانەکەس ناحەزتە!

چۆن با و رەهێڵێکە!

ئەم ئامرازە (چۆن) ئەم رواڵەتانەی تریشی هەیە (چۆنێک، هەرچۆن، هەرچۆنێ، هەرچی چۆنێ، هەرچی چۆنێک، هەرچی چۆن...) لە هەندێ شێوە ئاخاوتنی تردا لە جیاتی «چۆن» وشەی (کوو، چلۆن، کلۆن) بەکار دێت. لە شێوەی کرمانجیی سەروودا لە جیاتی «چۆن» وشەی (چەوە، چەوانێ، چاوا، چاوانێ، هەرچەوا، هەرچەوانێ، کوو..) بەکار دەهێنرێت.

١٣- ئامرازی "ئەگەر"ی عەتف

١- مامۆستا سەعید سدقی لە لاپەڕە (٥٣)ی صرف و نحوەکەیدا دەڵێ: (ئەگەر) اداتی شرطە، ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە: ئەگەر تێ نەکۆشین بە مەرام ناگەین.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا، لاپەڕە (٤٤)، ئامرازی (ئەگەر، ئەرچی، ئەگەرەکو، ئەگەرنا)ی بە ئامرازی عەتف و مەرج داناوە.

٣- نووری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٤٩)ی قەواعیدەکەی دەڵێ: (ئەگەر، گەر، مەر، مەگەر، ئەر، ئەرنا، ئەگەنا، ئەگینا) ئامرازی عطفن، ئەم نموونانەشی بۆ هێناونەوە:

بێرە کوردستان عەزیزم گەر تۆ سەیرانت ئەوێ

بتبەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کوێستانت ئەوێ

ئەر مەندوب هەیە بۆچی مام کوێخا

لەسەر خۆڕایی ئابڕووم ئەبا

گورج لە باخەکەم بڕۆنە دەرەوە ئەگینا بۆتان دێم.

مەر مێوانەکانم بڕۆن، ئەوسا پێم بکرێ بێم بۆ لاتان.

٤- لە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی شەشەمی ئامادەیی، لاپەڕە (١٥)دا، ئامرازی (ئەگەر، گەر، ئەر) بە عطف دانراوە، ئەم میسالانەشیان بۆ هاتوونەوە:

ئەگەر ماموٚستا هات، پێم بڵێ.

بەمەرجێ لەگەڵتان دێم، ئەگەر زۆر دانەنیشن.

٥- لە کتێبی (دستور پارسی)، دانانی ر. ذوالنور، لاپەڕە (٢٠٩)، لە ژێر ناونیشانی (حرف ربط)دا (ئەگەر) دانراوە بە یەکێک لە (حرف ربط)، واتە (عطف).

٦- لە کتێبی (AN ENGLISH GRAMMAR BOOK)، لە دانانی (Evan C.Penglis) وشەی (if) بە ئامرازی عەتف دانراوە. (ل ٢٨٤).

دوای ئەم نمایشتە لیژنە ئەم نموونانەی خوارەوەی هێنایەوە بۆ جۆری بەکارهێنانی ئامرازی (ئەگەر) لە کوردیدا:

ئەگەر گوڵ نیت، دڕکیش مەبە.

ئەگەر زمان بوەستێت، سەر سەلامەتە.

ئەگەر من چووم، تۆش وەرە.

ئەگەر نەچووبام، پێیان نەدەگەیشتم.

ئەگەر چوبێتم، لێم زوێربە.

ئەم نموونانە دەری دەخەن کە ئامرازی (ئەگەر) لەگەڵ هەموو جۆرە رستەیەک، چ خەبەری ئینشائی، چ ئەوەی کاری تێدا بێت چ ئەوەی تێیدا نەبێت، بەکار دەهێنرێت، لە هەموو حاڵەتێکیشدا واتایێکی مەرجی بەهێز دەبەخشێت.

(ئەگەر)، ئەم شێوانەشی لە ئاخاوتنی کوردیدا بەرچاو دەکەوێت:

(ئەگەر، ئەر، ئەگەرکوو، ئەگەرەکوونێ، ئەگەرەکینێ). جگە لەمانە، لە کرمانجیی سەروو و ناوچەی تریش، لە جیاتی (ئەگەر) و هەڤاڵەکانی ئەم وشانە بەکار دێن: (هەکو، هەکە، هەکی، هەرکی، هەرکو، هەرکە..).

***

١٤- ئامرازی "ئەگەرنا - ئەگینا"ی عەتف

ئەم ئامرازە لە رواڵەتیەوە دیارە وێنەی سەلبیی ئامرازی (ئەگەر)ە.

لەو سەرچاوانەی لەبەردەستی لیژنەدان دەردەکەوێ هەر ئەم دوو نووسەرە لەسەر ئامرازی (ئەگرنا)یان نووسیوە:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (٤٤)ی فەرهەنگەکەیدا (ئەگەنا، ئەگین، ئەگینا)ی بەئامرازی عەتف و ئاوەڵکار داناوە.

٢- نووری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٤٩)ی ڕێزمانەکەیدا (ئەگینا)ی بە ئامرازی عەتف داوەتە قەڵەم و ئەم نموونەیشی بۆ هێناوەتەوە: (گورج لە باخەکەم بڕۆنە دەرەوە ئەگینا بۆتان دێم).

بە بیروڕای لیژنە ئامرازی (ئەگینا) وێنەی گۆڕاوی (ئەگەرنا)یە، هەروەها وشەی (ئەگین) کورتکراوەی (ئەگینا) و وشەی (ئەگەنا)ش کورتکراوەی (ئەگەرنا)یە.

بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە لەم رستانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

١- چاک بوو زوو ڕۆیشتم، ئەگینا بە دەواما نەدەگەیشتم.

٢- کابرام نەدیت، ئەگەرنا پارەکەم پێی دەدا.

٣- گورج لێرە بڕۆ، ئەگەرنا دەرت دەکەم.

٤- نەچوومە دەرەوە، ئەگینا پێم تەواو نەدەکرا.

٥- دەرسەکە باش بخوێنە ئەگین دەرناچیت.

لەم نموونانەوە دەردەکەوێ کە ئەم ئامرازە لە جۆرەها رستەدا بەکار دێت، وەک ئەوەی هەردوو رستەی بەیەکەوە بەستراو ئەرێتی وەیا نەرێتی بن، وەیا یەکێکیان ئەرێتی و ئەوی تریان نەرێتی بێت.

لە زاری کرمانجیی سەروودا لە جیاتی (ئەگەرنا) وشەی (هەکەن) بەکار دێت.

وشەیێکی هاوواتای (ئەگینا، ئەگین، ئەگەنا) ئامرازی (دەنا)یە، لە بەشێکی ناوچەکانی کوردستاندا بەکار دەهێنرێت.

١٥- ئامرازی "مەگەر، مەر"ی عەتف:

ئاشکرایە ئامرازی (مەر) کورتکراوەی (مەگەر)ە.

لەو سەرچاوانەی کە لەبەردەستی لیژنەدا هەیە بەم جۆرە باسی مەگەر کراوە:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا، لاپەڕە (٨٩)، ئامرازی (مەگەر) بە ئامرازی عەتف و ئاوەڵکار دادەنێت وەک لەم نموونانەدا دەری دەخات:

مەگەر خوا بزانێ (only).

مەگەر باران بباریێ (unless).

مەگەر فلان نەبێ (except).

مەگەر ئێوە دەستتان نەکردووە بەکار (do you mean to say).

مەگەر وەها (then in that case).

٢- نووری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٤٩)ی ڕێزمانەکەیدا لە (مەگەر، مەر) دەدوێت و ئەم نموونەیەی هێناوەتەوە:

مەر مێوانەکانم بڕۆن ئەوسا پێم بکرێ سەرتان لێ بدەم.

٣- جگەرخوێن لە لاپەڕە (١٠٠)ی (ئاوائو دەستورا زمانێ کوردی) دەڵێت: مەگەر ئالاڤی شەرتە، ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە:

ئەز ژریا خوە ڤەناگەڕم مەگەر دنیا دوژمنی من بی.

بە دوا ئەم نمایشتەدا بۆ دەرخستنی جۆری بەکارهێنان و دەوری ئەم ئامرازە لە ئاخاوتندا چەند رستەی خوارەوە دێنینە بەر چاو:

لە پێشەوە ئەو رستانەی لە فەرهەنگەکەی مامۆستا توفیق وەهبیدا تۆمار کراون دێنینەوە بۆ ناو لێکدانەوە:

مەگەر خوا بزانێ.

مەگەر باران بباریێ.

مەگەر فلان نەبێ.

مەگەر ئێوە دەستتان نەکردووە بەکار.

مەگەر وەها.

ئەم رستانە، وەک لەبەر چاون، چ دەورێکی (عطف)ی ئامرازی مەگەریان تێدا نییە چونکە لە هیچ کامێکیاندا دوو رستەی بەیەکەوە نەبەستوونەوە، بەڵام دەشێ بگوترێ هەرجارە رستەیەک لە ئاخاوتندا قرتێنرابێت، وەک ئەمەی کە رستەکان لە

بنەڕەتدا بەم جۆرەی خوارەوە بووبن:

١- (کەس نازانێ) مەگەر خوا بزانێ.

٢- (هەر دێم) مەگەر باران بباریێ.

٣- (ئەو کارە بەو دەکرێت) مەگەر فلان نەبێ.

٤- (ئێوە راوەستاون) مەگەر دەستتان نەکردووە بەکار.

٥- (ناچێتە عەقڵەوە) مەگەر وەها.

بە دوا ئەم رستانەدا ئەمجار نموونەکانی لیژنە:

برا لە پشت برا بێ مەگەر قەزا لە لای خوا بێ.

من بە دارا باوەڕ ناکەم مەگەر تۆ دەستەبەری بیت.

من بە دارا باوەڕ دەکەم، مەگەر تۆ بمخەیتە گومانەوە.

لەم رستانە و ئەوانەی ناو فەرهەنگەکەی مامۆستا وەهبیشدا، دەردەکەوێ لە بنەڕەتدا ئامرازی (مەگەر) ڕێژەی مەنفی (ئەگەر)ە و لە ئاخاوتندا دەوری پێچەوانەی ئەو دەبینێت، وەک ئەویش دوو رستە بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

لە نموونەکانی سەرەوەدا، کە بێین وشەی (مەگەر) بگۆڕینەوە بە (ئەگەر) رستەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دەگۆڕێن:

١- من بە دارا باوەڕ ناکەم ئەگەر تۆ دەستەبەری نەبیت.

من بە دارا باوەڕ دەکەم ئەگەر تۆ دەستەبەری بیت.

٢- من بە دارا باوەڕ ناکەم ئەگەر تۆ بمخەیتە گومانەوە.

من بە دارا باوەڕ دەکەم ئەگەر تۆ نەمخەیتە گومانەوە.

لەمەوە دەبینین بەهێنانی «ئەگەر» لە جێی «مەگەر» جۆری رستەی دوای «مەگەر» دەگۆڕێت، واتە لە موسبەتەوە دەبێتە مەنفی، لە مەنفیشەوە دەبێتە موسبەت، هەروەک دەشێت جۆری رستەی پێشەوە بگۆڕێت.

بە نیسبەت رستەی (برا لە پشت برا بێ مەگەر قەزا لە لای خوا بێ) ئاشکرایە رستەیێک حەزف کراوە، گوتەکە لە بنەڕەتدا بەم شێوەیە، یا شێوەیێکی وەک ئەو بووە.

(برا لە پشت برا بێ، نسکۆیان نایەتەبەر، مەگەر قەزا لە لای خوا بێ).

لەم رستەیەشدا، کە بێین (مەگەر) بگۆڕێن بە (ئەگەر) هەمان رستە گۆڕیی باس لێکراو پەیدا دەبێت، وەک لە خوارەوە دیار دەکەوێت:

(برا لە پشت برا بێ، نسکۆیان نایەتەبەر، ئەگەر قەزا لە لای خواوە نەیەت).

بە ئیستیقرا دەردەکەوێت ئامرازی (مەگەر) هێجگار بەکار هاتووە لە ئاخاوتنی کوردیدا بۆ دارشتنی رستەی پەند و شێوە ئاخاوتنی بەلاغی کە بە عادەت گوتەی تێدا کورت دەکرێتەوە، وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

مەگەر وەها.

مەگەر تۆم نەبیت.

ماڵی دزێتی مەگەر شەو بکرێت بەخۆدا.

١٦- ئامرازی (ئەنجا)ی عەتف:

ئەم ئامرازە ئەم رواڵەتانەشی هەیە لە ئاخاوتنی کوردیدا (ئەنجا، ئنجا، ئنجاکو، ئنجاکونێ، ئەوجا، ئەمجا، ئەمجار، ئیمجا، ئیمجاکونێ، ئەوجاکونێ، ئەوجارەکێنێ، ئەوجاکو، ڤێجا، وێجا، هیجا، هیجانێ..).

بۆ چۆنیەتی پێکهاتنی ئەم وشەیە:

١- دکتۆرە نەسرین دەڵێت: ئامرازی (ئەوجارە) ئەسڵە، وەک لە بەکارهێناندا روون دەبێتەوە و دەردەکەوێت، بۆ نموونە ئەگەر بڵێین: (باش تێی بگە و ئینجا بینووسەرەوە). واتە: جارێ تێی بگە، ئەوجا بینووسەرەوە، واتە ئەم بکە پاشان ئەو.

٢- بەلام رای مامۆستا مەسعوود وایە ئەم ئامرازانە لە بنەڕەتدا لە وشەی (ئەمجار)ەوە هاتوون، لەو رووەوە کە گۆڕینی دەنگی (م) بە دەنگی (ن) شتێکی عادەتییە لە زمانی کوردیدا؛ کەواتە (ئەمجار) ببێتە (ئینجا) نزیکترە لەوەی (ئەوجار) ببێتە (ئینجا). لە هەمان کاتدا وشەی (ئیمجا) لە جێگەی (ئینجا)دا زۆر باوە، زۆریش ئاشکرایە وشەی (ئیمجا) لە (ئەمجار)ەوە هاتووە نەک لە (ئەوجار)ەوە. سەرەڕای ئەمانە، لە ولاتی وەک دەوروبەری هەولێر و کۆیە و خۆشناوەتی و گەلێک شوێنی تر لە بنەڕەتدا (ئەم) دەکەن بە (ئەو).

٣- بە بیروڕای نووری عەلی ئەمین، ئەم ئامرازە و هەموو ئامرازەکانی تری هاوچەشنی بەم چەشنە پێک هاتوون:

ئاوەڵناوی نیشانەی (ئەم) و (ئەو) چووەتە سەر ئاوەڵکاری (جار)، وەک:

ئەم جار

ئەو جار

لە پاشا ئەو گۆڕانەی بەسەردا هاتووە و ئەو شێوانەی لێ ساز دراوە، کە هەنووکە لە ئاخاوتنی کوردیدا بەکار دەهێنرێن.

٤- بە بیروڕای مامۆستا سادق بەهائەدین ئامرازی (ڤێجا) لە ئامرازی (ڤێجار) وەرگیراوە، هەروەها ئامرازی (وێجا) لە ئامرازی (وێجار) وەرگیراوە؛ چونکە حەزفکردنی (ر) لە شێوەی سەرووا باوە، وەک:

(جارجار) دەبێتە (جارجا).

(هەندەجار) دەبێتە (هەندەجا).

لە دوای ئەمە مامۆستا مەسعوود ئەمەشی ئیزافەی سەر رای خۆی کرد، کە بە پێی دەستوورێکی بنجی فۆنەتیکی کوردی دەنگەکانی (م، ن، ف، ڤ، ب) کە جگە لە (ن) هەموویان دەنگی لێون، دەسوێن و دەبنە (و)، ناشێت دەنگی (و) قورس بکرێت ببێتە (ب) یا (م) یا ئەوانی تر. بەو پێیە (ئەوجار) نابێتە (ئەنجا - ئنجا) کە دەزانین دەنگی (ن) هی لێویش نییە.

بەکارهێنانی ئامرازی (ئەنجا) و هاوچەشنەکانی:

جۆری بەکارهێنانی ئەم ئامرازە لەم رستانەی خوارەوەدا بە دەردەکەوێت:

قوتابییەکان ریز بوون ئەنجا مامۆستاکەیان هات.

دەرسەکەت بخوێنە ئەنجا بنوو.

یا زەوییەکە بکێڵم ئەنجا تۆوەکەی پێوە دەکەم.

لەم رستانەدا دەردەکەوێت، کە ئامرازی (ئەنجا) جگە لەوەی ئاوەڵکارە دوو رستەش پێکەوە دەبەستێت.

بە بیروڕای مامۆستا مەسعوود ئەم ئامرازە شکڵی بەلاغیشی هەیە، کە یەک

رستەی تێدا بەکار دێت و لە مەعنادا رستەیێکی قرتاو هەیە، وەک: ئەوجا سەیری ئەو بەزمە.

ئەوجا هیچ..

[تا ئێرە کە رێکەوتی ٣١ - ١ - ١٩٧٦ بوو، د. نەسرین فەخری بەشدار بووە لە لێکۆڵینەوەکانی لیژنە، لێرە بە دواوە لەبەر هەندێک هۆی تایبەتی نەیتوانی چی تر بەشداریی بکات لە کۆبوونەوە و لێکۆڵینەوەکانی لیژنە].

١٧- ئامرازی (بەڵکو)ی عەتف:

نووسەرانی کورد بەم شێوەیە لێی دواون.

١- مامۆستا سەعید سدقی لە لاپەڕە (٥٣) مختصری صرف و نحوی کوردیدا دەڵێت: ئامرازی (بەڵکو، خۆزگا، خۆزگایەکو، کاشکی، بەشکم، بریا) ئەدەواتی تەرەجین، رجا و تەمەنایان پێ دەکرێت، وەک:

خۆزگە خوێندەوار بوومایە.

خۆزگایەکو لە صنفا یەکەم بوومایە.

کاشکی وەقتی خۆم بە خۆڕایی رانەبواردایە.

با برۆم بەڵکو شتێکم دەستگیر بێ.

بەیانی زوو هەڵسە بەشکم موتەلای دەرسەکانت بکەی.

بریا دوو ساڵ لەمەوپێش لە مەکتەبا بوومایە.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا لاپەڕە (١٠) دەڵێت:

(بەڵکە، بەڵکم، بەڵکی، بەڵکو) ئەمانە ئاوەڵکارن بە واتای but rather, peraps

٣- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا لاپەڕە (١٥٠) دەڵێت:

(بەڵکو، بەڵکوم، بەڵکەم، بەڵکم) ئامرازی پێبەستن، واتە عەتفن وەک:

ئەم دەرمانانەت بۆ دەنووسم بەڵکو سوودی لێ وەربگریت.

٤- مامۆستا جگەرخوێن لە کتێبەکەیدا (ئاواو دەستوورا زمانی کوردی) لاپەڕە (٩٨) لە ژێر ئالاقی گومان (التشکیک)، ئامرازی (بەلکی) بە ئالاقی گومان دادەنێت و ئەم نموونەیەی بۆ دەهێنێتەوە:

بەلکی دیواریّ ب گوهـ بن ب خوه دیّ کی ب خوه دیّ

به تو رەنگی تومەکە ئەشکرە ئەسراریّ حدوث

لەم نمایشتەی سەرەوە، وا دەردەکەوێت، کە تەنیا نووری عەلی ئەمین ئەم ئامرازەی (بەڵکو)ی بە (عطف) داناوە.

لیژنە ئەم نموونانەی خوارەوە دەهێنێتەوە بۆ دیارخستنی جۆر و دەوری ئامرازی (بەڵکو) لە ئاخاوتندا، وەک:

خۆت بگرە بەڵکو دەگەنە جێ.

دەغڵ دەچێنم بەڵکو بەم بارانە شین بێت.

بەڵکو هەزار کەسیش دەبوون، لە جادە راوەستابوون.

بەڵکو واش بێت.

بەڵکو خوا رەحمی پێ بکات.

لە نموونەکانی یەکەم و دووەم ئامرازی (بەڵکو) دوو رستەی ئاشکرای بەیەکەوە بەستووەتەوە لە هەمان کاتیشدا، واتای (احتمال) دەگەیەنێت.

لە سێ نموونەکانی تردا بە رواڵەت هەر یەک رستە هەیە، بەڵام بە پێی داخوازیی واتا رستەیێکی قرتاو هەیە، کە دەشێت بێتەوە ناو ئاخاوتن و دەوری (بەیەکەوە بەستن)ی ئامرازی (بەڵکو) نیشان بدات.

لە نموونەی هەرە دواییدا وشەی (بەڵکو) لە پەنای واتای (احتمال)دا واتای ئاواتیش بە دەستەوە دەدات.

ئاشکرایە ئەم شێوە بەکارهێنانەی (بەڵکو)، کە رستەی قرتاوی تێدایە، شێوەی (بەلاغی و ئیدیەمی)یە. لە تێکڕای نموونەکان دەردەکەوێت، کەوا (بەڵکو) سێ مەبەست بە دەستەوە دەدات:

١- عطف (ربط).

٢- احتمال ( کە دەکێشێتەوە سەر گومان).

٣- ئاوات.

لە هەموو ئەو حاڵەتانەشدا ئامرازی (بەڵکو) وەک ئاوەڵکار بەکار هاتووە.

ئەم رواڵەتانەشی لە شێوە ئاخاوتنی جۆر جۆری کوردیدا دێنە بەرچاو:

(بەڵکە، بەڵکی بەڵکەم، بەڵکم، بەڵکوم، بەڵکونێ، بەڵکینێ، بەرکی، بەرکونێ، بەرکینێ...).

١٨- ئامرازی (بەشکو)ی عەتف:

نووسەرانی کورد بەم جۆرە لێی دواون:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە لاپەڕە (٥٣) صرف و نحوەکەیدا دەڵێ:

ئامرازی (بەشکم) ئامرازی (ترجی)یە، ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە:

بەیانی زوو هەڵسە بەشکم مطالای دەرسەکانت بکەی.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (١٣)ی فەرهەنگەکەیدا دەڵێ:

(بەشکە، بەشکێکو، بەشکم، بەشکو) ئاوەڵکار و ئامرازی عەتفە..

لێرەدا تێبینی دەکرێ کە مامۆستا وەهبی لە بارەی (بەڵکە)وە لە فەرهەنگەکەیدا گوتی ئاوەڵکارە، نەک ئاوەڵکار و عەتف وەک (بەشکە)، لە واتاشدا فەرقی پێ کردوون [بگەڕێوە بۆ فەرهەنگەکە].

٣- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا، لاپەڕە (١٥٠)، دەڵێ: (بەشکو، بەشکوم، بەشکم، بەشکە، بەشکەم) ئامرازی عەتفن و ئەم نموونەیەشی هێناوەتەوە:

ئەچم بۆ ئەوێ بەشکو چاوێکم پێی بکەوێ.

لیژنە لە دوا ئەم نمایشتە کەوتە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی.

ئەم نموونانەی خوارەوە جۆری بەکارهێنان و دەوری (بەشکو) لە ئاخاوتندا دەردەخات:

وا من دەچم بەشکو تۆش لە دوای من بتوانی بێیت.

«خوایە هەڵکەنی ئەو کێوە لە بن»

«بەشکو دەرکەوێ نووری دیدەی من»

پێی بڵێن بەشکو بە قسەتان بکات.

دەبوو دەغڵەکەم بچاندایە بەشکو بەو بارانە شین بووبوایە.

لەم نموونانەوە دەردەکەوێ کەوا (بەشکو)ش وەک (بەڵکو) ئەم سێ واتایەی تێدایە: ١- تێک بەستن (عطف) ٢- شیمانە (احتمال) ٣- ئاوات. بەڵام وا دێتە بەرهەست و هۆشی گوێگرەوە کە واتای (ئاوات - ترجی) لە ئامرازی (بەشکو)دا

بەهێزتر بێ تا ئامرازی (بەڵکو).

جگە لەم شێوە بەکارهێنانەی ناو نموونەکانی سەرەوە، جووتە ئامرازی (بەڵکو، بەشکو) بەکارهێنانی (بلاغی - رەوانێبژی) و ئیدیەمیشیان هەیە.

لەم شێوە بەکارهێنانەیدا یەکێک لە دوو رستە تێک بەستراوەکان تێ دەچێ بەلام واتا و وجوودیان لە زیهندا هەستی پێ دەکرێ، وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

بەشکو خوا بیدات.

بەڵکو منیش بێم.

بەڵکو بە هیچ رازی نەبێت.

بەشکو تا ئەو کاتە چاک دەبمەوە.

بەشکم هیچیش..

(بەشکو) ئەم شێوانەی تریشی هەیە لە ئاخاوتنی ناوچەکانی کوردستاندا: (بەشکە، بەشکێکو، بەشکم، بەشکوم، بەشکەم، بەشکی، بەشکینێ، بەشکونێ).

١٩- ئامرازی (جگە)ی عەتف:

نووسەرانی کورد بەم شێوەیە لێی دواون:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا، لاپەڕە (١٠)، وشەی (بەجگە)ی نووسیوە و حەواڵەی وشەی (بێجگە)ی دەکات. لە لاپەڕە (١٥)دا وشەی (بێجگە) بە ئاوەڵناو دادەنێت واتاکەشی different, separate دادەنێت. ئینجا وشەی (بێجگەلە) بە واتای inaddition, besides دادەنێت. لە کۆتاییدا دەڵێ (بەراوردی بکە لەگەڵ «جگە»). لە لاپەڕە (٢٢) وشەی (جگە) بە ئاوەڵناو و ئاوەڵکار دادەنێت بە واتای separately, separate. وشەی (جگەلە) بە واتای ex- cept, apart from, besides لە قەڵەم دەدات. دواتر (جگەکردن) بە واتای except دادەنێت دەڵێ (بەراوردی بکە لەگەڵ «بەجگە، بێجگە»).

٢- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا، لاپەڕە (١٥١) دەڵێت: ئامرازی (جگە، بێجگە) ئامرازی عەتفن. ئەم نموونایەشی هێناوەتەوە:

قوتابییەکان ژیرن جگە لە شاسوار.

٣- له كتيبی (زمان و ئەدەبی کوردی) پۆلی شەشەم، لاپەڕە ٢٣، لە ژێر ناوی (ئامرازی لێ دەرهێنان - استثناء -) دەڵێت: لە زمانی کوردیدا وشەی (بێجگە، جگە، تەنیا، هەر) بۆ لێ دەرهێنان لە کاتی گفتۆگۆکردنا، کە یەکێک لە تاقمێک دەربهاوێژرێ کە کارەکەی نەکردبێت یان بە پێچەوانە وەکو:

هەموویان فرمانەکانیان بەجێ هێناوە تەنیا ئازاد نەبێت.

گشت منداڵەکان خەویان لێ کەوتووە جگە لە ئاسۆ و ئارام.

هەموویان چووین بۆ سینەما هەر کامەران نەبێت.

لە دوا ئەم نمایشتە، لیژنە ئەم نموونانەی خوارەوەی هێنانەوە بۆ دەرخستنی جۆری بەکارهێنان و دەوری ئامرازی (جگە) لە ئاخاوتندا:

١- جگە لە تۆ، کەس نەهات.

٢- جگە لە تۆ، هەموو هاتن.

٣- جگە لە مامۆستاکان، کەس نەهات.

٤- جگە لە مامۆستاکان، قوتابییەکان نەهاتن.

٥- جگە لە دار، نانیشم کڕی.

بە سرنج گرتن لە نموونەکان ئەم راستییانەی خوارەوە دەردەکەون:

آ- لە نموونەی (١، ٢، ٣)دا ئامرازی (جگە) دەوری (استثنا)ی پێچەوانەی دیتووە، واتە موستاسناکە (تۆ، مامۆستاکان) پێچەوانەی ئەو مەبەستەیە کە لە رستەی (معطوف)دایە (رستەی معطوف: کەس نەهات، هەموو هاتن).

ب- لەو نموونانەدا موستاسناکە (تۆ، مامۆستاکان) لە جینسی (استثنا لێکراوەکان)ە چونکە (تۆ، مامۆستاکان) هەمووتان کەسن، بەڵام هەموو کەس (تۆ، مامۆستا) نین.

جـ- لە نموونەی چوارەمدا موستەسناکە (مامۆستاکان) و (استثنا لێ کراوەکان) هیچ یەکێکیان لە جینسی ئەوی تر نییە.

د- لە نموونەی پێنجەمدا ئامرازی (جگە) هەر ئەوەندە دەورەی دیتووە کە تەئکیدێکی موستەسناکە (دار)ی کردووە، بەڵام لە معطوفەکە (نان)ی دانەبڕیوە.

لیژنه به پێی بۆچوونی خۆی وا به چاک دەزانێت زاراوەی سەربەخۆ بۆ ئەم زۆر چەشنییەی دەوری (جگە) دابنرێت. وەک بۆ لیژنە دەردەکەوێت، دەشێ بگوترێ (جگە) ئەم دەورانەی خوارەوە دەبینێت:

١- استثنای پێچەوانە (نموونەکانی ١، ٢، ٣).

٢- استثنای دابڕاو (نموونەی ٤- لە عەرەبی پێی دەڵێ استثناء منقطع).

٣- استثنای خستنە سەر (اضافە) وەک لە نموونە (٤) دەردەکەوێت.

بێ گومان جۆری تریش هەیە کە ناوی سەربەخۆ هەڵبگرێ بە لێوردبوونەوە و بە دواداگەڕان دەدۆزرێتەوە.

لیژنە ئەم تێبینییانەشی خستە پاڵ شیکردنەوە و دابەشکردنەکەی سەرەوە:

تێبینی (١):

هەمیشە بە دوا ئامرازی (جگە)دا پریپۆزیشنی (لە) دێت.

تێبینی (٢):

دەشێ لە جیاتی (جگەلە) ئامرازی (بێ لە) بەکار دبێت وەک:

بێ لە تۆ کەس نەهات.

بێ لە تۆ هەموو هاتن.

هەموو رستەیێکی تریش کە (جگەلە)ی تێدا بێت هەڵدەگرێ (بێ لە) بخرێتە جێگایەوە.

لەم بەکارهێنانەی (بێ لە)دا ئامرازی (بێ) جودا دەکرێتەوە لەو حاڵەتەی کە وەک پریپۆزیشن بەکار دێت و ئامرازی (لە)ی پێوە نابێت، وەک:

بێ تۆ ناچمە سەفەر (نەگوترا بێ لە تۆ).

بێ پارە دنیا خۆش نییە (نە گوترا بێ لە پارە).

تێبینی (٣):

وا دەبێ ئامرازی (جگە) لەگەڵ وشەی (هەر) دەکەونە یەک رستەوە، وەک:

جگە لە من هەرتۆ هاتیت.

جگە لە من هەرتۆ نەهاتیت.

لەم حاڵانەدا معطوفەکە (تۆ) بە تەواویی حوکمی موستەسناکە (من) وەردەگرێت چ ئەرێتی (اثبات) بێ و چ نەرێتی (نفی) بێ.

تێبینی (٤):

دیسانەوە وا دەبێ ئامرازی (جگە) لەگەڵ ئامرازی (ش)ی عەتف کۆ دەبێتەوە، وەک:

جگە لە من تۆش هاتیت.

جگە لە من تۆش نەهاتیت.

لیژنە، پێشووتر، باسی بەیەکەوە هاتنی (جگە) و (ش)ی عەتفی کردبوو، بەڵام لێرەدا کە سەرلەنوێ بۆ باسەکە گەڕایەوە مەبەستی دەربڕینی تێبینییەکی گرنگ بوو: هاتنی (ش) لەگەڵ (جگە)دا هەمان دەور دەبینێت کە ئامرازی (هەر) دەیبینێت لەو رووەوە کە (ش)یش (معطوف و معطوف علیە) دەخاتە ژێر یەک حوکمەوە چ ئەرێتی بێ چ نەرێتی بەڵام فەرقێکی بەرچاو هەبێ لە بەکارهێنانی (هەر)دا ئەوەیە کە هەست بە جۆرێک تەئکید دەکرێت لەچاو بەکارهێنانی (ش)دا، هەروەها ژمارەی معطوفیش کەمتر دەکاتەوە لەوەی کە (ش) دەیکات: بە نموونە، دەتوانی بڵێیت (جگە لە تۆ منیش و داراش و ئەحمەدیش و زاناش، هاتین، وەیا من و دارا و ئەحمەد و زاناش هاتین)، دەتوانی لەوەندەش رانەوەستیت و ژمارەیێکی زۆری تر بخەیتە سەر کەسەکان. بەڵام کە (هەر)ت بەکار هێنا:

١- ناتوانی وشەی (هەر) دووبارە و سێبارە... و دەبارە بکەیتەوە وەک کە وشەی (ش)ت دەبارە کردەوە.

٢- ناشێ شریتەی معطوفەکان درێژ بکەیتەوە بۆ زیاتر لە ٣ - ٤ ژمارە.

ئامرازی (جگە) ئەم رواڵەتانەی تریشی هەیە لە شێوەکانی ئاخاوتنی کوردیدا: (بێجگە، بێجگەم، بێجگێ، بەجگە، بەجگەم، بەجگێ..).

مامۆستا مەسعوود دەڵێت: لە هەندێ شێوە ئاخاوتندا (جگەر، بێجگەر)یش بەکار دەهێندرێت، بەڵام نادروستە.

٢٠- ئامرازی (هەر)ی عەتف:

لەو نووسەرانەی کورد کە لە ئامرازی (هەر) دواون:

یەکەم- لە کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) پۆلی شەشەمی ئامادەیی لاپەڕە (٢٣) گوتراوە:

لە زمانی کوردیدا وشەی (هەر) بۆ لێ دەرهێنان بەکار دەهێنرێت، وەک:

هەموومان چووین بۆ سینەما هەر کامەران نەهات.

دووەم- مامۆستا جگەرخوێن لە کتێبەکەی (ئاوائو دەستورا زمانی کوردی) لاپەڕە (١٠١)دا، لە ژێر ناوی (آلاقی گشتی)دا، دەڵێت:

ئامرازی (هەر) بۆ حەسر بەکار دێت، ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە:

هەر کەس دزانی رێیا باش کیژایە.

سێیەم- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا، لاپەڕە (٦٣) بە درێژی لەسەر وشەی (هەر) ڕۆیشتووە و بەم جۆرە لێی دواوە:

١- هەر (ئاوەڵکارە) بە واتای Only, Just هەتاد... وک:

هەردوێنێ.

هەروەها.

هەربژی.

هەرمیوە ئەخۆم.

میوە هەر ئەخۆم.

٢- هەر (ئاوەڵناوە) بە واتای any, every, each بەکار دەهێنرێت، وەک:

هەردووک

هەرسێک

هەرچوار

هەروەها لەگەڵ پاشگری (ێ، ێک)یش بەکار دەهێنرێت، وەک:

هەر منداڵێ - هەر منداڵێک.

هەر ڕۆژێ - هەر ڕۆژێک.

لەگەڵ پاشگری (ە)شدا بەکار دێت، وەک:

هەر عەقڵە لە کارێک.

٣- هەر (بە لێکدراوی)، وەک:

أ- هەرچی (ئاوەڵناو)

ب- هەرچەند، هەرچەندە، هەرچەندێک، هەرچەندێ (ئاوەڵکار، راناو، ئاوەڵناو - کە لەگەڵ «بەڵام، دیسانەوە» دەبێتە ئامرازی عەتف.)

بەواتای

how, however many, however much, although, ever often.

جـ- هەرچی (راناو - ئاوەڵناو...) بەواتای: whoever, whatever, any هەرچی یەتە ئێـرە بەخـێـر بێ.. چی تۆ ئەڵێی منیش هەر ئەوە ئەڵێم - هەرچی وەکـو - هەرچی یێ وەکو (هەرچییێ کو) هەرچی و پەرچی (ئاوەڵناو).

د- هەرچۆن (ئاوەڵکار، ئاوەڵناو) بە واتای:

howsoever, whatever kind of, however.

وەک (هەرچۆنێ رزگار بووبێ، هەرچۆن خانووێ بێ، خانووەکە هەرچۆنێ بێ).

هـ- هەرکام (راناو) بە واتای whichever one هەرکەسێ (راناو) بە واتای whoev-er. هەر کوێیێ (راناو) wherever, whatever place. هەر ڕۆژێ (ئاوەڵکار) بە واتای every day, any day. هەر شتێ (راناو) بە واتای what-ever.

چوارەم- لە کتێبی «دەستور پارسی» دانانی ر. ذوالنور لاپەڕە (٢٠٩، ٢١٠)دا، دەڵێت: «هر گاە، هروقت کە» حروفی ربطن.

لە دوا ئەم نمایشتە لیژنە ماوەی دا بە ئەندامەکانی تاکو هەریەکە بیروباوەڕی خۆی دەربارەی ئەم ئامرازە دەرببڕێت.

نووری عەلی ئەمین لە بارەی وشەی (هەر)ەوە، بیروڕای خۆی بەم جۆرە دەربڕی:

وشەی (هەر) لە رستەدا بۆ ئەم مەبەستانە بەکار دەهێنرێت:

١- وەسفی (کار) دەکات و دەبێتە (ئاوەڵکار)، وەک:

گۆیژە هەربگری تا ئاخر زەمان

ئیتر کێ بتلاوێنێ بە ئەشعاری جوان
منداڵەکە هەر گریا، هەتا خەوی لێ کەوت.
تۆ بڕۆ، من هەر دێم.
٢- وەسفی ناو دەکات و دەبێتە ئاوەڵناو، وەک:
من هەر سێوە دەخۆم.
هەرچرای دیوەخانەکە دابگیرسێنە.
هەر - سوار - ێ بێرەدا تێ پەڕی پێم بڵێ.
٣- وەسفی هەموو جۆرەکانی «راناو» دەکات و دەبێتە ئاوەڵناو، وەک:
هەر - کەس - لە ئاشێ دەکات.
هەر - کام - تان هاتن وەرن.
هەر - چی - دەخۆیت، بخۆ.
هەر - من - لە تۆ باشترم.
هەر - هێن - هات بۆ ئێرە.
هەر - ئەمە -م لەلا جوانە.
من هەر - خۆم - کەوتمە ناویان.
٤- وەسفی ئاوەڵکار دەکات و دەبێتە ئاوەڵکار، وەک:
هەر - ڕۆژ - ێ هاتم، دێم.
هەر - جار -ە خۆی بە جۆری دەگۆڕێت.
هەر - کەی - هاتیت، من لێرە دەبینی.
هەر - وەها - دابنیشە، هەتا وێنەکەت دەگرم.
هەر - وا - دەڕوا وێنەی پۆڕێ
ڕۆژی حەوت جار خۆی دەگۆڕێ
باران هەر - هەند - ێ باری.
هەر - چۆن - ێ بیفرۆشێت، قازانج دەکات.
لە هەر - کوێ - دەخۆیت، بخۆ.
ئاوەکە هەر - تۆز - ێ گەرم بوو.

٥- وەسفی هەموو جۆرەکانی «ئاوەڵناو» دەکات و دەبێتە ئاوەڵکار، وەک:

هەر - ئەم باخە - میوەی خۆشی تێدایە.

هەر - هەندێ سێو -م بۆ بکڕە.

هەر - چەند ئەسپێک - م لە پاوەنەکەدا دی.

٦- وەسفی ئامرازی پێوەندی (تعلق) دەکات و دەبێتە تەواوکەری، وەک:

مامۆستا بۆ ئێمە هەر وەک باوکە.

من لە بەیانییەوە هەتا ئێواریێ کار دەکەم.

هەر لەسەر شەقامەکە چاوەڕوانم بن.

بە بیروڕای من بڕگەی (هە)ی ئامرازی (هەتا) لە بنەڕەتدا (هەر) بووە و سوواوە و بووە بە (هە) بۆ سووکی، هەروەها هاوەڵەکانی تری (هەتا)، وەک (هەتاکو، هەتاوەکو، هەتاوەکونی...).

٧- وەسفی ئامرازی عەتف دەکات و دەبێتە تەواوکەری، وەک:

هەرکە هاوین هات، دەچین بۆ کوێستان.

هەتاوەکو گوڵەکان ئاو نەدەم، نانەکەم ناخۆم.

وشەی (هەر):

١- جاری ئەوتۆ هەیە بە سادەیی ئەرکی خۆی لە رستەدا دەبینێت، وەک:

هەر کەس لە ئاشێک دەکات.

من هەر براکەی جارانتم.

منداڵەکان هاتن، هەر قادر نەهاتووە.

٢- جاری ئەوتۆ هەیە ئەرکەکەی بە یاریدەی پاشگری (ێ - ێک)، وەیا (ە) بەجێ دەهێنێت، وەک:

هەر - کەس - ێ هات، ئاگادارم بکە.

هەر - شەو - ێ هاتم، دێم.

هەر - جار -ە بیانوویەکم پێ دەگرێت.

هەر - جووتیار -ە با زەویی خۆی بکێڵێت.

بەڵام لە رووی واتاوە بۆ ئەم مەبەستانە بەکار دەهێنرێت:

١- حەسر، وەک:

هەر ترێ دەخۆم.

هەر بە شەو دەچمە دەرێ.

هەر کراسی سپی لەبەر دەکەم.

٢- بۆ (استثناء)، وەک:

منداڵەکان هاتن، هەر تۆ نەهاتیت.

سەوزەکەم هەموو خوارد، هەر کەوەرەکە نەبێت.

وشەی (هەر) ئەگەر بەتەنیا، واتە بەبێ پاشگری (ێ، ێک، ە) وەسفی وشەیێکی کرد، ئەوە شێوەی سادەیەتی، وەک:

هەر گوڵ دەڕوێنم.

هەربژی...

خۆ ئەگەر بە یاریدەی ئەو پاشگرانە وەسفی وشەیێکی کرد، وەیا چووە پاڵ وشەیێکی تر بەبێ یاریدە، بە هەردووکیان شێوەی لێکدراوی (هەر) دەخەنە بەرچاو، وەک:

هەر (شار)ێ چووبێتم، هاوڕێیەکم دۆزیوەتەوە.

هەر (جار)ە دیارییەکم بۆ ناردووە.

هەر (چۆن)ی بوو، خۆم گەیاندێ.

هەرکە دەرگاکەم کردەوە، با ورووژمی هێنا.

هەتاوەکو من دێمە، ئێوە نانەکەتان بخۆن.

هەروەها ئەگەر وشەی (هەر) لەگەڵ ئامرازێ یا وشەیێکی تر دوو رستەیان پێکەوە گرێ دا، ئەوا (ئامرازی عەتف)ە، جگە لەوەی کە کاری خۆی لەو وشەیە دەکات، کە وەسفی کردووە.

ب- سادق بەهائەدین لە بار (هەر)ەوە ئەمەی خوارەوە دەڵێ:

ئەڤ بێژەیە درستەیدا وەکی ئالاڤێ پێوەند و وەک بێژەیەکا جودا ب گەلەک کریارا رادبیت هەروەکی ژڤان نموونێت ژێری دیار دبیت:

١- ژ مالێ هەر تو زانایی.

٢- ژڤان هەمیان هەر ئەو پسپۆریێ مالێیە.

٣- ژمە هەر سەروەر مێرێ هەوارانە.

٤- هەر من بتنێ مال بارکر، یێت مایی هەمی رونیشتی بوون.

٥- هەر پەز و پێبکێ خو (خویە).

٦- ئەم هەرچوین، هەر چوین هەتاکو گەهشتین.

٧- هەر مالێ (مالەکێ) ئێک ژێ هاتە شەهیانێ.

٨- هەر و هەم ئەم مێهڤان حەوینین.

٩- هەر ژمن (هەژ من) و هەر ژتە (هەژ تە) کا دێ کی ژ مە ژکێ (ژ یێ دی) بەت.

١٠- هەر سڤوورە و منا خو.

١١- هەر بن دارەک وارەکە.

١٢- هەر ئەو وارە بەلێ نە ئەو بهارە.

ژڤان رستەیێت زۆری دیار و ئەشکەرا دبیت کو بێژەیا (هەر) هندە جارا ئالاڤێ (ئامرازێ) پێوەندییە. هەر وەکی درستەیێ هژمارە (٦)، (٩)، (١١) و (١٢) دیار دبیت، بەلێ ئەڤ ئالاڤە ژبو (حەصر) و استمرارییەت دگەل جهناڤی، ناڤی و کرنێ (کار) ل کارە، کو هەڤالناڤی، جهناڤی یان نیری (ئاوەڵکاری) وەسف دکەت یان ژی بەلاغییە هەر وەکی د هژمارە (٥)، (١٠)، (١١)، (١٢) دیار دبیت کو سەرهاتی نە (پەندی پێشینانن).

[روونکردنەوە:

بەلای باوەڕی منەوە چی مامۆستا وەهبی و نووری عەلی ئەمین لە بارەی (هەر)یان نووسیوە نزیکە سەرلەبەری دەوری (هەر) لە ئاخاوتندا باس بکات، چونکە ئەو نموونانەی نیشانیان داوە شتێکی ئەوتۆیان هەڵنەبژاردووە لە جۆری بەکارهێنانی (هەر) و دەوری لە رستەی کوردیدا، بەتایبەتی نووری عەلی ئەمین، گەلێک لایەنی مەیلەو شرایەوەی لە بەکارهێنانی (هەر) روون کردووەتەوە. لێرەدا دەشێ بڵێم ئەم دوو جۆرەی خوارەوە لە بەکارهێنانی (هەر) باسیان نەکراوە لە نووسینەکانی مامۆستا وەهبی و نووری عەلی ئەمیندا:

١- هەر دەڕۆم و نایگەمێ. هەر دەخۆم و تێر نابم.

لەم بەکارهێنانەدا سەرەڕای (بەردەوامی) و بەولای عەتفی عادەتییەوە جۆرێک (تلازم) هەیە کە لە نموونەکانی نووری عەلی ئەمین پەیدا نییە. دوو نموونەی: (أ- گۆیژە هەر بگری تا ئاخر زەمان. ب- منداڵەکە هەر گریا تا خەوی لێ کەوت) بەردەوامی و عەتفیان تێدایە، بەڵام ئەو (تلازم)ە مەعنەوییەیان تێدا نییە کە لە دوو رستەی ژمارە (١)ی سەرەوەدا هەیە. پێوەندیی نێوان (هەر گریا) و (تا خەوی لێ کەوت) پێوەندیی (سەرەتا و کۆتایی - پێشەکی و ئەنجام)ە نەک (تلازم). ئەم واتایە تایبەتییەی ناو رستەکانی نموونەی ژمارە (١) وای کردووە رستەکان (و)ی عەتف بەخۆیانەوە بگرن، کە دەزانین لە رستە نموونەکانی نووری عەلی ئەمین هاتنی (و) مومکین نییە. دەشێ بڵێین ئەمەش یەکێکە لەو بەکارهێنانەی (و) لەگەڵ (هەر)دا کە تا ئێستا بەوردی باسی لێ نەکراوە. بەڵێ، مومکینە ئەم (و)ە لە رستەکان دەربهاوێژرێت و بگوترێ (هەر دەڕۆم نایگەمێ - هەر دەخۆم تێر نابم) بەڵام ئاشکرایە واتای (تلازم)ە باس لێکراوەکە زۆر کز دەبێتەوە. بەهەمەحاڵ دەرهاویشتنی (و)ەکە لە رستەکاندا ئەو راستییە رەش ناکاتەوە کە هاتنی (و) هەر لەم جۆرە بەکارهێنانەدا جیایەزە، جۆرەکانی پێشتر باسیان کرا، (و)یان تێدا نابێ تاکو بڵێین دەشێ یا ناشێ لێیان دەربهاوێژرێ.

٢- هەر خەڵقە و بەرەو شایی دەڕوات. هەر پارەیە و هەڵدەڕژێ.

لەم نموونانەدا (تلازم) پەیدا نییە بەڵام بەدوایەکترداهاتن (تتابع)ێک پەیدایە کە ڕێ نادا (و)ەکە دەربهاوێژرێت لە رستەکان. ئەم دوو نموونەیەی ژمارە (٢) بەلای کەمەوە لە دوو رووەوە جودا دەبنەوە لە رستەکانی ژمارە (١):

أ- لەلایەن ئەوەوە کە واتای (تتابع) مەبەستە نەک (تلازم)، هەر ئەمەش هۆی تێ نەچوونی (و)ەکەیە.

ب- ئامرازی (هەر) لەم نموونانەی ژمارە(٢)دا کەوتوونەتە پێش ناوەوە

(هەر خەڵقە - هەر پارەیە) لە حاڵێکدا (هەر)ی رستەکانی ژمارە (١) کەوتبوونە پێش کارەوە (هەر دەڕۆم - هەر دەخۆم). سەرنج دەری دەخات، زۆر جێی خۆیەتی ئەم (و)ە لە نێوان (ناو)اندا واتای (تتابع) پەیدا بکات چونکە ئەو شتانە و ئەو کەسانەی بەر واتای (ناو) دەکەون قابیلی ژماردنن، (تتابع)یش خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە ژمران، وەک کە دەنکە تەزبیح بەدوا یەکتردا بەڕێ دەکرێن لە واقیعدا دەژمرێن هەرچەند ژمارەشیان بۆ بەکار نایەت. دەبێ بشڵێم (تتابع) لە نێوان تاکەکانی (خەڵق، پارە)دا پەیدایە نەک لە نێوان ئەوان و فیعلەکاندا.

ئەم (تتابع)ەی کە بە هۆی واوی عەتفەوە پەیدا بووە وای کردووە وشەی (هەر) لە بەرایی رستەدا تەرخان بێت بۆ ئەو ناوەی بەدوایدا دێت (هەر پیاوە - هەر پارەیە). لەبەر ئەمە بە هیچ تەئویلێک مومکین نییە بگوترێ لێرەدا (هەر) ئاوەڵناوە و پێوەندیی بە فعلەکانی کۆتاییی رستەکانەوە هەیە. پچڕانەوەی (هەر) لە فیعلەکانی کۆتاییی رستەکان لە دوو راستی زۆر ئاشکراوە بە ئیسپات دەگات:

یەکەم: لەوەوە کە ئەگەر واوی عەتف هەڵگیرا و گوترا هەر خەڵقە بەرەو شایی دەڕوا... واتای (تتابع) بەجارێ هەڵدەستێ و رستەی (بەرەو شایی دەڕوا)ش دەبێتە رستەیێکی خەبەری و وەسفی عادەتی.

دووەم: ئەگەر لە گوتەی (هەر خەڵقە و - هەر پارەیە و)دا ئەم راناوەی (ە - یە) هەڵستێت [کە خۆی پێکهێنەری ئیسنادە] و بگوترێ (هەر خەڵق - هەر پیاو) ئەوسا ئیمکان نامێنێ بۆ مانەوەی (و)ی عەتف لە رستەدا چونکە جێگای واتای (تتابع) نامێنێ و وشەی (هەر) تەنیا واتای (حصر) دەگەیەنێت، دیاریشە (حصر) داخوازیی واوی عەتف ناکات. تۆ کە گوتت (هەر خەڵق و بەرەو شایی دەڕوات..) شتێکت گوتووە بێ واتا. [لێرەدا مناقشەی ئەو لایەنە ناکەم ئایا ئەگەر لە جێگەی دوو وشەی «خەڵق، پارە» کە کەسی سێیەمن، راناوی کەسی یەکەم و دووەم لەکار بهێنرێت - بەتایبەتی تاکەکانیان کە «من، تۆ»یە - ئایا ئەم لەکارهێنانە راستە یا هەڵەیە؟ کە گوتت (هەر ئێمەین و

بۆی دەردەچین – هەر ئێوەن و هەڵدێن – هەر منم و ئاو دەخۆمەوە – هەر تۆیت و کاڵەک دەشکێنیت) ئایا دەشێ واتای (تتابع) لە (ئێمە و ئێوە)دا هەبێت بەو مەبەستەی کە هەرجارە یەکێکمان وەیا یەکێکتان کارەکەی کردبێت و (تتابع) لەو بەدوایەکتردا هاتنە بێتە دی؟ بە نیسبەت (من، تۆ)وە، ئایا دەشێ لە دووبارەکردنەوە و سێبارەکردنەوە و دەبارەکردنەوەی هەمان کار واتای (تتابع)ی (من، تۆ) لە (تتابع)ی کارەکاندا پەیدا بێت؟ دەمەتەقە لەسەر ئەم لایانانە درێژەی زۆری هەیە و خۆمی لێ لادەدەم، تەنیا ئەوەندە دەڵێم، ئەم دیاردە ڕێزمانییەش یەکێکە لەو فەرقانەی کە کەسانی یەکەم و دووەم لە کەسی سێیەم جودا دەکەنەوە لەو ڕووەوە کە کەسی یەکەم و دووەم مەحدوودە بە قسەکەر و قسە بۆ کراو ئیتر جێگریان پەیدا نابێت بەڵام کەسی سێیەم بریتییە لە هەموو دنیا و خەڵق و چشتی غەیری کەسی یەکەم و دووەم، هەریەکێکیش لەوان کە غائیبن هەزاران جێگریان هەیە....] کە هاتیت راناوی ئیسنادت لە ڕستەکە دەرهاویشت و لە جیاتی (هەر خەڵقە – هەر پارەیە) گوتت (هەر خەڵق – هەر پارە) بە ناچاری واوەکەی عەتف لادەچێت چونکە (تتابع) نەما (حصر) هاتە جێگەیەوە (هەر خەڵق دەچێتە شایی – هەر پارە هەڵدەڕژێ..).

ئەم لێکدانەوانە پتریان بەبەرەوەیە من لێیان دەبڕمەوە.

چەند تێبینییەکی گشتی هەی لەبارەی بیروڕای مامۆستا وەهبی و نووری و لەبارەی تێکڕای دەور و سروشتی (هەر)ەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەریان دەبڕم:

١– هەر ڕستەیێکی بێ کار وشەی (هەر)ی تێدا بوو دیارە لەوێدا (هەر) ئاوەڵکار نییە چونکە کە کار نەبوو ئاوەڵکاریش نابێ. بەو پێیە:

آ– کە گوتت (هەر دارا مەردە) و مەردایەتیت حەصر کرد لە دارا تەئسیری (هەر)ت بەخشی بە (دارا) لەوە بەولاوە بشڵێی (هەر دارا مەرد بوو – هەر دارا مەرد دەبێ) وشەی (هەر) نابێتە ئاوەڵکار چونکە بەبەر (دارا) بڕاوە و دەخلی بەسەر فعلەکەوە نییە.

ب- هەروەک کە گوتت (هەر دارا زۆر ئازایە) و بە هۆی نەبوونی فعل لە رستەکەدا (هەر) گومانی ئاوڵکاربوونی لێ ناکرێت، هەروەهاش (زۆر) لە رستەکەدا ناشێ بە (ئاوەڵکار) حیساب بکرێت هەرچەند وەصفی ئاوەڵناوێکی تریش دەکات چونکە، بەلای باوەڕی منەوە، وەسفکردنی کار وشە دەکاتە ئاوەڵکار.

جـ- وەک روون بووەوە لە خاڵی (أ - ب)دا، کاتێک وشەی (هەر) واتای حەصری بۆ ناو و ئاوەڵەکانی راگەیاند لە ئاوەڵکاری دەشۆرێت. لەمەوە دەردەکەوێت لە هەر رستەیێک و بێژەیێکدا وشەی (هەر) ئەم حەصرەی راگەیاند بۆ ناو و ئاوەڵەکانی ناشێ بە ئاوەڵکار بژمێردرێت چەنداوەکو لە رستەکەدا کار هەبێت. کە گوتت (هەر دارا دەڕوات) وەک ئەوەیە گوتبێتت (هەر دارا مەردە) وشەی (هەر) حەصری شتەکە دەکات [ڕۆیشتن یاخود مەردایەتی] لە دارادا.

٢- کە هات و دەوری (هەر) بۆ فعل بوو لە رستەدا ئەوسا دەبێتە ئاوەڵکار، لەمەشدا فەرق نییە ئایا بۆ حەصر بەکار هاتووە یا بۆ (تلازم)، یا بۆ واتای تر، وەک:

أ- بەردەوامی، بەنموونە: هەر دەڕوا هەتا دەگاتە ئاوەکە.

ب- (اصرار) و سووربوون لەسەر مەبەست: من ئەم کارە هەر دەبەمە سەر.

جـ- تەئکید: من هەر دێم بۆ لات. جوداوازی هەیە لە نێوان تەئکید و «اصرار»].

د- هاندان: هەر وەرە لام، پارەکەت دەدەمێ. هەر بێیتە لام بۆتی دەنووسم. ئەم بەکارهێنانە وا دەبێ بۆ خێراییکردن دەبێت: وەک: هەر گەیشتە جێ و کاغەزەکەی دامێ. بەلام دیارە لەمەیاندا واوێکی زیاد هاتووە کە واتاکە بەلای خێراییکردندا دەشکێنێتەوە. ئەم خێراییکردنە لە صیغەی ئایندەشدا دەبێت: هەر بگات و پارەکەی دەدەمێ، بەلام کە (و)ەکە لادرا و گوترا (هەر بگات پارەکەی دەدەمێ) دەبێتە مەرجێکی رووت.

دەشێ ئەم دارشتنە بۆ هەڕەشە بەکار بێت وەک: هەر بیگەمێ لێی دەدەم – هەر بیبینم خۆم دەزانم چیی لێ دەکەم. لەوانەیە لە باری پێچەوانەدا بۆ ترسان بەکار بێت وەک: هەر رێی هەبێ پلارم تێ دەگرێ.. زەرەرم لێ دەدات.. دەرم دەکات... هتد.

سەرنج دەری دەخات نموونەکانی ئەم تاقمەی (د) جگە لەوەی واوی زیادی تێدابوو، هەموویان بە رستەی ئینشائی دەست پێ دەکەن.

لەو رستانەی بە (انشاء) دەست پێ دەکەن، سەرەڕای هاندان و ترس و هەڕەشە و واتای تریش کە هەبێ، واتای (مەرج) هەیە.

٣– جوداکردنەوەی (هەر) کە بۆ (حصر) بێ لەو (هەر)ەی کە بۆ بەردەوامییە بە سەلیقە و بە پێی جۆری دەربڕینی ئاخاوتن دەبێت چونکە هەردوو مەبەست یەک شێوە بەکارهێنانی (هەر)یان هەیە. کە گوتت (دارا هەر خواردی) لەوانەیە مەبەستت ئەوەبێ کە زۆر بەردەوام بووە لەسەر خواردن، لەوانەیشە مەبەستت ئەوە بێ کە تەنیا خواردوویەتی و نەیخواردووەتەوە.

٤– لە لایەنی (ئاوەڵکار و ئاوڵناو...)بوونی (هەر)ەوە دەبێ ئەوە بزانین کە (وصف)ێک لە وشەی (هەر)ەوە بۆ ناوەکە وەیا کارەکە پەیدا نابێ چونکە لە (هەر)دا واتای (وصفیة) پەیدا نییە. هاتنی (هەر) لەگەڵ کاردا دەیکات بە ئاوەڵکار، هەروەهاش هاتنی لەگەڵ ناودا دەیکات بە ئاوەڵناو بێ ئەوە هاتنەکە دەخلی بەسەر (وصف)ەوە هەبێ. لە نیوەبەیتی حاجی قادردا کە دەڵێ (هەر منم ئێستە وارسی عیسا) وشەی (هەر) تەنیا ئەوەندەی کردووە کە وارسبوونی عیسای حەصر کردووە لە حاجی، لەمەشدا سێبەری وەسفیش پەیدا نابێ. کە دەشڵێی (هەر دەخۆم تا تێر دەبم) چ وەسفێکی کاری (خواردن)ت نەکردووە لەوە بەولاوە کە بەردەوامبوونی خۆت لەسەر خواردن بەو (هەر)ە دەربڕیوە. رستەی (هەر دەخۆم) موقارەنە بکە لەگەڵ (تێر دەخۆم) دەبینی لە تێرخواردندا وەسف هەیە وەک ئەوەی گوتبێتت (خواردنێکی تێر دەخۆم)، کەچی (هەر دەخۆم) پێداگرتن و سووربوون

لەسەر خواردنی تێدایە و بەس کە وا بە هیچ کلۆجێک و لە هیچ ڕوویێکەوە بەر واتای (وصف) ناکەون. ئەم ڕاستییە دوو ئەنجامی لێ دەکەوێتەوە:

آ- زاراوەی (ئاوەڵناو) دەخلێکی نییە بەسەر (صفە)ی عەرەبییەوە، ئەوەندە نەبێ کە ناوناوە ئاوەڵناوێکی کوردی وەک (جوان) کە وەسفی تێدایە، لەگەڵ سیفەتێکی عەرەبی وەک (جمیل) یەکتر دەگرنەوە.

ب- زاراوەی (ئاوەڵناو) تەنیا ئەوەندەی بە مەبەست گرتووە کە وشە لەگەڵ ناودا بێت، ئیتر وەسفی بکات یا نەیکات. ئەم ڕاستییەیان وای کردووە گەلێک وشەی لەیەکترنەچووی بکەونە ژێر زاراوەی ئاوەڵناوەوە وەک کە وشەی (هەر) و وشەی (ئازا) لە دوو ڕستەی (هەر دارا هات - دارای ئازا هات) بە ئاوەڵناو بژمێردرێن لە حاڵێکدا، کەم و زۆر، خزمایەتییان لە نێواندا پەیدا نییە. ئەم ڕاستییە بەوەندە ڕەش نابێتەوە کە ئاوەڵناو دابەش بکرێ بە (وەسفی، چەندی، ژمارەیی.... هتاد): ئێمە ئەگەر بێین وشەی وەک (هەر) دابنێین لە ژێر ناونیشانی (ئەداتی پێداگرتن، حەصر، بەردەوام بوون... هتاد) و لە ئاوەڵناوی وەربگرینەوە چ زەرەرێک لە ڕێزمانی کوردی نادەین، بگرە خزمەتیشی دەکەین... ئەم تێبینییە زۆری بەبەرەوە هەیە، چی تری لەسەر ناڕۆم.

٥- وا دەزانم وشەی (هەرە) کە ئامرازی (تفصیل)ی پلەی بالایە (Superlative)، ئەویش شێوەیێکی (هەر)ە. کە دەڵێی (هەرەجوان) بەردەوامیێکی سەرەوژووربردنی وشەی (جوان)ی تێدایە وەک ئەو بەردەوامییەکەی کە لە ڕستەی (هەر خەریک بوو - هەر داوای کرد - هەر بڕۆ....)دا هەستی پێ دەکرێت.

٦- تێبینی لە نموونەکانی مامۆستا وەهبی:

آ- کە دەڵێی (هەر دوێنێ)، لەوانەیە وشەی دوێنێ ڕستەیێکی وەهای بەدوادا بێت بیکاتە ئاوەڵکار وەیا ناوی کات. بە نموونە، لەم نیوە بەیتەی حاجی قادردا کە دەڵێ:

«هەر دوێنێ ئەهلی سوودان هەستانە پێ وەکو شێر»

وشـەی (دوێنـێ) ئاوەڵکارە چونکە کاری (هەسـتـان)ی تێدا پەیدا بووە، بەڵام کە گوتت (لەم هەفتەیەدا هەر دوێنێ ڕۆژێکی خۆش بوو) وشـەی دوێنێ (ناوی کـات)ە نەک ئاوەڵکار چونکە وەک ئەوەیە بگوترێ (لەم گـــــرووپەدا هەر دانا راســـــتگۆ دەرچوو). (دانا و دوێنـێ) لە یەک حـوکـمـدان. ئەوەندە هەیە لە بەکـارهێنانی ئەوتۆییـدا ناشـێ بڵـێی (...هەردوێنێ خـۆشـە وەیا هەر دوێنـێ خـۆش دەبێ) چونکە کـاتی بەسەر چووە هەروەک ناتوانی بڵێی (هەر دووسبەی خۆش بوو) چونکە جارێ دووسبەی پەیدا نەبووە، چ جایی ئەوەی بیدەیتە رابردوو.

ب- من لە وەدا هاوباوەڕی مامۆستا وەهبیم کە وشـەکانی (هەرچی - هەرچەند - هـەرچۆن) جـۆری لێکدراوی ئەداتی (هەر) بن وەیاخـود لێکدراوی (چی - چەند - چۆن) بن، بەڵام ناشـێ بڵـێین لەم وشـانەدا (هـەر) ئاوەڵکارە وەیا ئاوەڵناوە وەیا راناوە چونکە لـە حـــاڵەتی لێکدراویدا تێکڕای وشـە لێکدراوەکـان یەک وشـەی (لێکدراو) پێک دەهێـنن و وا دەبێ واتای تازەش بە دەسـتـەوە دەدەن. سـەرنج بگریت دەبینیت لە وشـەکـانی (هەرچی - هەرچەند - هـەرچۆن)دا واتایێکی (مـەرج) هەیە کە لە بنەڕەتدا (چی - چەند - چۆن) مـەرجـیان تێدا نیـیـە، وشـەی (هەر)یش نە لە تەنیا خـۆیدا مـەرج هەیە، نە هـەمـوو جارانیش لە رستەدا مەرج رادەگەیێنێت. [وشـەی «کام»یش لە حوکمی ئەواندایە].

جـ- وادەزانم وشەی (هەرچی و پەرچی) پێوەندیی بە وشەی (هەر)ەوە نەبێت. دوور نابینم لە (هرج و مرج)ی عەرەبییەوە وەرگیرابێت.

بەمەندە لەو تێبینییانە واز دەهێنم، هی تریش ماوە..

٧- تێبینی لە نموونەکانی عەلی ئەمین

أ- وشــەی (هـەر) لە تەرکـیـبی (هەرکـام - هـەرچی)دا بە ئاوەڵناو داندراوە وەک کە لە وشەکانی (هەر من - هەر هێن - هەر ئەمە - هەر خۆم)یشدا بە ئاوەڵناو داندراوە، قیاسیان لە یەکتر ناکرێت چونکە (هەرکـام - هـەرچی) جۆری لێکدراوی (هەر)ە لەگـەڵ ئەم وشـانەدا و

مەرج پێک دەهێنێت، بەڵام لەگەڵ (من - هێن - ئەمە - خۆم)دا وشەی لێکدراوی پێک نەهێناوە چونکە وەک ئەداتی (حصر) دەوری دیتووە... ئەم راستییە لە تێبینیی خاڵی (٦-)دا روون کراوەتەوە.

لێرەدا دەبێ شتێکی گرنگ بخرێتە بەر سەرنجەوە: من کە دەڵێم (هەرچی - هەرچۆن - هەرکام - هەرچەند - هەرکێ - هەرکوێ) وشەی لێکدراون و مەرج رادەگەیەنن، لەمەدا دیاردەیێکی رێزمانیی وردم رەچاو کردووە: (هەر) کە لەگەڵ ئەم وشە پرسیارییانەدا دێت و مەرج دروست دەکات، پێویستی بەهێنانی زیادە پاشگر نییە بۆ دروستکردنی وشە لێکدراوەکە و پەیداکردنی واتای مەرج، واتە پێویست نییە بگوترێ (هەرچییێک، هەرچۆنێک)، کەچی ئەگەر لە وشەی عادەتیدا بێت و مەرج دروست بکات پێویستە پاشگرێک بە تەرکیبەکەوە بنووسێت دەنا واتای مەرج پەیدا نابێت. بە نموونە کە دەڵێی (هەر شتێک - هەر کەسێک - هەر میوەیێک - هەر مەلێک.... هتاد) تەرکیبێکت دروست کردووە دەتوانێ (مەرج) داوا بکات وەک:

هەر مەلێک بفرێ دەیپێکم - هەر کەسێ بێتە لام ریزی لێ دەنێم -

«هەر کەسێ هات و گوتی من عاشقم باوەڕ مەکەن»

بەڵام کە ئەم ئەداتەی (ێک، ێ)ت لە وشەکان ستاندەوە مەرجیان لێ نافامرێتەوە وەک کە بڵێی (هەر مەل...) مومکین نییە رستەیێکی مەرجداری بەدوادا بێنیت بەڵکو رێت دەبێ (حصر) پەیدا کەیت وەک: (هەر مەل گۆشتی خۆشە)... ئەوەی راستی بێ ئەم تێبینییە تا بڵێی وردە و گەلێکیشی کێشە بەدوادا دێت کە ئێرە جێگەی وەها بەرفرەوانی تێدا پەیدا نابێت لەبەر ئەمە چی تر لەسەر تێبینییەکە ناڕۆم و بۆ سەرنجی خوێنەران و لێکۆڵینەوەی دوور و قووڵتری بەجێ دەهێڵم.

ب- من لە نووسینی دیکەمدا گوتوومە و لەم لێکۆڵینەوەشدا دووبارەم کردووەتەوە، ئاوەڵکار دەبێ لە رستەی خاوەن کارا بێت و پێوەندیی بەکارەکەوە هەبێت. بەم پێیە وشەی (هەر) کە لەگەڵ ئاوەڵناودا هات

نابێتە (ئاوەڵکار). کەواتە بەلای منەوە وشەی (هەر) لە تەرکیبەکانی (هەر ئەم باخە - هەر هەندێ سێو - هەر چەند ئەسپێک..)دا ئاوەڵکار نییە هەروەک وشەی (زۆر) لە (زۆر جوان)دا ئاوڵکار نییە. ئەم بۆچوونەی کە من لێرەدا پێی رازی نیم لە ڕێزمانی ئینگلیزییەوە هاتووە چونکە لەوێدا کە ئاوەڵناوێک ئاوەڵناوێکی تری وەسف کرد دەبێتە ئاوەڵکار..

جـ- وشەی (هەر) کە لەگەڵ ئامرازی پریپۆزیشن [نووری عەلی لە میسالەکاندا پێی دەڵێ ئامرازی تعلق] هات چ دەلالەتێکی ڕێزمانیی تایبەتی نییە کە پێویست بکات حوکمێکی سەربەخۆی لێ هەڵستێت، ئەوەندە نەبێ کە بگوترێ وشەی (هەر) هەڵدەگرێ بکەوێتە پێش جۆرەها وشەوە چونکە لەو بەیەکەوەهاتنەدا نە وەسف هەیە نە شێوەی لێکدراویش پەیدا بووە [تەرکیبی «هەر وەک - هەرتا، کە بووەتە هەتا» لێکۆڵینەوە هەڵدەگرێ]. کە دەڵێی (هەر لەسەر شەقامەکە راوەستابوو - هەر بۆ تۆ زەحمەتە - هەر بە تۆ دەوێرم...) دەوری (هەر) لە تێکرای رستەکەدایە نەک لەگەڵ (لە، بۆ، بە)دا.

د- لە لاپەڕە (٣٦٩)ی ئەم کتێبە، نووری عەلی ئەمین دوو نموونەی هێناوەتەوە کە بەلای رای ئەوەوە لەو نموونانەدا (هەر) دەوری (استثناء)ی دیتووە، نموونەکانیش ئەمانەن:

منداڵەکان هاتن، هەر تۆ نەهاتیت.

سەوزەکەم هەموو خوارد، هەر کەوەرەکە نەبێت.

نەختێک وردبوونەوە دەری دەخات وشەی (هەر) لەم رستانەدا پێوەندیی بە (استثناء)ەوە نییە چونکە دەورەکەی بریتییە لە (حصر) بەلام رستەکان مەنفین. ئێمە کە دەڵێین (هەر تۆ هاتیت) واتای (هاتن)مان حەصر کرد لە (تۆ)دا، کە دەشڵێین (هەر تۆ نەهاتیت) واتای (نەهاتن)مان حەصر کرد لە (تۆ)دا. ئەم لایەنە پتر روون دەبێتەوە بەوەدا کە وشەکەی (هەر) لە رستەکان دەرهاوێژین:

منداڵەکان هاتن، تۆ نەهاتیت.

سەوزەکەم هەموو خوارد، کەوەرەکە نەبێت.

دەبینین کەم و کەسری بەسەر واتای رستەکاندا نایەت، بەڵام کە بێین وشەی (جگە) لە رستە دەرهاوێژین واتا لە رستەدا نامێنێت نەک هەر (استثناء):

منداڵەکان هاتن جگە لە تۆ.

منداڵەکان هاتن لە تۆ.

لێرەشدا دەست لە تێبینییەکان هەڵدەگرم لەبەر درێژەکێشانیان.

دەمڕاستی لیژنە]

٢١- ئامرازی (هەرکە)ی عەتف:

لەو سەرچاوانەی لەبەر دەستی لیژنەدایە، کەسێکی نەدیت لە نووسەرانی کورد کە لە وشەی (هەرکە) بەسەریەکەوە دوابێت. بە بیروڕای لیژنە ئەم وشەیە لە دوو وشەی سادەی (هەر) و (کە) پێک هاتووە کە هەردووکیان تەواوکەری یەکترن بۆ پێکهێنانی مەبەستێک، نە لە (هەر)ی تەنیا و نە لە (کە)ی تەنیا بەدی دەکرێت.

لەم نموونانەی خوارەوە جۆری بەکارهێنان و دەوری لە رستەدا دەردەکەوێت:

١- هەرکە تۆم دی، وەک گوڵ گەشامەوە.

٢- هەرکە پەنجەرەکە کرایەوە، بایەکە وروژمی هێنا.

٣- هەرکە ڕۆیشتم، دەرگاکە دابخە.

٤- هەرکە بەهار بێت، گوڵ دەگەشێتەوە.

لە نموونەی یەکەم و دووەمدا وشەی (هەرکە) تەنیا دەلالەت لەسەر (کات) دەکات، بەڵام کاتێکی کتوپڕی بێ مەودا (فجائی).

لە نموونەی سێیەم و چوارەمدا وشەی (هەرکە) سەرەڕای دەلالەتی بۆ (کات)، جۆرە مەرجێکیشی تێدا بەدی دەکرێت، لەبەر مەرجەکەش، ئەو کتوپڕی و بێ مەوداییەی لە دوو نموونەکەی پێشووتردا هەبوو، لەمانەدا دەرناکەوێت.

تێبینی:

وا دەبێت لە رستەیەکدا دوو وشەی (هەر) و (کە) بەجوداوازی بەکار دێن، وەک:

بە خوا هەر تۆی کە کاری وەها بکەیت.

لێرەدا ئەم دوو وشەیە ئامرازی لێکدراوی (هەرکە) نین و لە یەکتر ترازابن لە رستەدا، بگرە هەریەکەیان بەسەربەخۆیی هاتوون و دەوری خۆیان بەجودا لەرستەکەدا دیتووە.

٢٢- ئامرازی (کەچی)ی عەتف:

لەو سەرچاوانەی کە لە ئامرازی (کەچی) لێکدراو دەدوێن:

١- نووری عەلی ئەمین، لە ڕێزمانەکەیدا لاپەڕە (١٥٠) وشەی (کەچی) بە ئامرازی (عطف) دادەنێت و ئەم نموونەیەی بۆ هێناوەتەوە:

من دەرسەکەم دەخوێنم، کەچی ئەو پێم پێ دەکەنێ.

٢- لە کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی پۆلی شەشەمی ئامادەیی لاپەڕە (١٦) وشەی (کەچی) بە ئامرازی بەستنەوە (عطف) دادەنێت و ئەم میسالانەی بۆ هێناوەتەوە:

خۆی ڕۆیشت، کەچی منداڵەکەی بەسەر مندا بەجێ هێشت.

لیژنە سەرنجی دایە تەرکیبی وشەی (کەچی): دیارە بە رواڵەت ئەم وشەیەش وەکو (ئەگەرچی) و (هەرچی) لە دوو کەرت پێک هاتبێت؛ کەرتی (کە) و کەرتی (چی) بەڵام لێرەدا تێبینییەکی گرنگ دەبێتە بەرهەڵستی ئەوەی کە بڵێین وشەکە لێکدراوە، تێبینییەکەش ئەمەیە:

لە دوو وشەی (هەرچی) و (ئەگەرچی)دا، دەوری (هەر) و (ئەگەر) ئاشکرایە کە دەورە بنچینییەکەی خۆیانە، بەڵام وشەی (کە) لە (کەچی)دا، ئەو دەورەی نەماوە کە بە عادەت لە رستەدا دەیبینێت، بە نموونە و بۆ روونکردنەوە ئەم چەند رستەیە خرانە بەرچاو:

١- بەکارهێنانی (هەرچی) و (ئەگەرچی):

آ- هەرچی دەکەم، بێ سوودە.

ب- ئەگەرچی لێت دوورم، هەرگیز فەرامۆشت ناکەم.

٢- بەکارهێنانی (کەچی):

أ- من پارەم بۆ هێنای، کەچی لێت وەرنەگرتم.

ب- منداڵەکە زۆر گریا، کەچی کەس نەچوو بەلایەوە.

لەم نموونانە دەردەکەوێت (کەچی) دەکەوێتە نێوان دوو رستەوە، نەک وەک (هەرچی) و (ئەگەرچی) کە لە پێشەوەی رستەوە دێن، هەروەها (کەچی) پەیدابوونی شتێک بە دەستەوە دەدات، کە دەبوو روو نەدات.

لەبەرئەمە بڕیاردان لەسەر چۆنێتیی پێکهاتنی (کەچی) پێویستی بە لێکۆڵینەوەیێکی پتر هەیە لەوەی کە بۆ لیژنە دەلوێت.

٢٣- ئامرازی (چونکە)ی عەتف:

لە زمانەوانەکانی کورد:

١- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا لاپەڕە (١٥٠) ئەم ئامرازە بە عەتف دادەنێت و ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە:

بڕیار بێ نەتاندوێنم چونکە درۆ دەکەن.

٢- کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) قوتابخانە ئامادەییەکان بۆ پۆلی شەشەم لاپەڕە (١٦)، ئەمیش ئەم ئامرازە بە عەتف دادەنێت و دەڵێت ئەم ئامرازە دوو رستەی جیاواز لە رووی واتاوە یەک دەخستووە، وەک:

باخەکەم فرۆشت چونکە پارەم پێویست بوو.

٣- مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (٢٩)ی فەرهەنگەکەیدا (چونکە، چونکو)ی بە ئامرازی عەتف داناوە، واتاکەشی بە ئینگلیزی since because لێک داوەتەوە، بەڵام هیچ نموونەی بۆ نەهێناوەتەوە.

٤- جگەرخوێن لە (آوائو دەستورا زمانی کوردی) لاپەڕە (١٠٤) لە ژێر ناوی (آلاقێ سەبۆنی) دەڵێت:

(چکۆ): یەک دبێژی: کاک بارام! بۆچی نایێ مالا مە؟

ئەو دبێژی: چکۆ تو ل مالی، ئەز نایێم.

بەلای لیژنەوە ئام ئامرازە (چونکە) هەر عەتفە، بەڵام پێویستە لەوە بکۆڵرێتەوە، کە ئایا ئەم وشەیە سادەیە یا ناسادە.

لیژنه بۆ ئەوە دەچێت کە وشەکە ناسادە بێت لە دوو وشەی (چون) و (کە) پێک هاتبێت؛ لایەنی تەرجیحی ئەم رایەش لەوەوە دێت کە:

١- هەردوو وشەی (چون) و (کە) لە ئاخاوتنی کوردیدا وشەی سەربەخۆن، وا دەردەکەوێت، هەر خۆیان بن و (چونکە)یان لێ پێک هاتبێت.

٢- ئامرازی (کە) لەگەڵ گەلێ وشەی تریشدا وشەی ناسادەی پێک هێناوە، لەوەوە فیکر بۆ هێندێ دەڕوات کە وا لێرەشدا وشەی (کە) ئەم دەورەی پێکهێنانی وشەی ناسادەی بینیبێت، بەڵام پێوستە یەک تێبینیی گرنگ بکرێت ئەویش ئەمەیە: لە زمانی تورکیدا وشەی (چونکی) بە واتای (چونکە) بەکار دێت، لە ئاخاوتنی کوردیشدا (چونکی، چونکو، چکۆ) هەن، کە ئەمە لە رواڵەتدا هەڵدەگرێت وشەی (چونکە) بۆ سەرچاوەیەکی تر بگێڕێتەوە. لە بارەی (چونکە)وە، کە لێکدراوی (چون) و (کە) بێت، ئەمانە دێنە بەرچاو:

١- وشەی (چونکە، چونکی، چوکو) هەرسێکیان بەکار دێن.

٢- رواڵەتی شێواوی ئەم سێ وشەیەی سەرەوە لە ئاخاوتندا، وەهای لێ هاتووە: (چوکنێ... چوکمانێ...).

ئەم تێبینییانە زیهن بۆ ئەوە دەبات، کە وا رەنگە (چونکە، چونکی، چونکێ، چونکو) ئەو ناسادەیە نەبن، کە لە وشەی (چون) و (کە) پێک هاتبن، لەگەڵ ئەمەشدا چاو ناپۆشرێت لەوەی (چونکە) دوو کەرتی ئاشکرای بە رواڵەتی تێدایە (چون - کە) هەروەها دەشێت (چونکە) لە (چۆن - کە)وە هاتبێت، کە دەزانین لە زۆر وشەدا واوی قووچاو دەکرێت بە واوی کراوە یاخود بە پێچەوانە:

ئەتۆ ئەتوو

چەقوو چەقۆ

سوور سۆر

رۆن روون

لە تێکڕای ئەم تێبینییانەوە دەردەکەوێت، بڕیاردانی پێکهاتنی (چونکە) لە دوو وشەی (چون - کە)ی عەتف لێکۆڵینەوەی پتری پێ دەوێت لەوەی کە لیژنە دەتوانێت کات و چالاکیی خۆی بۆ تەرخان بکات.

سێیەم - لە رووی روخسار (فۆرم)ەوە:

لیژنه هەتا ئێستا له ئامرازی عەتف له رووی زاراوه و پێناسین و واتاوه دواوه، ئەنجا دێته سەر لێکۆڵینەوه له رووی رواڵەتی وشەکانەوه. ئەم ئامرازانه له لایەن روخسارەوه دەکرێن به دوو بەشەوه:

١- ساده.

٢- ناساده.

سادەکانیان ئەمانەن:

و

وه (لەمەوبەر گوتمان عەرەبییه و هاتووەته ناو کوردییەوه).

ش، یش، ژی

هەم

بەلام، بەلان (بەلاوەکوونێ، بەلانەکینێ)

یا

نەء

تا

کەی

که

ئەگەر، گەر، ئەر

دەنا

جگه (رواڵەتی شێواوی: جگەر)

ناسادەکانیان ئەمانەن:

ژی ژی

یان، یانێ، یاخۆ، یاخوو، یاخود، یاخوت، وەیا، وەیاخود، وەیاخوت.

نەک، نەوەک، نەکوو، نەوەکوو.

تاکوو، هەتا، هەتاکوو، هەتاوەکوو.

چونکه، چونکی، چونکینێ (رواڵەتی شێواوی: چوکنێ، چوکمانێ).

ئەگەنا، ئەگینا، ئەگین، ئەگەرنا، ئەگەنه.

ئەنجا، ئینجا، ئەمجا، ئیمجا (رواڵەتی ڕەشۆکی: ئەوجاوەکینێ، ئەنجانەکینێ...).
بەشکو، بەشکە، بەشکم، بەشکەم.
بەڵکو، بەڵکە، بەڵکم، بەڵکەم.
بەجگە، بێجگە، (رواڵەتی ڕەشۆکی: بێجگەر).
ئۆسا، ئۆساژی
جارا، جاراژی
هەرکە، هەکە
کەچی
نە... نە

تێبینی:

وشەی (وەلێ، لێ) کورتکراوەی وشەی (ولێکین)ە، وەک لەم نموونانەدا دەردەکەوێت:

١- حاجی قادر دەڵێ:

کوڕی غیلمانە کچیان عەینی حوری
نەزەربازن وەلێکین دووربەدووری

٢- شاعیری فارس دەڵێ:

بگفتا من گلی ناچیزه بودم
ولیکن مدتی باگل نشستم

روونکردنەوەیێکی پێویست

لیژنە بەدوا لێبوونەوە لە باسی (ئامرازی عەتف) هاتە سەر لێدوان لە جۆری لێکۆڵینەوەی ئەو بەشانەی تری ئاخاوتن کە دەمێنێتەوە لەپاش بەسەرچوونی باسی هەشت بەشی باس لێکراودا کە ئەمانە بوون:

١- ناو

٢- راناو

٣- ئاوەڵناو

٤- کار

٥- چاوگ

٦- ئاوەڵکار

٧- ئامرازی پریپۆزیشن Preposition

٨- ئامرازی عەتف (پێوەندی). Conjunction

چی دەمێنێتەوە لە بەشەکانی تری ئاخاوتن، لەوانەیە ئەویش دابەش بکرێتەوە بۆ چەند بەشێک. لە هەندێ رێزمانی ئینگلیزیدا تەنیا ئامرازی تەعەجوب Interjection بە بەشێکی سەربەخۆ دانراوە، دیارە ئەمەش بە هۆی تایبەتێکی Interjection ـەوەیە، کە نابێتە کەرتێکی وشە و هەمیشە بەجودا لە ئاخاوتندا دەردەکەوێت. لە هەندێ کتێبی تردا بەو نامەیە کە دەوری لە رستەدا نییە بە بەشێکی ئاخاوتن دانەنراوە، وەک کتێبی:

AN ENGLISH GRAMMAR BOOK لە دانانی Evan C. Penglis لە ئاخاوتنی کوردیدا ئەم دیاردەیەی بەکارهێنانی وشەی سەربەخۆ بۆ دەربڕینی (تعجب) و واتای وەک ئەو شتێکی بەرچاوە و دەشێ وشەکانی (تعجب)یش وەک هی Preposi-tion وە یا پێوەندیی (عەتف) لە ژێر ناونیشانی بەشێکی تایبەتی ئاخاوتندا لێکۆڵینەوەی لێ بکرێت چونکە بە ئیستیقرا دەردەکەوێت کە ئامرازەکانی (تعجب) لە کوردیشدا وەک لە ئینگلیزیدا هەبوونی سەربەخۆیان هەیە و تێکەڵ بە تەکوینی وشەی تر نابن. لەبەر ئەمە لیژنە وای بە پێویست زانی ئامرازەکانی (Interjection – تعجب) بە بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن دابنێت و بیخاتە ریزی بەشەکانی پێشووترەوە وەک سەرەباسێکی سەربەخۆ.

[روونكردنەوە:

نەختێك سەرنج دەری دەخات كە وشەكانی تاقمی (تعجب) لە زمانی كوردیدا هی وەهایان تێدایە، نەك هەر وجوودی سەربەخۆیان هەیە و نابنە كەرتی وشەی تر، بەڵكو دەتوانم بڵێم لە رستەشدا وەك ئامرازی پێوەندیی دەور دەبینێت. لەم جۆرە وشانە وشەی (بریا، خۆزی، كاشكی) واتای (لیت، لعلّ)ی عەرەبی رادەگەیەنن كە دەوریان لە رستەدا وەك هەر بەشێكی تری گرنگی ئاخاوتن ئاشكرا و حیساب بۆ كراوە. وشەی (خۆزی) دیارە لە (خواستن)ەوە هاتووە، بەم پێیە دەبێتە وشەیێكی داتاشراو (مشتق) كە واتاكەی لە بنجێكی ناسراوی واتادارەوە سەر هەڵدەدات بەمەشدا دەزاندرێ كە دەوری لە رستەدا جێگەی گومان نییە. كورد دەڵێ (خۆزیم بە خۆزیداران..)، كە لەوێدا پاشگر بە دوا (خۆزی)دا هاتووە. پوختەی گوتە ئەوەیە، ئەم ئەمرازانە لە كوردیدا نابێ بە بیروڕای ڕێزمانەكانی ئەوروپا بگیرێن بە تایبەتی دوای ئەوەی پەڕاوێزی Interjection لە كوردیدا وەها پان ببێتەوە كە (تعجب، نارەزایی، ئاوات..) و واتای تریش بگرێتەوە.

دەمڕاستی لیژنە]

٩

# ئامرازی "تعجب"

یەکەم – لە رووی زاراوەوە

لیژنە بۆ دۆزینەوەی زاراوەیێکی پەسند، کە بەرانبەر (تعجب – Interjection) بووەستێ نمایشتێکی نووسینی لێرە بە پێشەوەی کرد:

أ– سەعید سدقی لە ژێر ناونیشانی (ادوات ترجی)دا گوتویەتی:

(ل: ٥٣) ادوات ترجی – چەند لفظیکن رجا و تمنایان پی دەکری بعضی لەوان ئەمانەن.

خوزگا – خوزگایەکو

کاشکی

بەلکو – بەشکم

بریا

نموونەشی بۆ هەموو وشەکان هێناوەتەوە.

دواتر لە لاپەڕە ٥٩ – ٦٢ لە ژێر ناونیشانی (اصوات) چەندین وشە دێنێ بە نموونەی (بانگکردن، تعجب و تنبیه و تحذیر و تحسین) بۆ (انسان و حیوان...) کە ئەمانەن خوارەوەن

(ئەرێ، ئەی، هو – هوهو، ئافرین، اف، بەبە، وەوە، هەی هەی، پەح، پەکو، اخ داخ، وای، اوف، حیف، داد، ای، اوی، ها، وریابە، خبردار، أمان، کورەکورە، زینهار – پش پش، گدی گدی–).

ب– نووری عەلی ئەمین لە کتێبی (قواعدی زمانی کوردی – بەرگی دووەم) زاراوەی (ئامرازی دەنگدان)ی بەکار هێناوە، ئەمانەشی بە ئامراز داناوە (ئەی، هۆ، ئەرێ، ە (کوررە)، ەکە (ژنەکە)، یا (یاخوا)، ێ (پووریێ)، ئای، ئای ئای، ئادەی، چش، دەچش، حەست، وەی، وەی وەی، هیزە، ئۆی، ئۆف، ئاخ، خۆزگە، بریا،

کاشکی، هاها، ئەها، دەک، ئەک، هەک، هەی، وای، داد، داخ، پەح، پەکو، دەی، دەدەی، ئۆخەی، ئاخۆ، هەو).

جـ- لە کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی لە لاپەڕەکانی ١٨ - ٢٢ باسی [١- ئامرازی «خۆزگە، خۆزگەم، کاشکا، بریا»

٢- ئامرازی بانگکردن «ئەی، هۆ، ئۆف، ئۆخەی»

٣- ئامرازی سەرسووڕمان «ئای، وای، ئایا، پەکو، هاها، هەک، پەح»] دەکات و نموونەی بەکارهێنانیان دێنێتەوە.

د- جگەرخوێن لە کتێبی (ئاوا و دەستورا زمانی کوردی، لاپەڕە - ٩٥ - دا) باسی (ئالاڤی هیڤی)ی کردووە و دەڵێ (خوەزی، خوەزکا، کیشکا، بەریا) ئەداتی (هیڤی و خوەزی - تمنی و ترجی)ن.

لە لاپەڕە (٩٧)دا ناونیشانی (ئالاڤی تەعجب)دا دەڵێ: (ئالاڤێ تعجب ئەون کۆ چە دەما مرۆڤ عجیب مای دمینی یەکی ژوان دبێژی گلک جاران پرسیار ب تعجبرە تێ خویاکرن) ئەمانەشی بە (ئالاڤی تعجب) داناوە:

(هەیها، ئایا، پەک، هەک، ئیو «عیو»، ایش - دەڵێ ئەم وشەیە یەزیدییە-، ئەزرک، هۆ، ها، پەکۆ، پەح، وەی، وەی وەی، هەی).

جـ- مامۆستا توفیق وەهبی لە کتێبەکەیدا (دەستووری زمانی کوردی، لاپەڕە - ١٩ - ) بەم جۆرە لە نیدا «نداء» دواوە:

ئەداتی نیدا دەنگێکە کە بۆ پێشاندانی حسێکی وەکو خۆشی، عاجباتی، پەژارە، ترس.. هتد بە کەڵک ئەهێنرێ، ئەمانە لەگەڵ کەلیمەکانی تری جوملەدا لاقەیەکیان نابێ؛ وەکو:

ئای! لەبیرم چوو.

ئۆخەی! رزگارم بوو.

ئۆف! لە دەست تۆ وەختە شێت بم.

لەم جوملانەدا «ئای!» بۆ عاجباتی «ئۆخەی!» بۆ خۆشی، «ئۆف!» بۆ پەژارە بە کەڵک هێنراون.

هەروەها لە لاپەڕە «٤٨» لە وظیفەی نیدا دەدوێت و دەڵێت:

ناوی کەسێ یا شتێ کە هەر بۆ بانگکردن و روو تێکردن بە کەڵک بهێنرێ و لەگەڵ هیچ فعلیکا لاقەیێکی نەبێ پێی ئەڵێن نیداکراو، وەکو:

کوڕە، تۆ بۆچی ناچیتە مەکتەب؟

ئەمجارە نۆرەی تۆیە، پشکۆ.

لەم جوملانەدا «کوڕە»، «پشکۆ» نیدا کراون.

هەروەها لە دروستکردنی ناوی نیداکراویشدا دەڵێت:

١- لە ناوی تاکا:

ء. حەرفێکی «ە»(*) ئەخرێتە دوای ئەو ناوانەوە کە دوا حەرفیان دەنگییە، ئەو ناوانەی کە دوا حەرفیان حەرەکەیە، هیچ ناخرێتە دوایانەوە، وەکو:

کوڕە، جووتیارە، ئاغا، میرزا.

ب. هەندێ جار ئەداتی تەعریفی «ەکە» ئەخرێتە دوای ناوەوە، ئەمە بۆ نەزاکەت و دۆستی و پاڕانەوە بە کەڵک ئەهێنرێ؛ وەکو، مارفەکە، کوڕەکە، براکە.

ج. هەندێ جار ئەداتی «ئەی» ئەخرێتە پێش ناوەوە؛ وەکو، ئەی حوکمدار، چی بێ و لەتۆ نەهێنی بێ؟

د. ئەتوانرێ ناو بەبێ ئەدات و حەرفی زیادە پێش نیدا بکەوێ، وەکو:

شوان، ئەم رێیە بۆ کوێ ئەچێ؟

خەسوو، تۆ بۆچ لەگەڵم نارێکی؟

خورشید، دایکم بانگت ئەکا.

نەریمان، لە کوێ بووی؟

٢- لە ناوی گەلا - ئەبێ لە پێشا ناوەکە بەبێ ئەداتی تەعریف گەل بکرێتەوە، لەپاشا «ا»ی ئەداتی گەل بگۆڕێ بە «ی» و حەرفێکی «ە» لە دوای «ن»ی گەلەوە دابنرێ؛ وەکو:

---

(*) بۆ جنسی مێ لە باتی «ە» زۆرجار «ێ» بە کەڵک ئەهێنرێ؛ وەکو، پوورێ، خوشکێ، ماڵم شۆڕێ.

| ناوی تاک | ناوی گەل | ناوی نیداکراو |
|---|---|---|
| شاگرد | شاگردان | شاگردینە |
| پیاو | پیاوان | پیاوینە |

لەگەڵ ئەمەشا ئەتوانرێ ئەداتێکی «ئەی»یان بخرێتە پێش؛ وەکو، ئەی شاگردینە، دەمی تێکۆشینە.

و- لە کتێبی «دستور پارسی» دانەرەکەی: ر- ذوالنور، لاپەڕە (٢١٧) بەم جۆرە لە حەرفی نیدا دواوە:

حرفی ندا لفظهایی هستند کە برای مناداکردن اسم بەکارمیروند، مانند:

ای آنکە غمگنی و سزاواری

و ندر نهان سرشک همی باری

ای دل آندم کە خراب از می گلگون باشی

بی زر و گنج بە صەد حشمت قارون باشی

علامتهای ندا عبارتند از: ا، ای، ایا، هی، الا.

تێبینی:

لە هەمان کتێب (١٨٩) لە ژێر عینوانی قیدی تەمەنادا وشەکانی «کاشکی - ای کاش - کاش -» نووسراون.

هەروەها لە لاپەڕە «١٩٣، ١٩٤»دا لە ژێر عینوانی شبە جملەی فارسی، وشەکانی «خوشا، فری، زە، بە، آری، هان، آخ، کاش، تفو، خە...» و هەندێکی تریش نووسراون.

دەشێت ئەم دوو تاقمە وشانەش بەر ئەو بەشەی ئاخاوتن بکەون، کە نیدا و تعجبیان بەردەکەون.

ز- لە کتێبی AN ENGLISH GRAMMAR BOOK لە دانانی Evan C. Penglis لە لاپەڕە ٢٨٨ هەر ئەوەندە لە بارەی Interjectionـەوە دەڵێ، کە ئەم وشەیەی پێی دەگوترێت Interjection بۆ دەربڕینی emotion بەکار دێت؛ چونکە بەشێکی پێکهێنەری رستە نییە پێی ناگوترێت بەشێکی ئاخاوتن.

ح- له كتێبی (جامع الدروس العربية) هی (مصطفى الغلايينی) له ژێر ناونیشانی (انواع الحروف - له لاپەڕە ٢٥٥ و بەدواوە)دا ئەمانە دەدیترێن:

احرف التحضيض: هلا، الاّ، لوما، لولا، ألا.

احرف العرض: ألا، أما، لو.

احرف التنبيه: ألا، أما، ها، يا.

احرف التمنی: ليت، لو، هل.

احرف الترجی: لعلّ.

احرف النداء: أ، أی، يا، أيا، هيا، وا.

که دەشێ به جۆرێک له Interjection دابنرێن، هەر تاقمەش لەوان بۆ یەکێک له نیازەکانی (ندا و تعجب و رازیبوون و نەبوون... هتاد) بەکار بێت.

لەم نمایشتەدا دەردەکەوێت:

١- کتێبە نوێیەکانی ڕێزمانی ئینگلیزی ئەم ئامرازانەیان Interjection به بەشێکی ئاخاوتن دانەناوە، لەو ڕووەوە که تێکەڵ به داڕشتنی ڕستە نابن، هەرچەند بوونی سەربەخۆشیان هەیە؛ چونکە بەشەکانی تری ئاخاوتن سەربەخۆشن و تێکەڵ به داڕشتنی ڕستەش دەبن.

٢- ئەو نووسەرە کوردانەی که نووسینیان بەرچاوی لیژنە کەوت بەجگە له مامۆستا توفیق وەهبی باسی ئەم لایەنەی حسابکردن و نەکردنی ئامرازی تەعەجوب به بەشێکی ئاخاوتن نەکردووە. هەندێک لەو نووسەرانە تەعەجوب و نیدایان وەک یان داناوە.

مامۆستا وەهبی له کتێبەکەیدا (دەستووری زمانی کوردی) کاتێک تەعریفی ئەداتی نیدا دەکات ئەوەی گوتووە که ئەو ئەداتانە پێوەندییان نییە لەگەڵ وشەکانی تری ڕستەدا، بەڵام به پێی ئەوە که له کۆتاییی ریزی بەشەکانی ئاخاوتندا وەک ئەوانی تر ڕەقەمی تایبەتی داوەتی، له ژێر ناونیشانی (پارچەکانی ئاخاوتن)دا باسی دەکات، دیارە به بەشێکی ئاخاوتنی داناوە.

لیژنە کەوتە سەر لێکدانەوە و به یەکترگرتنی ئەم ئامرازانە له کوردی و له زمانانی تردا بۆ ئەوە بگاتە بڕیارێک لەم لایەنە گرنگەی حسابکردن و حساب

نەکردنی Interjection بە بەشێکی ئاخاوتنی کوردی.

ئەو وشانەی کە لە نووسینی نووسەرانی کورددا بە ئامرازی تەعەجوب و نیدا و تەرەجی و پەژارە و خۆشی و واتای ئەو تۆیی دانراون ئەمانەن:

١- خۆزگە، خۆزی، خۆزیا

٢- کاشکی، کیشکا

٣- بریا

٤- بەڵکو، بەشکو

٥- ئەی (ە، ێ، هێ)

٦- هۆ (هۆو، هۆی...)

٧- ەکە

٨- ئەرێ

٩- ئەدی (ئەیی - لە سلێمانی)

١٠- ئای

١١- ئۆی

١٢- یا

١٣- ئۆف، ئووف

١٤- ها (هاها)

١٥- دەی (دەی دەی)

١٦- ئا دەی

١٧- وەی (وەی وەی)

١٨- ئۆخەی

١٩- هەو (حەو)

٢٠- حەست

٢١- داخ

٢٢- ئاخ (ئاخ و داخ)

٢٣- دەک (ئەک، هەک)

٢٤- چش (دەچش)

٢٥- ئافەرین

٢٦- بەھ بەھ

٢٧- ھەی (ھەی ھەی)

٢٨- پەح

٢٩- پەکوو، پەک

٣٠- وای (وای وای)

٣١- حەیف

٣٢- داد

جگە لەمانە ھەندێ لە نووسەرانی کورد ئەمانەشیان بە ئامرازی تەعەجوب و نیدا داناوە:

١- زینھار

٢- گدی گدی، پش پش

٣- ئایا، ئاخۆ

لێژنە بەر لەوە بچێتە ناو لێکۆڵینەوە لەوەی کە ئایا ئەو وشانە تێکەڵ بەرستە و واتای رستە دەبن یان نابن، جارێ لە جۆری بەکارھێنانیان بە نموونە دەدوێت:

١- خۆزگە:

خۆزگە دەمزانی تۆ چیت دەدوێت.

خۆزی ئەو شەوە بھاتنایە.

ئەم وشەیە لەگەڵ رێژەی کاری رابردووی ئینشائی و ئیستیمراری بەکار دەھێنرێت و لەتەک رێژەکانی تری کاردا بەکار نایەت، ھەروەھا دەشێت رێژەکەی نەفیش بێت، وەک:

خۆزگە نەچووبامایە سەفەر.

خۆزگە ئەمەم نەدەکڕی.

٢- کاشکی:

کاشکی لەگەڵ ئێوەدا بهاتایە.

کاشکی بە جلوبەرگی جوانەوە دەمدیت.

ئەم وشەیەش وەک (خۆزگە) لەگەڵ دوو ڕێژەی ڕابردووی ئیشائی و ئیستیمراری بە ئەرێتی و نەرێتییەوە بەکار دێت، وەک:

کاشکی لە خەوم نەکردایە.

کاشکی کاڵەکەکە زوو پێ نەدەگەیشت.

٣- بریا:

بریا گوڵەکەم بڕواندایە.

بریا هەر نەمدیبای          دیتم نەمناسیبای

وا دیارە ئەم وشەیەیان پتر حەز بە ڕێژەی ڕابردووی ئینشائی دەکات.

٤- بەڵکو:

دەچمە ئەوێ بەڵکو بیبینم.

دەچمە ئەوێ بەڵکو دەیبینم.

دەبوو بچمە ئەوێ بەڵکو بمدیایە (بمدیتبایە).

ئەم وشەیە لەگەڵ ڕێژەی کاری ڕابردوو و ڕانەبوردووی ئینشائی و ئیخباریدا بەکار دێت.

دەشێت ئەم وشانە لەلایەن قسەکەرەوە بە تەنیا بەکار بێت، بە مەرجێک یەکێکی تر قسەیێکی کردبێت کە لەگەڵ ئەم وشانەدا بگونجێت؛ وەک ئەوەی (دانا) بڵێت: ئەگەر ئەم شەو بهاتمایە بۆ ماڵی ئێوە کتێبەکەم بۆ دەهێنایت. (بارام)یش لە وەرامدا بڵێت «خۆزی».

٥- ئەرێ:

أ- ئەرێ درەختەکانت ئاودان؟

ب- ئەرێ بۆچی ناخوێنیت؟

ج- ئەرێ لە کوێ بوون؟

د- ئەرێ کوێت پێ خۆشە؟

هـ- ئەرێ ئەی کوردستان، کوردستانی جوان.

و- ئەرێ کەی هاتیتەوە؟

ز- ئەرێ دەبا بەس بێت.

ح- ئەرێ دەوەرە لام.

ط- ئەرێ خۆ تۆ گەورەی من نیت.

لەم نموونانەدا دەردەکەوێت کە وشەی (ئەرێ):

١- لەگەڵ هەموو جۆرە کارێکدا بە ئەرێتی و نەریتییەوە بەکار دێت.

٢- بۆ پرسی بەکار دێت (رستەکانی أ، ب، ج، د، و).

٣- بۆ غەیری پرسیش بەکاردێت (رستەکانی هـ، ز، ح، ط).

٤- لەگەڵ رستەی بێ کاری ئاشکرادا بەکار دێت (رستەکانی د، ط).

٥- لەگەڵ وشەی پرسی تردا بەکار دێت (رستەکانی ب، ج، د، و).

٦- لەگەڵ ئامرازی نیدای تردا بەکار دێت (رستەی هـ).

جگە لەم بەکارهێنانە، وا دەبێ لە وەرامی تصدیقدا بەکار دێت وەک ئەوەی یەکێک بپرسێت (فلانەکەس چووەتە مەکتەب؟) لە وەرامدا بگوترێ (ئەرێ....).

ئەم بەکارهێنانە شێوەیێکی (بلاغی)ی تریشی هەیە لەو حاڵەدا کە مەبەست بڕوانەکردن و بە دوور زانین بێت: بە نموونە، یەکێک دەڵێ (ئەمساڵ ڕەزەکانم بازاڕ پڕ دەکەن لە میوە)، ئەوی تریش بە نیازی بڕوانەکردنەوە دەڵێ (ئەرێ...). نموونەی پێشووتریش هەڵدەگرێ بکرێت بە وەرامی تصدیق نەکردن. بەڵام جۆری دەربڕینی لەگەڵ هی تصدیق جودا دەبێت هەرچەند وشەکە بۆخۆی هەر هەمان وشەیە لە هەردوو حاڵدا.

٦- ئامرازی (ئەی):

ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاودەربرین

هەردوو گرفتار یەک ئاهی سەردین

ئەی مەلی وردیلەی دەنگخۆش

بۆم بڵێ ئاوازێک بەجۆش

ئەی ئەوانەی خەریکی خوێندەوارین...

هەستن ئەی دانیشتوانی سەر ڕێگا.

لەم نموونانەوە دەردەکەوێ، ئامرازی (ئەی) هەمیشە بۆ نیدا دەبێت و پێش نیداکراوەکە دەکەوێت. واش دەبێ (ندا) بەبێ ئامرازی (ئەی) وەیا هیچ ئامرازێکی تر پێک دێت وەک:

هەولێر، چەند خۆشیت!

فەرهاد، کەنگی هاتیتەوە؟

پیرەمەگروون، چەند بەرزیت!

لەم نموونەوە دەردەکەوێت نیداکراوەکان هەموویان ناوی تایبەتین.

[ڕوونکردنەوە:

لە نموونەکانی پێشووتر کە ئامرازی نیدایان لەگەڵدا بوو، بانگکراوەکان (ئەی مانگ، ئەی مەلی وردیلە، ئەی ئەوانەی خەریکی..، ئەی دانیشتوانی سەر ڕێگە) تەنیا وشەی (مانگ) تێیاندا ناوی تایبەتییە، ئەوانی تر هەموویان ناوی نەناسراون. بەلای منەوە ڕێکەوت وای کردووە ناوی تایبەتی لە نموونەکانی تاقمی دووەمدا بێ ئامرازی نیدا هاتوونە ناو ڕستەوە دەنا دەشێ هەموو جۆرە بانگکراوێک، چ ئادەمیزاد چ غەیری ئادەمیزاد، چ ناوی مادی چ ناوی مەعنەوی بە تەنیا و لەگەڵ ئامرازی نیدادا بێت:

مردن، چەند تاڵی! (ناوی نامادی بێ ئامرازی نیدا).

ئەی بەختی بەد، چیت پێ کردم! (ناوی نامادی لەگەڵ ئامرازی نیدا).

ئەی خودا، هاوار! (ناوی تایبەتی لەگەڵ نیدا).

[خوایە، ڕەحمێکم پێ بکەی - جۆرێکی تایبەتی پاڕانەوەیە لە خودا].

ئەی مانگ.. ئەی ڕۆژ.. ئەی شەیتان (هەموویان ناوی تایبەتین..).

هەتا بەدوا نموونان بکەوین لێیان نابینەوە.

دەمڕاستی لیژنە]

٧- ئامرازی (ە):

أ- کوڕە، وەرە بۆ ئێرە.

ب- شوانە، ئەو بەرخانە بۆ کوێ دەبەیت؟

ج- کاکە، چیت فەرموو؟

د- کابرا، ڕێگاکەم نیشان دە.

هـ- حاجی، چەند حەجت کردووە؟

و- جەرگە.. گیانە.. هەناوە، لەچی تۆراوی؟

ز- مامە پیرە، تەمەنت چەند ساڵە؟

ح- کوڕم، ئەمە ئیشی تۆ نییە.

ط- خۆشەویستم، سڵاوت لێ بێت.

لەم نموونانە ئەم خاڵانەی خوارەوە دێنە بەرچاو:

١- ئامرازی (ە) دەکەوێتە دوای وشەی نیداکراوەوە (نموونەکانی أ، ب، ج، و).

٢- ئامرازی (ە) لە دوای ڤاولدا دەرناکەوێت (نموونەکانی د، هـ).

٣- وا دەبێت بە دوای دوو وشەدا دێت کە یەک ناویان دروست کرووە لە هەمان ڕستەدا (مامە پیرە).

٤- کاتێک نیداکراو بوو بە (مضاف) ئامرازی (ە)ی نیدا دەسوێت (نموونەکانی ح، ط).

٥- سرنج دەری دەخات کە ئەم ئامرازە بە دوا نیداکراوی نێرینەدا دێت.

تێبینی:

ئامرازی (ە) هەروەک بە تەنیا لە ڕستەدا بەکار دێت دەشێ لەگەڵ (ئەرێ)ی تەنیا، یاخود (ئەی) تەنیا، یاخود (ئەرێ ئەی) بەیەکەوە بەکار بێت، وەک لەم نموونانەی خوارەوەدا دەبینرێت:

ئەرێ کوڕە بۆ وا دەکەیت؟

ئەرێ مامە بۆ کوێ دەچیت؟

ئەرێ ئەی شوانە چەند گورگت کوشتووە؟

[روونکردنەوە:

بەلای باوەڕی منەوە، وشەی (مامەپیرە) بێ ئەوەی بخرێتە بەر حوکمی بانگکردنەوە بزوێنەکانی (ە) دوای دوو کەرتەکەی تێدا دەبن. ئەم شێوە لێکدانەی ناوان لە کوردیدا نموونەی زۆرە، وەک: مێردەزمە - بەردەعازەبانە - مامەکوڕە - مامەخاڵە - سەرەتاتکە - تەڕەتوورە. بنبەردەقیلە - کەفەلووتکە - هۆڵەپەزە - بالابستەی ردێن گەزە.... هتاد). ئەم تێبینییە وا رادەگەیەنێت کە ئەگەر نیدا خرایە سەر ئەم جۆرە وشانەوە چ تەئسیرێکی تایبەتییان تێ ناکات، واتە بزوێنێکی تر بە زیادەوە بۆیان نایەت و هەر دەگوترێ (ئەی مامەپیرە، ئەی مێردەزمە...) کەچی ئەگەر خرانە بەر حوکمی ئیشارەتەوە ئەو بزوێنەی کە دەبێتە تەواوکەری ئیشارەت دەردەکەوێتەوە وەک کە دەگوترێ: ئەم مامەپیرەیە، ئەم مێردەزمەیە، ئەو هۆڵەپەزەیە... ئەم نموونانە دەری دەخەن کەوا بۆ پاراستنی تەواوکەری ئامرازی (اشارە) دەنگێکی (ی) ناوەندی دێت و تەواوکەرەکە بە خۆیەوە دەگرێت. لە نیداکردندا دەگوترێ: ئەی مامەپیرە، ئەی هۆڵەپەزە، ئەرێ ئەی مامەخاڵە.. بێ ئەوەی (ی) ناوەندی بێت و تەواوکەری نیدا بپارێزێت، ئەگەر بۆ پاراستنی هاتبایە ناو رستە دەبوو بگوترێ: ئەی مامەپیرەیە، ئەی هۆڵەپەزەیە... بەهەمەحاڵ ساغکردنەوەی هەموو سەروبەرێکی ڕێزمانی کوردی جارێ گەلێک زۆری پێ دەوێت.

دەمڕاستی لیژنە]

٨- ئامرازی (ێ):

خوشکێ، ئاگاداری منداڵەکان بە.

پوورێ نانێکم بدەرێ.

«هێ رەوشەنێ، هێ چەلەنگێ پێش قۆشەنێ»

فۆلکلۆر

لەم نموونانەدا دەردەکەوێ، کاتێک نیداکراو مێیینە بوو لە بری (ە)ی نێرینە ئامرازی (ێ) بەکار دێت.

٩- ئامرازی (هێ):

هێ کچێ، ئاگاداری خۆت بە.

هێ نەرمێ (ناوی ئافرەتە)، بەخێر بێیت.

لە نموونەکاندا دیارە، ئامرازی (هێ) بۆ مێیینە بەکار دێت و دەخرێتە پێش وشەی نیداکراوەوە، پێویستە نیداکراوەکەش (کە مێیینەیە) ئامرازی (ێ)ی مێیینەی بخرێتە دواوە.

١٠- ئامرازی (هۆ):

لە بارەی ئەم ئامرازەوە:

أ- مامۆستا سەعید سدقی لە لاپەڕە (٥٩)ی موختەسەرەکەیدا دەڵێ بۆ نیدای دوور بەکار دەهێنرێت، وەک: هۆ عوسمان بێرەوە. هەروەها دەڵێ ئامرازی (هۆهۆ) بۆ نیدای دوورترە، وەک: هۆهۆ یونس راوەستە هەتا دێم.

ب- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا، بەرگی دووەم لاپەڕە (١٥٢)، دەڵێ: ئەم ئامرازە بۆ نیدا بەکار دەهێنرێت و ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە:

هۆ کاکەی شوان گوێم لێیە لەو بن دارە

ئەوی ئەیلێیت نایلێیتەوە، دووبارە

ج- مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستوورەکەیدا لێی نەدواوە، بەڵام لە فەرهەنگەکەیدا، لاپەڕە (٦٧)، دەڵێ: وشەی (هۆو) درێژکراوەی وشەی (هۆ)یە بۆ بانگکردنی دوور[1] وەیا جەوابدانەوەی بانگکردنە، هەروەها بۆ هەڕەشە و مەنعکردنە.

د- لە کتێبی پۆلی شەشەمی قوتابخانە ئامادەییەکان، لاپەڕە (٢٠)، چاپی دووەم، دەڵێ: (هۆ) ئامرازی نیدایە و ئەم نموونەیەی بۆ هێناوەتەوە (هۆ کاکەی شوان).

هـ- مامۆستا جگەرخوێن لە ژێر عینوانی (ئالاڤێ تعجب، لاپەڕە ٩٨، لە کتێبی ئاواو دەستورا زمانێ کوردی) ئەم نموونانەی هێناوەتەوە:

---

(١) بە زۆری نموونەکان و نووسینەکانی ناو ئەو کتێبانە بە ڕێنووسی خۆیان لەم کتێبەدا دووبارە دەکرێنەوە.

هۆ ئەڤە یارا مە هاتییە؟

هۆی لەوێ...!

هۆ ئەو رەشۆیە ژ زیندانێ هاتییە؟

هەروەها دەڵێ: (هۆهۆ، هەیهۆ) ژ بۆ غەیدین [غەیدین: عاجزبوون].

لەم نمایشتە دەرکەوت، وشەی (هۆ) ئەم شکڵانەی هەیە: هۆ، هۆهۆ، هۆو، هۆی، هەیهۆ، ئەرێ هۆ، ئەرێ، هۆی.

لە رستەکانی خوارەوەدا، لیژنە جۆری بەکارهێنانی هەمە چەشنەی ئەم ئامرازە دەخاتە بەرچاو:

١- هۆ مام جووتیارە چ دەچێنیت؟

٢- کورە ئەم دارە نەشکێنیت هۆ!

٣- هۆو قادر ئاوەکەم بۆ بەردەوە.

٤- هۆ کابرا هۆو، ولاغەکە لە دەغلەکە دەرکە.

٥- «هۆی خاڵۆی رێبوار رێم لێ گۆڕاوە».

هۆی لەوەی...!

٦- هۆهۆ بارام، قسەکەی خۆت لەبیر نەکەی.

٧- ئەرێ هۆ دلێر ئەم بیانییە بۆ نەچوویتە مەکتەب؟

لەم نموونانەدا دەردەکەوێت کە ئەم تاقمە وشەیە لە بنەڕەتدا لە وشەی (هۆ) کەوتووەنەتەوە (جگە لە وشەی ئەرێ] بۆ ئەم مەبەستانەش بەکار دێن:

١- نیدای سادە (نموونەکانی ١، ٣، ٥).

٢- هەڕەشە (نموونەی ٢).

٣- نیدای دوور (نموونەی ٤).

٤- تەئکید (نموونەکانی ٦، ٧).

٥- نیدای نامەعلووم (هۆی لەوێ).

تێبینی:

بە پێی مەبەستی نیداکەر هەرجارە نەبرەی ئەو وشانە (هۆ ... هتاد) دەگۆڕێت: نەبرەی نیدا جودایە لە هی هەڕەشە، هی نیدای دووریش جودایە لە هی تەئکید و

هی تێکڕایان لە یەکتر جودان بەڵام جوداوازیی نەبرە شتێک نییە بە نووسین دەرکەوێت.

[ڕوونکردنەوە:

ئەم جوداوازییە هەر بۆ ئامرازەکە نییە بگرە ئەو شتەی ڕووی ئامرازەکەی لێیە ئەویش نەبرەی دەگۆڕێ، واش دەبێ نەبرەی ئەو وشانە دەگۆڕێت کە هەڕەشەیان تێدایە وەیا تەئکید دەبەخشن وەیا.. وەیا.. ئەوەی ڕاستیش بێ گۆڕانی (نبرە) باسێکی سەربەخۆیە و زۆریش بەرفرەوانە، بەلای باوەڕی منەوە سەردەکێشێتەوە بۆ سەر فۆنەتیک و ڕستەسازی و وشەسازیش، کە لێرەدا جێگەی باسکردنیان نابێتەوە.

دەمڕاستی لیژنە]

١١- ئامرازی (ەکە):

لە ناو نووسەرانی کورددا تەنیا مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستوورەکەیدا لێی دواوە و دەڵێ وشەی (ەکە) ئامرازی تەعریفە و دەخرێتە دوای ناوەوە بۆ (منادی)، ئەمە بۆ نەزاکەت و دۆستی و پاڕانەوە بە کەڵک ئەهێنرێ، وەک:

مارفەکە، کوڕەکە، براکە.

بەلای لیژنەوە ئەم صیغەیەی (مارفەکە، کوڕەکە، براکە) هەڵدەگرێ پێی بگوترێ صیغەی نیدای (معین) کە لەوێدا ئامرازەکەی (ەکە)ی تەعریف بۆ نیدا بەکار هاتووە بە نموونە:

١- کوڕەکەی من چوو بۆ قوتابخانە.

٢- کوڕەکە! ئەمە چییە بەدەستتەوە؟

لە ڕستەی یەکەمدا (کوڕەکەم) ناوێکی تەعریف کراوە بە (ەکە)، بەڵام لە ڕستەی دووەمدا (کوڕەکە) نیداکراوێکی معینە بە ئامرازی (ەکە).

١٢- ئامرازی (یا):

ئەم نووسەرانە لەم ئامرازە دواون:

أ- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا، لاپەڕە (١٦٢، ١٦٣) لەسەر وشەی (یا) دەڕوات و دەڵێت: ئامرازی (یا) عەرەبییە و ئامرازی نیدایە بەرەو خوا، پێغەمبەران، یاخود پیاوانی دینی وەک: یاخوا، یاشێخ..

ب- نووری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٥٢)ی ڕێزمانەکەیدا ئامرازی (یا) بە نیدا دادەنێت و ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە: یاخوا نانی کەم نەخۆیت لە ژیاندا.

ج- جگەرخوێن لە ڕێزمانەکەیدا (آوائو دەستورا زمانێ کوردی، لاپەڕە ٨٦) دەڵێ: ناڤێ بانکراو ئەو ناڤە کۆ مرۆڤ دکاری بڤان آلاڤێ باس دێ لێ بکن، وەک یا هەڤال، یا چاڤێ من، یا خوشکا من.

بەلای لیژنەوە، پێ دەچێت ئامرازی (یا)، وەک مامۆستا وەهبی گوتی، لە عەرەبییەوە وەرگیرابێت بە تایبەتی کە بەزۆری لەگەڵ وشەی سەر بەئاینەوە بەکار دەهێنرێت، وەک:

یا خوا، یا پێغەمبەر، یا شاهی نەقشبەند، یا شێخی ماڵ لە بەغدایێ.. لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ ئەم تێبینییە بکرێ کە ئامرازی (ئەی) نیدای کوردی نزیکە لەم (یا)یە. لەمەوە دەشێ بگوترێ هەندێ شێوە بەکارهێنانی (یا) لە (ئەی)ەوە هاتبێت وەک کە لە گفتوگۆدا دەگوترێ (یا شێخ) مەبەستیش (ئەی شێخ) بێت.

١٣- ئامرازی (ئافەرین) و هەڤاڵەکانی:

ئەم ئامرازانەی (ئافەرین، ئوف، بەه بەه، پەح..) لە کاتی ڕالێبوون لە کارێک، وەیا هاندانی یەکێک بۆ ئازاتربوون و ئەم جۆرە مەبەستانە بەکار دەهێنرێن، وەک:

ئافەرین بۆ خۆت و دەستی ڕەنگینت!

ئوف لەو جلە جوانانەت [بۆ منداڵ بەکار دێت].

بەه بەه چ بەزمێکی خۆشە!

پەح لەو هەڵپەڕکێیە!

[لێرەدا هەلێک هەڵکەوتووە بۆ دەربڕینی تێبینییەکی گرنگ لە بارەی دەوری ئەم جۆرە ئەمرازە لە ڕستەدا: ئەگەر ڕاست بوایە کە ئەم ئەمرازانە لە ڕستە دەوریان نییە و بەشێکی ئاخاوتن نین، ئەدی بۆچی وشەی (پەح) ئامرازێکی پریپۆزیشنی بە دوا خۆیدا هێناوە؟ بۆچی نەگوترا (پەح هەڵپەڕکێ!)؟ ئێمە گوتومانە و دەڵێین

پریپـۆزیشـن لە رسـتــەدا دەور دەبینێت و بەشــەکـانی ناو رسـتـە بەیەکـەوە دەبەستـێتـەوە، لێرەشـدا پریپۆزیشنی (لـە) وشـەی (پەح)ی بە دەسـتـەواژەی (ئەم هەڵپەرکێیە)ی بەستووەتەوە کە ئەمە بەڵگەی بێ دەمەتەقەی بەشداربوونی وشەی (پەح) و هاڤەلەکانیەتی لە پێکهێنانی رستەدا.... مەسعوود محەمەد].

١٤- ئامرازی (شکاندنەوە - تعنیف، توبیخ):

ئامــرازەکـانی (هـەی، هـەی هـەی، وەی وەی..) بۆ شکاندنەوەی کـەسـێک وەیا پەسەند نەکردنی کارێک و مەبەستی ئەوتۆ بەکار دێن، وەک:

هەی بێ وەفا، بۆ سەرێکمان لێ نادەیت؟

هەی هەی، چ هەراومەزادێکە؟

وەی وەی، لەم گاڵتە بازارە!

تێبینی:

ئامرازەکانی رالێبوون و شکاندنەوە (تحسین و تعنیف) شێوەی بەلاغیشیـان هەیە کـەوا لە هەندێ حـاڵدا بۆ مـەبەسـتـی پێـچـەوانە دێنە ناو ئاخـاوتنەوە، واتە ئامرازی رالێبوون بۆ شکاندنەوە و ئامرازی شکاندنەوەش بۆ رالێبوون بەکار دێن.

[روونکردنەوە:

وا دەزانم وشەی (وەی وەی) بۆ هەردوو مەبەست بەکار دێت بێ ئەوەی بەشێوەیێکی بەلاغی درابێتە مەبەستی پێچەوانە. سالم دەڵێ:

«وەی وەی چ مەجلیسێ بوو دوێنێ لە دیدە و دڵ»

بە زۆریش ئامـرازەکـانی رالێـبوون نەک هی شکاندنەوە بۆ مـەبـەسـتی پێچـەوانە بەکار دێن. مـامۆسـتـا وەهبیش لە فـەرهـەنگەکـەیدا باسی (هەی، وەی) کردووە.

دەمڕاستی لیژنە]

١٥- ئامرازی (ورياکردنەوە):

ئەم ئـامــــرازانە (ئا، ئەها، ئادەی - دادەی - ها، هاها، و هی تریش..) بۆ

وریاکردنەوە بەکار دەهێنرێن، وەک:

ئا مەڕۆ، ئیشێکم پێتە!

ئەها، کەروێشکەکە دەرپەڕی!

ئادەی (دادەی) ئەو ئاگرەم بۆ بکوژێنەوە.

ها ئەوە دەفتەرەکەت، ئیتر ونی مەکە.

هاها، ئێوە بوون لە سێبەری دارەکە دانیشتبوون!

هەی خەڵکینە، کەی ئەمە رەوای حەقە!

«هەی داد هەی بێداد، هەی ئاوەدانی»

١٦- ئامرازی ئەسەف و کەسەر (پەژارە):

ئەم ئامرازانە ( ئاخ، داخ، ئاخوداخ، وای، حەیف، ئوف، ئوی، مخابن، داد، ئای، ئای ئای...) لە لای نووسەرانەوە وەها باس کراون:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە صرف و نحوەکەیدا، لاپەڕە (٦٠، ٦١) ئەم ئامرازانەی (ئاخ، داخ، وای، ئۆف، حەیف، داد، ئای) بە تعجب داوەتە قەڵەم و نموونەشی بۆ هێناوەتەوە:

ئاخ، داخ لە دەست جەوری زەمانە.

وای بۆ ئەوانەی کە فکری دوارِۆژیان نییە.

ئۆی چیم دی، چیم بەسەر هات.

ئۆف لەم دەردە چەند گرانە.... هتاد.

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا وشەکانی (ئاخ، ئاخ و داخ، حەیف، داد) بەناو و بە interjection داناوە. هەروەها (وای، ئای، ئۆف)ی بە ئامرازی (تعجب interjection) داناوە.

٣- نووری عەلی ئەمین لە رێزمانەکەیدا وشەکانی (ئای، ئای ئای، ئۆی، ئۆف، ئاخ)ی بە ئامرازی (تعجب) داناوە.

٥- جگەرخوێن لە کتێبەکەیدا (ئاوائو دەستورا زمانێ کوردی، لاپەڕە ١٣٢) وشەکانی (ئاخ، ئاخین، واخ، غەبینەت، مخابن، نەستێلە، تیا) بە ئالاقی

حەسرەت دادەنێت.

لە دوای ئەم نمایشتە:

لیژنە لەو باوەڕەدایە، ئەم وشانە کە بۆ دەربڕینی ئەسەف و کەسەر بەکار دێن دەبن بە ئامرازی (تعجب) هەرچەند وشەی وەهاشیان تێدایە (داد، حەیف، داخ...) کە لە رستەدا وەک (ناو) بەکار دێن، وەیا هەر ناوی بێ دەمەتەقەشن، بە نموونە:

داد لە دەستت! (لێرەدا وشەی «داد» کە ناوە بۆ کەسەرە).

دارا دادپەرستە (لێرەدا وشەی «داد» وەک ناو بەکار هاتووە).

ئەم رستانەی خوارەوەش نموونە بەکارهێنانی هەندێ لەو ئامرازانەن:

١- «ئاخ لەگەڵ ئێمە حەبیبە سەری پێوەندی نییە»

٢- وای لەم زوڵم و زۆرە!

٣- ئۆف لە دەست جەوری زەمانە!

٤- ئای کە پەندی پێ نواندم!

١٧- ئامرازی (ئەدی):

ئەم ئامرازە لەلایەن نووسەرانی کوردەوە باس نەکراوە [وا دەزانم مامۆستا وەهبی لە لاپەڕە «٤٦»ی فەرهەنگەکەیدا وشەی «ئەی ey» بە واتای «ئەدی» بەکار هێناوە لەو رستە نموونەیەدا کە دەڵێ «EY MIN» دیارە واتای رستەکە لە شێوە ئاخاوتنی تردا «ئەدی من» دەگرێتەوە - مەسعوود محەمەد]، بەڵام لە زاری کرمانجیی سەروودا لە جیاتی (ئەدی) دوو ئامرازی (ئەرێ پا، پاما) بەکار دێت.

ئەم ئامرازە چەند جۆرە بەکارهێنانێکی هەیە وەک لەم نموونانەدا بەدی دەکرێت:

١- ئەدی نەتبیست زارا مێردی کرد! (لەم رستەیەدا «ئەدی» جووتە مەبەستی تەعەجوب و تێگەیاندن لە شێوەی پرسیاردا دەردەبڕێت).

٢- کە بەم خانووە رازی نەبوویت، ئەدی بۆ دەتکڕی! (لێرەدا بۆ دەربڕینی نارەزامەندی بەکار هاتووە).

٣- یەکێک دەپرسێ: بەڕاست، دەبێ دانا بە مەسەلەکەی زانیبێت؟ لە وەرامدا یەکێک دەڵێ: ئەدی! یاخود: ئەدی ئەدی!

لێرەدا «ئەدی، ئەدی ئەدی» تەعەجوب لەوە رادەگەیەنێ کە چۆن پرسیارکەر نەیزانیوە دارا ئاگاداری مەسەلەکەیە.

١- لە سلێمانی وشەی (ئەیی) لە بری (ئەدی) بەکار دێت بە پێی دەستووری کلۆرکردنی دەنگەکەی دال.

٢- وشەی (بەدی) لە حاڵێکدا بەکار دێت کە پرسیارەکە لە شکڵی نەفیدا بێت، وەک:

باوکت نەهاتووەتەوە؟ بەدی!

ناچیت بۆ سەفەر؟ بەدی!

١٨- ئامرازی (پەکوو - پەک):

نووسەرانی کورد بەم جۆرەی خوارەوە لێی دواون:

١- مامۆستا سەعید سدقی لە صرف و نحوەکەیدا، لاپەڕە (٦٠) ئەم ئامرازە بە (اداتی تعجب) دادەنێت و ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە: پەکو لەم باغە چەند دڵگیرە!

٢- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا، لاپەڕە (١٠٣)، دەڵێ: (پەک، پەکو) ئامرازی تەعەجوبن.

٣- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا، لاپەڕە (١٥٢) وشەی (پەکو) بە ئامرازی تەعەجوب دادەنێت و ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوە: پەکو لە ئێوە چەند لەسەر قسە دەڕۆن.

٤- لە کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) پۆلی شەشەمی ئامادەیی، لاپەڕە (٢٢)، وشەی (پەکو) بە ئامرازی سەرسوڕمان (تعجب) دادەنێت و ئەم نموونانەشی بۆ هێناوەتەوە: پەکو لەو ماڵەی! - پەکو لەو حەلاماتەی!

٥- جگەرخوێن لە (ئاوائو دەستورا زمانێ کوردی)، لاپەڕە (١٩٧)، وشەی (پەک) بە ئامرازی تەعەجوب دادەنێت و ئەم نموونانەی بۆ هێناوەتەوە: پەک لڤێ عەجێبێ ئەز چە دبێژم ئەو چە دبێژی! - پەک ئەڤ چە ئەژدەهایە!

لە دوای ئەم نمایشتە لیژنە هاتە سەر دەربڕینی رای خۆی لە بارەی ئامرازەکەوە.

ئەم نموونانەی خوارەوە جۆری بەکارهێنانی پەکوو دەردەخەن:

پەکوو لەم دەردە گرانە!

پەکوو چ کابرایێکی جارِسە!

یەکێک دەڵێت: تەرزە دەغڵی وڵاتی کوتا! ئەوی تریش بە پەرۆشەوە دەڵێت: پەکوو!

لە مانەوە دەردەکەوێت کە ئامرازی (پەکوو) لە بنەڕەتدا بۆ دەربڕینی هەستی نارەحەتی پەیدا بووە، بەڵام دەشێ بە مەجاز بۆ تەعەجوبی عادەتی بەکار بێت، وەک پەکوو لەم باغە کە دڵگیرە! لەم نموونایەدا جوانی باغەکە لەڕادە بەدەرە.

ئامرازی (پەک)یش بە واتای (پەکوو) بەکار دێت، دیارە کورتکراوەی ئەوە. مامۆستا توفیق وەهبیش لە لاپەڕە (١٠٣)ی فەرهەنگەکەیدا بە هاوواتای یەکتری داناون.

١٩- ئامرازی (دەک، ئەک، هەک):

نووسەرانی کورد بەم جۆرە لێی دواون:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لەلاپەڕە (٣٣)ی فەرهەنگەکەیدا وشەی (ئەک، دەک) بە ئامرازی تەعەجوب دادەنێت و دەڵێت بۆ دەربڕینی ئاواتی چاک یا خراپە، وەک:

دەک پێ نەگەیت.

دەک بەخێربێن.

٢- نووری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٥٢)ی ڕێزمانەکەیدا وشەی (دەک، ئەک، هەک) بە ئامرازی تەعەجوب دادەنێت و ئەم نموونەیەشی هێناوەتەوە:

«دەک پیرۆزت بێت یانە بە تەنیا»

دیارە رووسووری لە هەردوو دنیا»

٣- جگەرخوێن لە لاپەڕە (٩٧)ی کتێبەکەی (ئاوائو دەستورا زمانێ کوردی) وشەی (هەک) بە ئامرازی تەعەجوب دادەنێت و ئەم نموونانەشی بۆ هێناوەتەوە:

هەک کورۆ، تو ل ڤر چەدکی؟

هەک ماڵ خرابۆ، ئەڤ چییە؟

٤- له کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی لاپەڕە (٢٢)دا دەڵێت: ئامرازی (هەک) له شوێنی (پەک) یان (پەکو) دێته گوتن، وەک: هەک کوڕۆ تو ل ڤره چ دکەی؟

لیــژنەش هەر لەو باوەڕەدایه کــه ئەم ئامــرازه بۆ تەعــەجــوبه، بەڵام دەشــێ بۆ دەربڕینی هەستی خۆشی و ناخۆشی بەکار بێت زیاتریش بۆ ناخۆشی وەک لەم بەستەی شاییدا دەگوترێ:

«دەک نەمینێم وەک نەمام»
سینگت باغچەی به تەعام»
گچکه بووم پێی بووم تەمام»
«دەک ئاخ و ئۆخی دایکی جەرگ سووتاو»
«بۆ خەتاباران بێته ژانی چاو»

٢٠- ئامرازی (پەح، پەحا):

نووسەرانی کورد بەم جۆره لەم ئامرازه دواون:

١- مامۆستا سەعید له لاپەڕە (٦٠)ی صرف و نحوەکەیدا وشەی (پەح) به ئامرازی تەعەجوب دادەنێت و ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوه: پەح ئەم گوڵه چەند ناسکه!

٢- مامۆستا توفیق وەهبی له لاپەڕە (١٠٣)ی فەرهەنگەکەیدا وشەی (پەح، پەحا، پێح، پیاح) به ئامرازی تەعەجوب دادەنێت..

٣- نووری عەلی ئەمین له قەواعیدەکەیدا، لاپەڕە (٥٤)، وشەی (پەح) به ئامرازی تەعەجوب دادەنێت و ئەم نموونەیەشی بۆ هێناوەتەوه: پەح لەو پیاوه که قسان دەکات.

٤- جگەرخوێن له کتێبی (ئاوائو دەستورا زمانێ کوردی)، لاپەڕە (٩٨)دا دەڵێ ئامرازی (پەکو، پەح) له سۆرانیدا هەیه.

٥- له کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) پۆلی شەشەمی ئامادەیی، لاپەڕە (٢٢)دا، دەڵێ: ئامرازی (پەح) ئامرازی سەرسوڕمانه، وەکو: پەح لەو منداڵه تەمەڵه.

بەلای لیژنەوەش ئەم ئامرازەی (پەح) بۆ تەعەجوبە واتە ئەمرازێکی Interjection ـە بە هەموو ئەو واتا و مەبەستانەوە کە بەری دەکەون وەک رالێبوون و رالێ نەبوون و نارەزایی...

٢١- ئامرازی (پیاح، پێح):

هەرچەند مامۆستا وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا وشەکانی (پەح، پەحا، پێح، پیاح)ی بە ئامرازی تەعەجوب داناون، بەلاّم بەپێی جۆری بەکارهێنانی (پێح، پیاح) دەردەکەوێت، ئەم دوو ئامرازە سەرەڕای تەعەجوب، نەسەلماندنیش ڕادەگەیەنن، وەک ئەوەی یەکێک بەیەکێکی تر بڵێت (تۆ دەتەوێت لە فلاّن کەس نزیک ببیتەوە) ئەویش لە وەرامدا بڵێت (پێح) یا (پیاح) بە واتای ئەمە ڕاست نییە، یاخوت لە من بە دوورە.

٢٢- ئامرازی (حەست):

لەو نووسەرانە تەنیا نووری عەلی ئەمین لەم ئامرازە دواوە و بە ئامرازی تەعەجوبی داناوە و ئەم نموونەیەی لە ڕێزمانەکەیدا، لاپەڕە (١٥٣)، بۆ هێناوەتەوە، وەک یەکێک بەیەکێکی تر بڵێت (خانووەکەمان سووتا) ئەویش لە وەرامدا بڵێت: (حەست!).

لیژنە هەر ئەوەندە تێبینییەی هەیە لە رایەکەی نووری عەلی ئەمین، کە ئەم ئامرازە بۆ تەعەجوب لە حاڵەتی خۆشی و ناخۆشیدا بەکار دێت، وەک ئەوەی یەکێک بڵێت (بارام چووەتە ڕاو شەش کێوی کوشتووە) ئەوی تریش بە تەعەجوبەوە بڵێت (حەست!).

٢٣- ئامرازی (چش):

لەناو نووسەرانی کورددا:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا لاپەڕە (٢٩) لە ئامرازی (چش) دواوە و بەئامرازی تەعەجوبی داناوە.

٢- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا لاپەڕە (١٥٢) لەم ئامرازە دواوە بە ئامرازی تەعەجوبی داناوە و ئەم نموونەیەی بۆ هێناوەتەوە، وەک یەکێک بڵێت

(هەر باخەکە مابوو، ئەویشم فرۆشت) ئەوی تر لە وەرامدا بڵێت: (چش!).

٣- جگەرخوێن لە کتێبەکەیدا «آوائو دەستورا زمانی کوردی» لاپەڕە (١٢٣) ئامرازی «چش» و «تش» بە ئالاڤی لاقردی (استهزاء) دادەنێت و ئەم نموونەیەی بۆ هێناوەتەوە:

تش وێ فەرهاد ژمەرە دوژمنا بشکێنی.

بەلای لیژنەشەوە ئامرازی (چش) بۆ تەعەجوبە، بەو واتایەی کە لە لایەن نووسەرانەوە نموونەی بۆ هاتووەتەوە.

٢٤- ئامرازی (هەو):

لە ناو نووسەرانی کورددا:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا لاپەڕە (٦٥) ئەم ئامرازە، بە ئامرازی تەعەجوب دادەنێت؛ بۆ تەعەجوبێ کە تووڕەبوونی تێدا بێت.

٢- نووری عەلی ئەمین لە ڕێزمانەکەیدا، لاپەڕە (١٥٤)، لەم ئامرازە دواوە و بە ئامرازی تەعەجوبی داناوە و ئەم نموونەیەی بۆ هێناوەتەوە، وەک یەکێک بڵێت (پرشنگ تۆراوە) ئەوی تر لە وەرامدا بڵێت (هەو! خۆ دوێنێ برا بە بووکی).

بەلای لیژنەشەوە وشەی (هەو) ئامرازی تەعەجوبە بۆ دەربڕینی ئەو مەبەستانەی کە لە نموونەکانی سەرەوەدا دەردەکەون بەکار دێت؛ بەڵام هەندێ جار لە جیاتی (هەو) دەگوترێت (حەو).

٢٥- ئامرازی (عیو):

جگەرخوێن لە لاپەڕە (٩٧)ی کتێبەکەیدا (آوائو دەستورا زمانی کوردی) دەڵێت وشەی (أیو) یا (عیو) بۆ تەعەجوبە، وەک:

ایو مال خرابۆ! تۆ چەقا کوری

ایو مال خرابۆ! تۆ چە ترسۆنەکی

بەلای لیژنەشەوە وشەی (عیو) لە زاری کرمانجیی خواروودا بۆ تەعەجوبە، بەڵام لە حاڵەتی پەسەندکردندا.

٢٦- ئامرازی (تەح، تەحا):

لە ناو نووسەرانی کورددا:

١- مامۆستا توفیق وەهبی لە لاپەڕە (١٤٣)ی فەرهەنگەکەیدا وشەی (تەح) و (تەحا) بە ئامرازی تەعەجوب دادەنێت لە حاڵەتی سەیر پێهاتنی ناڕەزامەندانە.

٢- مامۆستا سادق بەهائەدین دەڵێت ئەم ئامرازە لە شێوەی سەروودا بۆ ئەسەف و تەعەجوب بەکار دەهێنرێت، وەک ئەوەی بگوترێت (فڵانەکەس زۆر نەخۆشە) وەیا (فڵانەکەس مردووە) یەکێکیش بە پەرۆشەوە بڵێت (تەحا!).

ئەمەش نموونەیەکە لە بەکارهێنانی وشەی (تەحا):

ڕۆژێکی لە بێ چارەیی و بێ شەرمی

پێم گوت سەنەما، تەحا! ئەتۆ بێ ڕەحمی

بەلای لیژنەشەوە ئەم وشەیە ئامرازی تەعەجوبە و بۆ ئەو مەبەستانە بەکار دێن کە لە نموونەکاندا دیارن.

***

لەپاش لێبوونەوە لە باسی هەشت بەشی سەربەخۆی ئاخاوتن کەوا جگە لە چاوگ، بریتی بوون لەمانە:

١- ناو.

٢- راناو.

٣-ئاوەڵناو.

٤- (کار - چاوگ).

٥- ئاوەڵکار.

٦- ئامرازی پریپۆزیشن (تعلق).

٧- ئامرازی عەتف.

٨- ئامرازی نیدا و تەعەجوب.

لیژنە هاتە سەر لێکۆڵینەوە لەو زیادییانەی کە لەلاوە دێن و بە وشەوە دەلکێن و واتاگۆڕییان تێدا پەیدا دەکەن.

له پێشـەوه لیژنه وای پەسـەند کرد نمایشـتێکی بیروڕای نووسـەرانی کورد له بارەی ئەم باسەوه بکات، بەدوای ئەوەدا لێکۆڵینەوەی تایبەتی بکات.

یەکەم - مامۆستا سەعید سدقی له کتێبەکەیدا (صرف و نحوی کوردی) له لاپەڕە (٥١)ەوە، له ژێر سـەرەباسی (أدوات) باسی هەندێک لەو زیادییانه دەکات، کـه له زاراوەی نوێدا به گـیـرەک واته پێـشـگر و پاشـگر دادەنرێن و ئەو ناویان دەنێت:

١- أدواتی مکان:

جار: مەرەزەجار، نێرگزەجار.

ستان: کوردستان، دارستان.

دان: ئاگردان، چرادان.

لانی: بەردەلانی، زیخەلانی.

گا: سەیرانگا، ڕێگا.

٢- أدواتی نیسبەت:

ی: هەورامی، هەولێری.

مەند: دەوڵەمەند، دەردمەند.

ین: ئاسنین.

٣- ادواتی تشبیه و لیاقەت:

انه: پیاوانه شێرانه.

آسایی: من آسایی، خالید آسایی.

٤- أدواتی تفضیل:

تر: زیرەکتر، بچوکتر.

ترین: فاضلترین.

٥- أدواتی محافظە:

دار: کلیلدار، دەفتەردار.

وان: ئاشەوان، باخەوان.

٦- أدواتی فاعل:

یار: کڕیار، فرۆشیار.

کار: کرێکار، بەدکار.

گار: ئامۆژگار، پارێزگار.

گەر: چەقۆگەر.

وار: خوێندەوار.

وا: نانەوا.

چی: قۆندەرەچی، پینەچی.

٧- أدواتی ظرفیەت:

دا: لە دنیادا ئەهلی عیلم موحتەرەمە.

٨- أداتی (دە):

١- بۆ استقبالە، وەک (دەخوێنم، دەنووسم).

٢- بۆ ماضی استمرارییە، وەک (دەمخوێند، دەمنووسی).

٣- بۆ تەئکیدی فیعلی ئەمرە، وەک:

دە بنووسە، دەبا بنووسێت.

٩- أداتی (کە) بۆ تۆقیتە، وەک:

«کە من نەخلی مرادم بێ ثمر بێ»

١٠- أداتی (وە) بۆ تەکرارە، وەک:

هاتەوە

چومەوە بۆ ماڵەوە.

دووەم- مامۆستا توفیق وەهبی لە کتێبەکەیدا (دەستووری زمانی کوردی) لە پێشگر و پاشگر وەک باسێکی سەربەخۆ نادوێت، بەڵام کە دێتە سەر باسی پارچەکانی ئاخاوتن، بە پێی پێویست، ناو، یا ئاوەڵناو، یا ئامرازی پریپۆزیشن، وەیا هەرپارچەیەکی تری ئاخاوتنەکە چ پاشگر چ پێشگری بچێتە سەر بۆ مەبەستێ بێت بە ناوی ئەداتەوە لێی دەدەوێت.

١- لە بەشی (ناو) لە لاپەڕە (٣١)ەوە هەتا لاپەڕە (٦٠):

آ- پاشگری «کە» و «ەکە» بە ئەداتی تەعریفی موعەیەن و پاشگری (ێ، ێک) بە ئاداتی تەعریفی ناموعەین دادەنێت.

ب- پاشگری (ان) بە ئەداتی گەلکردنەوە (جمع) دادەنێت.

جـ- پاشگری (ی، ێتی، ایی، انە، ە، ۆکە، ا، ین، ینە...) بە ئەداتێ دادەنێت کە خرایە دوای سیفەتەوە یا فیعلەوە (رەگی فیعل) دەیکەن بە (ناو).

د- بۆ بچووککردنەوەی ناو ئەم پاشگرانەی بە ئەدات داناوە (ۆلە، لە، یلە، وولە، ۆک، ۆکە، ەک، ەکە، کە، یلکە، ۆلکە).

٢- لە بەشی «سیفەتدا» لە لاپەڕە (٦١)ەوە هەتا (٨١) ئەم پاشگرانەی بە ئەدات داناوە (ی، انە، انی، ین، ئاسایی، ەوار، ەکی، اوی، کەر، گەر، ەوان، ۆک، دار...) بە هۆیانەوە سیفەتی چۆنی پێ لە (ناو) دروست کردووە. هەروەها بۆ دروستکردنی سیفەتی چۆنی بچووککراوە چەند پاشگرێکی بەکار هێناوە بە ناوی (ئەدات)ەوە، کە ئەمانەن (یلە، ەلە، ۆڵە، ۆک، کەلە)، پاشگری (ەم، ەمین)یش بۆ دروستکردنی ژمارەی تەرتیبی لە ژمارەی ئەسڵی.

٣- هەروەها مامۆستا توفیق وەهبی لە فەرهەنگەکەیدا لاپەڕە (١٠٣) زاراوەی (پاشبەند)ی لە بری Suffix یا پاشگر داناوە، وەک زاراوەیێکی ڕێزمانی. دیسانەوە لە لاپەڕە «١٠٨» وشەی (پێشبەند)ی لە بری Prefix وەک زاراوەیێکی ڕێزمانی داناوە.

سێیەم - مامۆستا کوردوییف لە کتێبەکەیدا (گرامەتیکا زمانێ کوردی) لە لاپەڕە (٢٢) لە ژێر ناونیشانی (مۆرفۆلۆگیا)دا باسی ئەمانەن خوارەوەی کردووە، کە هەموویان بەر مفهومی ئامراز دەکەون:

١- پاشــپــرتک (پاشگر)، وەک (ک، ۆک، ەک، چی، کــار، دار، انی، انە، ێ، تی - هەڤاڵتی - کی، کینگ، نگ، ین، دان، دانگ، دین، ستـان، گە، لان، خـان، باز، وار، یار، ار، گار، بەند، مەند، ساز، وی، ایی، وم، تانکی...).

٢- پێشپرتک (پێشگر):

أ- لەگەڵ ناو، وەک (بێ، نە، سەر، بەر، بن، ناڤ...).

ب- لەگەڵ کار، وەک:

- هل، ڤە، ڤێ، دا، روو، وەر، دەر، بەر، بن، پەی، پێش، دوو.

- ژێ، تێ، لێ، ژەڤ، لەڤ، پەڤ، تەڤ.

- سەردا، سەرڕا، بەرڕا، ڕەخڕا، ناڤڕا، بنڕا، شووندا، پێشدا، پاشدا.

[لێــرە بەدواوە ئەندامی تازەی لیــژنـە، د. ئیــبــراهیم حــاجی، بەشــداریی کۆبوونەوەکانی لیژنەی کردووە].

چوارەم - نووری عـەلی ئەمـین - کـتـێـبێکی لە ژێر ناوی (گـرتنی کـەلێنێکی تر لە ڕێزمـانی کـوردی) لەســەر (پاشگر و پێـشگر) داناوە، بریتـییـە لە (٥٠) لاپەڕە، لەم کتێبەدا نووری عەلی لەم گیرەکانە دواوە:

١- لە دوو پێشگری (ئە) و (ب). پێشگرەکـانـی تریشی لە کـتـێـبـەکـەی (ڕابەرێ بۆ ئیملای کوردی)دا نووسیوە.

٢- لە کۆمەڵێک پاشگر دواوە کە ئەمانەن (ێ - ێک، کە، ەکە، یەکە، ە، ۆ، ک، اک، وک، ەم - ەمین، ۆک، ۆکـە، وو، ەڵ، ەڵە، ۆڵە، ۆڵ، یل، یلە - لە، ۆلە، کـە، وولە، کـەلە، وولکە، ۆڵکە، یلکە، چە، چکە، ۆچکە، گـە، ەن، گـا، دان، دێن، یەن، زار، ەڵان، ستان، جاڕ، ی - یی، ور، ەوا، ەوەر، ەوار، کەر، دار، باز، کار، گەر، یار، ندە، مەندە، ن، (in)، ین، اوی، ەکی، انی، ناک، ێنی، ەتی، ەمەنی، یەتی، ایەتی، ێتی، اسـایی، ەوە، وە، ڕەوە، تەوە، یەوە، ایە، دا، ڕا، ڕێ، و، ەر، ڕاو، دن، اندن، ند، اند، ێن، یە).

پێنجـەم - مـامـۆسـتا کـمـال بادلی لە کـتـێبەکـەیدا (کـورتچـە گرامـەری کـرمانجـجـە لەهجـەسی) کە لە ساڵی ١٩٦٥دا لە چاپ دراوە، لە لاپەڕە (١٣٨)دا لە ژێر

بابەتی (ئەدات)، دەڵێت: ئەدات ئەو وشانەن کە واتای سەربەخۆیان نییە، بەڵام دواتر دەڵێت هی وایان تێدایە بە تەنیا واتای تایبەتی دەدات، لەگەڵ ئەمەشدا پێویستی بە وشە و بەڕستە هەیە لەگەڵیاندا بەکار بێت. ئەداتیش لە کرمانجیی سەروودا دەکات بە چوار بەشەوە:

آ- پێشگر (السابقة).

ب- پاشگر (اللاحقة).

جـ- دەست پێکردن (الابتداء).

د- پێوەندی (ربط).

یەکەم: پێشگر:

آ- پێشگری راستەقینە، وەک (بێ).

ب- پێشگری وەک ئاوەڵکار و ناو:

- پێشگری ئاوەڵکار وەک (بن، دەر، دوو، دۆر، داوی، هندوور، بەر، ژێر، ژۆر، پاش، پێ، پێش، سەر...).

- پێشگری ناو، وەک (بۆ، بۆن، جەم، جێ، دۆر، هەمبەر، بەرگەند، هێل، سەب، پاش، پار...)

دووەم - پاشگر:

پاشگر هەندێکیان بوونی سەربەخۆیان هەیە، هەندێکیشیان کەرتی دواوەی پێشگرن، وەک:

دا: د... دا

ڤە: د... ڤە

ڤا: د... ڤە

را: بـ... را

سێیەم - ئەدەواتی دەست پێکردن:

ئەم ئەداتانەش بە پێنج بەش دابەش دەکات:

١- بانگکردن.

٢- وریاکردنەوە.

٣- رالێبوون.

٤- تەئسوف.

٥- تووڕەبوون.

چوارەم - پێوەندی (ربط):

ربطیش دەکات بە حەوت بەشەوە:

١- ربط نیشاندەر.

٢- دوودڵی نیشادەر.

٣- استدراک نیشاندەر.

٤- مەرج نیشاندەر.

٥- بەرابەری نیشاندەر.

٦- سەبەب نیشاندەر.

خۆزی نیشاندەر.

تێبینی:

لیژنە پێویستی نەدیت درێژە بدات بە باسی ئەو ئەداتانەی کەوتنە دوای پێشگر و پاشگر لە کتێبەکەی مامۆستا (کمال بادلی)دا. ئەگەر ئەو کتێبە لە زووێکەوە بە دەستی لیژنە کەوتبایە هەر یەکێک لەو ئەداتانە لە جێی خۆیدا باس دەکرا.

شەشەم - مامۆستا جگەرخوێن لە کتێبەکەیدا (آوائو دەستورا زمانێ کوردی) لە لاپەڕە (٨٧)ەوە دەست پێ دەکات بە باسی (آلاڤ = ئەمراز) و دابەشی دەکات بەسەر (٢٧) بەشدا:

١- آلاڤێ بانگێ.

٢- آلاڤێ خۆشی و نەخۆشی.

٣- آلاڤێ هەیڤی و خوەزی.

٤- آلاڤێ تەعجب.

٥- آلاڤێ گومان.

٦- آلاڤێ مەربەند.

٧- آلاڤێ گشتی.

٨- آلاڤێ سەبۆنی (خاتران، سەبووری).

٩- آلاڤێ آوای.

١٠- آلاڤێ وەکی.

١١- آلاڤێ ناڤتێدان (التحريض).

١٢- آلاڤێ ئاگاهداری (التنبيه).

١٣-آلاڤێ تەقەزە (اداة التحقيق).

١٤- آلاڤێ يان يانە (أداة غير معينة).

١٥- آلاڤێ نەبوونی (أداة النفي).

١٦- آلاڤێ داوی (أداة النهاية).

١٧- آلاڤێ خوەشکی و خوەشکرن (أداة التحسين).

١٨- آلاڤێ دەمدار.

١٩- آلاڤێ گەل (بمعنى مع).

٢٠- آلاڤێ دانزانین (أداة المعرفة) وەکو (ئێ، کە).

٢١- آلاڤێ فۆرت (مبالغة).

٢٢- آلاڤێ بچوکی (أداة التصغير)، وەکو (کۆ، کێ، ک، کا، لە، ئۆل، ئۆ، ئێ).

٢٣- آلاڤێ راستی (أداة التحقيق).

٢٤- آلاڤێ ئاخین و کەسەر (حسرە).

٢٥- آلاڤێ طناز و لاقردی (استهزاء).

٢٦- آلاڤێ جی گە (أداة المكان)، وەک (ستان، گە، لان، دان، خانە).

٢٧- خوردە ئالاڤ، وەک (دی، ژی، ش، دیسا، سا، وەکی دی، بەسە، ایدی، هەو - لەبری بەس هاتووە-).

هەروەها جگەرخوێن لە هەمان کتێب لە باسی کاری ناسادەدا، لاپەڕە (١٢٧)، لە دوو جۆری ئالاڤ دەدوێت:

١- آلاڤێ (را، دا، ڤ، هل، تێک، ڤێک، دەر، شاش، پەق، سار، رۆ، پێش، بەر، سەر، بن، وەر، لا، پێ، تێ، لێ، ژێ، خوار، ئاڤ، پێک، ل هەڤ، ژ هەڤ، ب - بە).

٢- نیشانە (العلامة) [لە لاپەڕە «١٣٥» بە دواوە]، وەک:

ان بۆ کۆتاییی چاوگ.
ن بۆ کۆتاییی چاوگ.
ه کاری رابردووی تێپەڕ دروست دەکات.
ب دەخرێتە پێش کاری رابردووی ئینشائی.
د دەخرێتە پێش کاری رابردوو و رانەبوردوو.

لێرەشدا لیژنە هەر ئەو بەشە ئەداتانەی نووسینەوە کە پێوەندییان بە باسەکەوە هەیە.

حەوتەم - رشیدی کورد لە کتێبەکەیدا (رێزمانا زمانێ کرمانجی) لە لاپەڕە (٥١) لە باسی ئاوەڵناودا، بەتایبەتی لە ئاوەڵناوی دارژاو، ئەم پاشگرانە بەکار دێنێت، وەکو (باز، کار، کەر، ڤان، گین، یار، گین، یار، دار، آنی، آنە، یی).

هەروەها ئامرازی (هەڤ، نیڤ) بە پاشگر دادەنێت، دیسان (خواز - خواس، رووت، گوت) بە پاشگر دادەنێت. هەروەها (تر، ترین) بە پاشگر دادەنێت.

لە کاریشدا (ا، ار، ە، ۆک، وەر) بە پاشگر دادەنێت.

لە کاری ناسادەشدا ئەم پێشگرانەی بەکار هێناوە (دا، هل، ڕا، ڤە، ڤێ...).

هەشتەم - جەلادەت بەدرخان و رۆژێرلێسکۆ لە کتێبی (رێزمانی کوردی) کە لە ساڵی ١٩٧٠ بە زمانی فەرەنسی بڵاو کراوەتەوە، لە لاپەڕە (٢٨٠)دا بەم جۆرە باسی پێشگر دەکەن:

Les Prefixes sont pour la plupart des past positions employeés comme tels (bi, ber, nav ve, etc.) des constractions de prépositions avec divers pronoms (tev, têk, jê, lê, etc.) des adjectifs au pronoms indefinis au autres (hem, hev, xwe, etc.) au encore des adverbes (me, mi).

Certains, comme: bo, her, hil, ra, wer, ne, sont réductibles a aucun de ces éléments. On trauvera ci - aprés la list des préfixes par ordre alphabétique avec dans la mesure du passible, l'indication de leur origine.

هەروەها لە لاپەڕە (٢٥٨)دا باسی پاشگر بەم جۆرە دەکات:

De même que les préfixes, les suffixes sont pour part ((hére - ditaires)) (a, ak, asa, awer, ar, bar, dar, ek, ˆl, mend, van, pour ne citre que les principaux).

Pour l' autre ils ont tirés de racines verbales (kir, kuj, nivîs, zan, etc.) au nominales (geh, yar, xane, etc.). L'origine de ceux qui appar - tiennent á la seconde catégorie sera indiqueé dan chaque cas.

نۆیەم - لە کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی) پۆلی دووەم و سێیەمی ناوەندیی قوتابخانەکاندا بەم جۆرە لە پێشگر و پاشگری (کار) دەدوێن:

آ- پاشگری فرمان:

١- پاشگری (ان، تن، دن، ون، ین) رەگی فرمانیان پێ دەبێت بە چاوگی ریشەیی، وەک:

| رەگی فرمان | چاوگی ریشەیی |
|---|---|
| پێو | پێوان |
| کەو | کەوتن |
| کر | کردن |
| چ | چوون |
| زان | زانین |

٢- پاشگری (ە)، وەک: (بڕین - بڕ + ە بڕە)

٣- پاشگری (ەک)، وەک: (پەستن - پەست + ەک = پەستەک)

٤- پاشگری (ۆک)، وەک: (گەڕان - گەڕ + ۆک = گەڕۆک)

٥- پاشگری (کە)، وەک: (فڕین - فڕ + کە = فڕکە) [لە کتێبەکە نموونە بۆ ئەم پاشگرە نەهاتووەتەوە، لیژنە نموونەکەی هێنایەوە]

٦- پاشگری (یار)، وەک: (فرۆش + یار = فرۆشیار)

٧- پاشگری (ندە)، وەک: (بڕین - بڕ + ندە = بڕندە)

٨- پاشگری (ن)، وەک: (نووزان - نووز + ن = نووزن)

٩- پاشگری (ار)، وەک: (وتن - وت + ار = وتار)

١٠- پاشگری (ا)، وەک: (زانین - زان + ا = زانا)

١١- پاشگری (انە)، وەک: (لەرزین - لەرز + انە = لەرزانە)

١٢- پاشگری (ەمەنی)، وەک: (سووتان - سووت + ەمەنی = سووتەمەنی)
١٣- پاشگری (را)، وەک: (کێڵان - کێڵ + را = کێڵرا)
١٤- پاشگری (راو)، وەک (کێڵ + راو = کێڵراو)
١٥- پاشگری (رێ)، وەک: (خوێن + رێ = دەخوێندرێ)
١٦- پاشگری (ەر)، وەک: (نووسین - نووس + ەر = نووسەر)
١٧- پاشگری (اندن)، وەک: (فڕان - فڕ + اندن = فڕاندن)
١٨، ١٩- پاشگری (ەوە، ەڤە)، وەک: (هات + ەوە + ەڤە = هاتەوە - هاتەڤە) [ئەم دوو پاشگرە لە کتێبی «زمان و ئەدەبی کوردی» بۆ پۆلی دووەمی ناوەندی وەرگیراوە.]

بەم جۆرەش تەعریفی پاشگری کردووە.

(پاشگری فرمان ئەو بێژەیەیە کە بە دوای فرمانەوە دەنووسێت بۆ پێکهێنانی واتا و مەبەستی نوێ و دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی زمانەکەمان).

ب- پێشگری فرمان:

١- پێشگری (ب):

- رەگی فرمانی پێ دەبێت بە رانەبوردووی ئیلزامی، وەک:

خوێن          بـ (خوێن)م

- رەگی فرمانی پێ دەبێتە فرمانی داخوازی، وەک:

نووس          بـ (نووس)ە

- رەگی فرمانی تێ نەپەڕی پێ دەبێتە ئاوەڵناوی بکەر، وەک:

کڕ          بـ + کڕ = بکڕ

- رەگی فرمانی پێ دەبێتە رابردووی ئینشائی، وەک:

خوێند          بـ + خوێند + ایە = بخوێندایە

٢- پێشگری (هەڵ، دا، را، ڤە، سەر، پێش، ڤیدا، پێوە، روو، لێ)، بەم جۆرەش تەعریفی دەکات:

(پێشگری فرمان ئەو بێژەیەیە، کە دەکەوێتە پێش فرمانەوە بۆ دروستکردنی

واتا و مەبەستی نوێ و دەبێتە هۆی دەوڵەمەندیی زمانەکەمان).

دەیەم - لە کتێبی (دستوری پارسی) دانانی ر. ذوالنور، لاپەڕە (٢٢١)ەوە هەتا (٢٩٦) لە (پیشوند، میانوند، پسوند) دەدوێت، کە پێشگر و پاشگر و ناوگر رادەگەیەنێت:

١- لە بارەی پێشگر و دەڵێت لفظیکە لەپێشەوە بۆ گۆڕینی واتای وشە ئەمانەی خوارەوەش پێشگری ناسراوی فارسین:

(آ) پێشگری نەفییە، وەک (آوردن) کە لە (ا) و (وردن) بە واتای بردن پێک هاتووە و دەبێتە پێچەوانەی (بردن) کە دەبێتە (نەبردن - هێنان).

(أ - ئە) ئەمیشیان بۆ نەفییە، وەک (أمرداد) کە (بێ مردن) رادەگەیەنێت.

(أپ) بە واتای دوورخستنەوە، وەک (أپگندن و افگندن - پ بۆتە ف - ).

(امـ) بە واتای (این) وەک (امشب، امروز).

(أن) بۆ نەفییە وەک (أنوشە - بێ مەرگ).

(أندر) کە لە پێش کارەوە دێت، وەک (اندر امد، اندر افتادند).

(ب) کە حرفی توکیدە بۆ کار، وەک (برو، بزن، برفت، بزد...).

(ب) کە دێتە سەر ناو و دەیکا بە ئاوەڵناو وەک (بخرد، بهوش) کە تەخفیف کراوی (با)یە بە واتای (باخرد، باهوش).؛

(با) پێشگری وەسفە، وەک (باخرد، باوجدان، با أدب).

(باز) دێتە سەر کار وەک (بازگشت، بازدید، بازداشت).

(بر) کە بێتە سەر کار دەبێتە پێشگر وەک (بر گرفت، برافشاند، برنشست).

(بل) پێشگری موبالەغە وەک (بلهوس، بلکانە، بلفضول، بلعجب).

(بی) پێشگری نەفییە وەک (بی کار، بی نام، بی عقل).

(بیرون، برون) کە بێتە سەر کار دەبێتە پێشگر وەک (بیرون رفت، بیروان اورد، برون کرد).

(پ) لە بنەڕەتدا upaی ئاویستایە، لە فارسیدا (پ) ماوەتەوە وەک (پدید، پگاه، پدرود).

(پاد) بە واتای (دژ = ضد) وەک (پاد زهر، ضد زهر، پتیارە، پاداش، پاسخ،

پادا فراه).

(پر) وەک (پرستیدن، پرداختن، پراگندن).

(پی) وەک (پیمودن، پیکار).

(خ) به واتای چاک وەک (خجسته).

(در) پێشگری کاره وەک (دریافت، در گذشت، در کشید).

(دژ – دش) به واتای بەد وەک (دشمن، دشخواز، دشوار، دشنام، دژخیم).

(فرا) پێشگری کاره وەک (فراگرفت، فرارسید، فرا آمد).

هەروەک ئەمانەش (فر، فراز، فرو، م – بۆ نهی –، می، ن – بۆ نەفی کار –، نا – بۆ نەفی ناو، وەک نادان، ناشناس –، وا، ور، هم، هما).

٢– له بارەی ناوگر (میانوند)ەوه دەڵێت (بەو حەرفانه دەڵێم که دەکەونه نێوان ناوی ئاوێته):

(آ) ئەم ناوگره به (٩) جۆر باس دەکات.

١– (آ) بۆ دوعا وەک (خدا اورا بینا کناد – مریزاد، مباد).

له لیژنەوه تێبینی: لێرەدا بوو بەناوگری کار نەک ناوی ئاوێته.

٢– (آ) بۆ اشتمال، بۆ تکرار، بۆ حال، بۆ تلوّن، بۆ عطف، بۆ زیاده دێت [وەک سبکار که له سبکرەوه هاتووه]، بۆ بەرایی.

٣– (به) سێ جۆری هەیه:

أ– (به) بۆ اشتمال.

ب– (به) بۆ تدوام.

جـ– (به) بۆ تلوّن.

به دوا ئەمانەدا ناو گرەکانی (تا – سرتاسر –، و – گیرودار –، ی – دانایی –، ی – دانایان).

٣– له بارەی پاشگرەوه: له لاپەڕه (٢٣٣)ەوه تا لاپەڕه (٢٩٦) لەسەری دەڕوات، لێرەدا زۆر به کورتی ناوەڕۆکی ئەو لاپەڕانه باس دەکەین.

له تەعریفی پاشگردا دەڵێت: لەفزێکه له دوا وشەوه دێت تاکو مەعنایێکی تازه

پێک بهێنێت.

ئەمانەش بە پاشگری جۆراوجۆر دادەنێت:

(أ) هەژدە جۆری بۆ داناوە:

(آب، آسـا، آک، آگین، آل، أم [دوازدهـم، بیـسـتـم]، ان، امین [شـانزدهـمـین، بیستمین]، آن (چوار جـۆری باس دەکـات)، اندر، انده، آنه، او [بۆ مـبـالغه و هـی قسەی بازاڕییە]، آور، اومند، اویه، ایزه، دین، اینه، بار).

بە دوا ئەمـانەدا باسـی ٧٠ پاشـگری تریش دەکـات کە لیژنە بە پێـویسـتـی نەدی، هەمـوویان بێنێـتـە ناو باسـەکـەیـەوە، هەر کـاتێکیش لە لێکۆڵینەوەی خـۆیدا کـاری پێیان بوو، دەگەڕێتەوە سەریان.

یازدەهەم - لە کتێبی

AN ENGLISH GRAMMAR BOOK

BY

Evan C. Penglis

لە لاپەڕە (٣٦٥) لە بارەی پاشگر و پێشگرەوە ئەمە دەڵێت:

پێشگر ئـامـرازێ، وەیا وشـەیەکە لەپێش قەدەوە STEM دێت، وەک: unhappy, afterthaught

پاشگر ئـامـرازێکە دەخـرێتـە دوای قـەدەوە بۆ گـۆڕینی دەوری وشــە، وەک ئەوەی ئاوەڵناوی foolish دەبێتە ناوی مەعنەوی، دەکرێتە foolishness

بە دوا ئەمــەدا دەڵێت بـەشی زۆری پێـشـگر و پاشـگری زمـانـی ئینگلیـزی یا لە لاتینی یا لە یۆنانیـیەوە هاتـوون، لە باسـی پاشگریشـدا هەرجـارە بە پێی ئەسـڵی پاشگرەکە، کە لە ئینگلیزی، وەیا یۆنانی، وەیا لاتینی وەرگیـرابێـت، بەکارهێنانی لەگەڵ (ناو، ناوی مەعنەوی، ئاوەڵناو، ئاوەڵکار، کار) نموونەیان بۆ هاتووەتەوە.

لیژنە دوای ئەم نمایشـتـە هاتە سـەر لێکۆڵـینەوەی خـۆی. لە ئاکـامی لێکدانەوە و سەرنجگرتن و بەراوردکرندا، لیژنە هاتە سەر ئەو باوەڕە، کەوا دەبێت سەرلەبەری باسەکە بە پێی ئەم خشتەیەی خوارەوە لێی بکۆڵرێتەوە:

١- ئامراز چییە؟

٢- گیرەک Affix چییە؟

أ- پێشگر Prefix چییه؟

ب- پاشگر Suffix چییه؟

جـ- ناوگر Infix چییه ئایا له کوردیدا هەیه یان نییه؟

٣- نیشانه چییه؟

ئەم بۆچوونەی لیژنه، وا داخوازی دەکات، کەوا له پێشەوه له (وشه) بکۆڵرێتەوه له ڕووی (واتا) و (سەربەخۆیی)یەوه. چونکه له بەراوردکرنی ئەو بەشه ئاخاوتنانەی لێره به پێشەوه لیژنه له باسەکانیان بووەتەوه، هەروەها ئەو وشانەی له نمایشتی ئامرازەکان هاتنه بەرچاو دیاردەیەکی زۆر ئاشکرای بوونی سەربەخۆ و نەبوونی سەربەخۆ لەگەڵ واتای تەواو و واتای ناتەواو له تێکڕای ئەو بەشانه و ئەو وشانەدا بەدی دەکرێت.

لەم پێشەکییەوه دەردەکەوێت که دەشێ له سەرەتاوه وشه بکرێت به دوو جۆرەوه:

١- وشەی سەربەخۆ

٢- وشەی بەستراو.

# وشەی سەربەخۆ و وشەی بەستراو

لیژنە زۆر بە وردی و درێژی لەو بیروڕایانەی کۆڵییەوە، کە تا ئێستا نووسەرانی کورد و زانایانی ڕێزمانی غەیری کوردی لە بارەی دابەشبوونی وشە بۆ سەربەخۆ و بەستراو، وەیا تەواو و ناتەواو دەریان بڕیوە بۆ ئەوە بە روونی بگاتە قەناعەتی تەواو لەوەدا ئاخۆ وشەی کوردی چ جۆرە دابەشکردنێک و بەپێی کام بۆچوون ئەم دابەشکردنە هەڵدەگرێت؛ ئەندامانی لیژنە هەریەکە پێشنیازی ئەو بیروڕایانەیان دەکرد، کە بەلایانەوە لەگەڵ سروشتی ڕێزمانی کوردیدا دەگونجێن. بەدەم موناقەشەوە دەستبژارێکی کە مومکین بێت لەم بیروڕایانە کرا، لە ئەنجامی بەراوردکردن و نمایشتی سەرلەبەری بیروڕای نووسەران و بیروڕای ئەندامانی لیژنە بڕیار درا کە وا لە هەر شتێکدا قەناعەت پەیدا بوو، بیروڕا لە بارەی ئەو شتەوە تثبیت بکرێت، لەبەر تیشکی ئەم بڕیارەدا لیژنە ئەم دەستوورانەی خوارەوەی هەڵهێنجا:

یەکەم – وشەی سەربەخۆ (تەواو) چییە؟

وشەی سەربەخۆ ئەو بەشە ئاخاوتنەیە کە وا بە تەنیا بێ ئەوە هیچ زیادێکی لەلاوە پێوە لکابێت، وجوودی سەربەخۆ و واتای تەواوی هەبێت.

بە پێی ئەم تەعریفە کە لە واقیعی راستەقینەی بەشەکانی زمانەوە وەرگیراوە، لیژنە گەڕایەوە سەر ئەو بەشانەی ئاخاوتن کە لە لێکۆڵینەوەکانی لێرە بەپێشەوەدا لێیان دوابوو و وا لە خوارەوە خرانەوە بەرچاو:

١- ناو.

٢- راناو.

٣- ئاوەڵناو.

٤- کار (چاوگ).

٥- ئاوەڵکار.

٦- ئامرازی پریپۆزیشن.

٧- ئامرازی عەتف.

٨- ئامرازی نیدا.

پێنج بەشەکەی سەرەتا، (١ - ناو ٢- راناو ٣- ئاوەڵناو ٤- کار ٥- ئاوەڵکار) بەر تەعریفی (وشەی سەربەخۆ) دەکەون.

لیژنە ئەو بیروڕایانەی کە لەلایەن زمانزانانەوە دەربارەی وشەی (بەستراو) وتراون، بەسەر کردەوە، ئەندامانیش هەریەکەیان بۆچوونی خۆی لە بارەی سەرلەبەری باسەکەوە دەربڕی، لە ئەنجامدا لیژنە ئەم بیروڕایانەی خوارەوەی پەسەند کرد کە بکرێت بە دەستووری ڕێزمانی کوردی لەم باسەدا.

دووەم - وشەی بەستراو (ناتەواو) چییە؟

وشەیێکە کە واتای سەربەخۆی نییە، یا بوونی سەربەخۆی نییە، یا واتا و بوونی سەربەخۆی نییە.

ئەم تەعریفە وەرامی تێبینیی لێرە بەپێشەوە دەداتەوە، کە باسی (استثناء)ی ناو وشەکانی بەشی (وشەی سەربەخۆ)ی کرد، بەوەدا کە وشەی وەک راناوی لکاو (م - مان، ی - یان، ت - تان)، وەیا ئاوەڵناوی موبهەم (پیاوی تر، پیاوی دیکە، هەر پیاوێ....) لە بەشی یەکەم (وشەی سەربەخۆ) دەردەهاوێژرێت و بەربەشی دووەم (وشەی بەستراو) دەکەوێت.

بە سرنجگرتن لە سروشتی ئەو وشانەی کە وشەی بەستراون دەردەکەوێت، لە بنەڕەتدا جوداوازیێکی بەرچاو دەیانکات بە دوو بەشەوە:

١- ئەو وشە بەستراوانەی کە لە رستەدا دەور دەبینن:

لێرە بەپێشەوە لە کاتی لێکۆڵینەوە لە بەشەکانی ئاخاوتن دەرکەوت، کە ئامرازی پریپۆزیشن و ئامرازی عەتف و ئامرازی (نیدا و تەعەجوب) لەوانەن کە لە رستەدا دەور دەبینن نەک لەگەڵ تاکە وشەدا، وەک:

لە ئێرەوە تا کەرکووک ٢٥٠ کیلۆمەترەیە.

منیش لەگەڵ تۆدا دێم.

وای لە دەست جەوری زەمانە.

لەمەوە دەردەکەوێت زاراوەی «ئامراز» بۆ ئەو سێ بەشە ئاخاوتنە دەست دەدات، کە لە رستەدا دەور دەبینن و تێکەڵ بە تەکوینی وشە نابن.

٢- ئەو وشە بەستراوانەی کە لەگەڵ وشەیێکی تردا دەور دەبینن:

لێرەدا دوو تێبینیی دێتە پێشەوە:

تێبینیی یەکەم:

کە دەڵێین (لەگەڵ وشەیێکی تر) مومکینە ئەم وشەیە، یا وشەیێکی (سەربەخۆ) بێت، وەیاخوت وشەیێکی (بەستراو) بێت.

١- نموونەی وشەی سەربەخۆ لەگەڵ بەستراو:

باخەوان، بەهرەوەر، دەستەک، هەڵفڕین، ترساندن، بێ پارە، وەرگرتن.

لەم نموونانەدا وشەکانی (باخ، بەهرە، دەست، فڕین، ترس، پارە، گرتن) وشەی سەربەخۆن.

٢- نموونەی وشەی بەستراو لەگەڵ بەستراو:

لێنەر، نەخۆر، تێپەڕ، بکوژ، هەڵتەک، تێکەڵ، پێکەڵ، تێکرا، تێکدا، پێکڕا، ڤێکڕا.

لەم نموونانەدا وشەیێکی وەک (نەخۆر) هەردوو کەرتی (نە) و (خۆر) وشەی بەستراون، هەروەهاش:

لێ - نەر.

تێ - پەڕ.

بـ - کوژ.

هەڵ - تەک.

تێ - کەڵ (تێ - ک - هەڵ).

پێ - کەڵ (پێ - ک - هەڵ).

تێک - ڕا (تێ - ک - ڕا).

تێک - دا (تێ - ک - دا).

پێک – ڕا (پێ – ک – ڕا).
ڤێک – ڕا (ڤێ – ک – ڕا).

تێبینیی دووەم:

هاتنی وشەی بەستراو (لەگەڵ وشەیێکی تردا) ئەویش دوو جۆری هەیە:

١– وشە بەستراوەکە لەگەڵ ئەوەکەی تردا وشەیێکی نوێ پێک دێنێت، واتە دەبێتە بەشێکی پێک هێنەری وشە نوێیەکە. بۆ نموونە:

پارەدار (پارە – دار).
ملوانکە (مل – وانکە).
راوەستان (را – وەستان).
تێوەرهاتن (تێ – وەر – هاتن).
داهێنانەوە (دا – هێنان – ەوە).
پێبەستە (پێ – بەست – ە).
بەرزایی (بەرز – ایی).
کیژۆڵە (کیژ – ۆڵە).

٢– لەم جۆرە بەیەکەوە هاتنەدا وشە بەستراوەکە تێکەڵ بە تەکوینی وشەکەی تر نابێت. بەنموونە:

پیاوەکە (پیاو – ەکە).
منداڵان (منداڵ – ان).
کەوێک (کەو – ێک).
ئەم دارە (دار – ە).
ئەم دێیە (دێ – ی – ە).
کیژەکان (کیژ – ەک – ان).

لیژنە بۆ ئەو بەشە بەستراوەی کە دەبێتە بەشێکی وشە نوێیەکە زاراوەی (گیرەک)ی پەسەند کرد وەک وشەکانی: بەرخەوان، تێ هەڵکێشان، پارەدار..

بۆ ئەو بەشە بەستراوەش کە تێکەڵ بە تەکوینی وشە نابێت لیژنە زاراوەی (نیشانە)ی پەسەند کرد وەک وشەکانی پیاوەکە (ەکە)، کچان (ان)، پیاوێک (ێک)..

لەم دابەشکردنەدا نەخشەی خوارەوە بۆ وشەی کوردی پێک دێت:




لیژنە ئەم تەعریفەی خوارەوەی بۆ (ئامراز) پەسەند کرد:

ئامراز ئەو وشە بەستراوەیە کە لە رستەدا دەور دەبینێت.

لە لێکۆڵینەوەکانی لەمەوبەر لیژنە لە ئامرازەکان دواوە و لێیان بووەتەوە، لەبەر ئەمە پێویست نەماوە جارێکی تر پێیاندا بێتەوە.

لێرە بەدواوە لیژنە خەریکی لێکۆڵینەوە لە (گیرەک) و (نیشانە) دەبێت.

یەکەم – گیرەک

بەپێی ئەو شیکردنەوەیەی کە زاراوەی (گیرەک)ی لێ وەرگیرا دەتوانین ئەم تەعریفەی بۆ دابنێین:

گیرەک ئەو وشە بەستراوەیە کە لەگەڵ وشەیێکی تر، سەربەخۆ بێ یابەستراو، وشەیێکی نوێ پێک دەهێنن، هەر یەکێکیشیان دەبێتە پێک هێنەری وشە تازەکە.

بە ئیستیقرا دەردەکەوێت لە زمانی کوردیدا دوو جۆرە گیرەک هەیە:

١– ئەو گیرەکەی لە پێشی وشەوە دێت.

٢– ئەو گیرەکەی لە دوای وشەوە دێت.

[روونکردنەوە:

ئەم بیرورِایەی لیژنە لە رۆژی ٥ – ٥ – ١٩٧٦دا نووسراوە. تا ئەو دەمە من بە تەواوی نەگەیشتبوومە قەناعەت بە هەبوون و نەبوونی (ناوگر) لە وشەی کوردیدا. نووسەران دەیانگوت لە کوردیدا (ناوگر)

پەیدا نییە، بەلاّم من بە درێژاییی کات لە گوماندا بووم ناوناوەیێکیش ئیشارەم دەکرد بۆ ئیحتیمالی هەبوونی ناوگر لە کوردیدا بێ ئەوەی ئەو ئیحتیماله بکەم بە بڕیارێکی یەکجاری.

لەو چەند مانگەی دواییدا، بەدەم وردبوونەوەی بەزیادەوە لە باسی ناوگر، کۆمەڵێک وشەم دۆزییەوە لە فەرهەنگی کوردی کە هەندێکیان دەمەتەقە هەڵدەگرێ لەبارەی بوون و نەبوونی ناوگر تێیاندا، هەندێکیشیان بە جۆرێک ئاشکرایە ناوگریان تێدایە کە ڕێی هیچ دەمەتەقە و نەسەلماندن نەدەن. هەڵبەت بە دۆزینەوەی ئەو وشانە لێم روون بوو دیاردەی (ناوگر) لە زمانی کوردیدا راستییێکی لە گومان بەدەرە وەک هەر راستییێکی تری ڕێزمانی کوردی.

لە کتێبۆلکەی (چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی)دا ئەم راستییەم خستە ریزی باسەکانی ناو ئەو کتێبۆلکەوە و بەشێوەیێکی دوایەکی رای خۆم دەربڕی لەبارەی هەبوونی (ناوگر) لە وشەی کوردیدا. لێرەدا چەند وشەیێکی ئەوتۆ بە نموونە دەهێنمەوە کە هیچ گومانێک نەبێت لە بوونی ناوگر تێیاندا:

١- بوردن — کارێکی تێ نەپەڕە و بەهۆی پریپۆزیشنەوە دەبێتە تێپەڕ وەک کە دەڵێی (لە دارا بوردم).

بواردن — کارێکی تێپەڕی راستینەیە بەهۆی هاتنی (ا) بۆ ناو وشەی (بوردن) پەیدا بووە. دیارە (ا) لێرەدا ناوگرە.

٢- بزووتن — ئەمیش تێ نەپەڕە بە واتای (جولانەوە).

بزاوتن تێپەڕە بەهۆی ناوگری (ا)، بەواتای (جولاندنەوە - بزواندن).

٣- پشکووتن

پشکاوتن — بەهۆی ناوگری (ا) بووە بە تێپەڕ. ڕێژەی ئایندەی (دەپشکێوێ)یە، هەر لەمەوە وشەی (باپشکێوە) پەیدا بووە.

٤- بریشکه — ئەم (یٚ)ەی ناو وشەکە لە لاوە هاتووە وەک ناوگر: لە وشەی (برژان، برژاندن)دا هیچ دەنگێک لە نێوان دوو دەنگی (ر، ژ)دا نییە تاکو بڵێین ئەویان بووەتە (یٚ) لە وشەی (بریشکە)دا.

٥- لامێژی

گوێرەمێژ — دوو وشەن لە دەفتەرێکی بابەتی فۆلکۆری، لە رێکخستن و کۆکردنەوەی (رەئووف ئالانی و محەمەد عەبدولکەریم بەرزنجی) بۆ کوڕ هاتووە..

شەرحی وشەکان لە کتێبۆلکەی (حەشارگە..)دا نووسراوە: لێرەدا ئەوەندە دەڵێم کە ئەم (یٚ)ەی ناو وشەی (مێژ) لەلاوە هاتووە وەک ناوگر چونکە دەزانین لە وشەی (مشتن - مژین) هیچ دەنگێکی (یٚ) لە نێوان (م، ژ - م، ش)دا پەیدا نییە.

٦- قرژ — لە وشەی (قژ)ەوە هاتووە بەهۆی ناوگری (ر).

٧- گرنج — لە وشەی (گنج)ەوە هاتووە، ئەویش بەهۆی ناوگری (ر).

٨- ژماردن — لە وشەی (ژمران)ەوە بووەتە تێپەڕ بەهۆی هاتنی ناوگری (ا) بۆ نێوان دوو دەنگی (م، ر). وشەی (شاردنەوە)ش وەک ئەم لە (شرانەوە)وە هاتووە بەهۆی ناوگری (ا).

٩- شەبەق — لە وشەی (شەق)ەوە هاتووە بەهۆی ناوگری (ب، بە)وە.

پێویست نابینم بە نموونەی تر، بێگومان بەدواداگەڕان لە هەموو زمانەکەدا لیستەیێکی درێژمان لەم جۆرە وشانە بۆ دەدۆزێتەوە.

لەمەوە رادەگەیەنم من لەگەڵ ئەو باوەڕە پەرەسەندووەدا نیم کە دەڵێ ناوگر لە زمانی کوردیدا پەیدا نابێت. لێرە بەدواوە، بەدرێژاییی باسی پێشگر و پاشگر کە لەم لێکۆڵینەوە رێزمانییەی لیژنەدا کراوە، دەبێ

ئەوە تێ بخوێندرێتەوە کە وا من باوەڕم هەیە بە بوونی ناوگر لە کوردیدا.

دەمڕاستی لیژنە

مەسعوود محەمەد]

هەتا ئێستا لەلایەن نووسەرانی کوردەوە بۆ ئەم دوو تەرزە گیرەکە ئەم زاراوانە بەکار هێنراون:

١- بۆ زیادیی پێش وشە زاراوەکانی (پێشگر، پێشبەند، پێشپرتک) بەکار هاتووە.

٢- بۆ زیادیی دوای وشە زاراوەکانی (پاشگر، پاشبەند، پاشپرتک) بەکار هاتووە.

لیژنە وای پەسەند کرد دوو زاراوەی (پێشگر، پاشگر) بەکار بهێنێت، لە لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕیشدا دوو وشەی (پێشگر، پاشگر) بۆ (سابقة، لاحقة) پێشنیاز کراوە، هەروەهاش زاراوەی (گیرەک) بە واتای (لاصقة) لە هەمان سەرچاوەدا بەکار هاتووە.

هەرچەند تا ئێستا ئیستیقرای تەواو لە زمانی کوردیدا نەکراوە لە بارەی بوون و نەبوونی ئەو بەشەی کە لە زاراوەی زمانەکانی رۆژاوادا پێی دەڵێن Infix و لە کوردیدا بە واتای (ناوگر) دێت، لەگەڵ ئەمەشدا، لیژنە بە هۆی بەرچاو نەبوونی ئەو زیادییەی کە دەچێتە نێوان پیتەکانی وشەوە لە سەرەتاوە بڕیاری دا جارێ خۆی خەریک نەکات بە گەڕان لە دوا ئەو زیادییانەوە. لەبەر ئەمە لیژنە لە باری ئێستاکەیدا وای دانا (ناوگر) وەک بەشێکی بەرچاو و حیساب بۆکراو لە زمانی کوردیدا نییە. بەهەمەحاڵ لە کۆتاییی ئەم باسەی (پێشگر، پاشگر)دا لیژنە جارێکی تریش دەگەڕێتەوە سەری.

لە دوای ئەم چاو پێداگێڕانەدا لیژنە کەوتە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی لە بارەی پێشگر و پاشگرەوە:

١- پێشگر:

لیژنە ئەم تەعریفەی خوارەوەی بۆ (پێشگر) پەسەند کرد، ئەویش بەندە بەو تەعریفەوە کە لە سەرەتاوە بۆ (گیرەک) دانرا:

پێشگر ئەو گیرەکەیە کە بەپێشەوەی وشەوە دەلکێت.

[روونکردنەوە:

وادەزانم باشتر ئەوەیە بگوترێ (ئەو گیرەکەیە کە لە پێشەوەی وشەوە دێت). چونکە کە گوترا (بەپێشەوەی وشەوە دەلکێت) لەوانەیە تەعریفەکە هەر ئەو پێشگرە بگرێتەوە کە وا راستەوخۆ و بێ نێوان لە پێشەوەی وشەوە دەبێت. بە نموونەی روونکردنەوە دەڵێم لە وشەی (تێ هەڵکشین)دا تەنیا پێشگری (هەڵ) بەپێشەوەی وشەکەوە لکاوە، پێشگری (تێ) لێی دوورە، هەروەهاش هەموو پێشگرێکی تری وەک (تێ) لە وشەی تردا کە دوو پێشگر یا پتری لەپێشەوە هاتووە، وەک (پێدا هەڵگوتن، تێرا رۆیشتن، تێرا دیتن، لێ وەرگرتنەوە، پێ لێ هەڵبڕین...). ئەم گرفتە لە پێشنیازەکەی من پەیدا نییە چونکە کە گوترا (لە پێشەوەی وشەوە بێت) هەموو گیرەکەکانی پێش وشە دەگرێتەوە، چ ئەوەی پێوەی لکابێت و چ ئەوەی لێی دابڕابێت، تەنانەت ئەم تەعریفە بەهاتنی راناوی لکاویش لەپێشەوەی وشەوە پەکی ناکەوێ وەک کە بڵێی (هەڵیان دەگرم، پێیاندا تێ دەپەڕم، تێیان وەردەپێچم) چونکە تەعریفەکە لکانی پێشگری بە پێشەوەی وشەوە نەکردووە بە مەرج. پێی ناوێ من بڵێم، لە خۆوە دیارە بەپێی هەردوو تەعریف تەنیا ئەو وشانە دەبنە پێشگر کە بەر واتای (گیرەک) دەکەون، لەبەر ئەمە لابردنی مەرجی (پێوەلکان) لە تەعریفەکە رێ نادات بەوەی هەموو وشەیێکی کە لەپێشەوەی وشەیێکی ترەوە دێن ببن بە (پێشگر).

دەمڕاستی لیژنە]

بەدوا ئەم تەعریفەدا، لیژنە کەوتە سەر کۆمەڵکردنی ئەو وشانەی کە لەلایەن نووسەرانی کوردەوە بە (پێشگر) دانراون:

(ئە «دە»، بـ، تێ، تێک، تێکدا، تێکڕا، تێکەوە، تێوە، تێدا، پێ، پێوە، پێدا، پێڕا، پێکدا، پێکەوە، پێکڕا، لـێ، لێـوە، لێکڕا، لێکەوە، هەڵ، دەر، ڕۆ، سـەر، وەر، ناو،

ناڤ، دا، را، ڕێ، بەر، پێش، کن، بن، لا، ڤە «وە»، ڤێ، ڤێک، ژێ [ژێ ستاندن]، پەڤ [پەڤگرتن]، وێ (وێرا)، ژەڤ، لەڤ، پەڤ، تەڤ، سەڕڕا، بەڕڕا، ناڤڕا، ڕەخرا، پێشڕا، دژ (دۆش)، هاو [هاوڕێ].

ئەم پێشگرانە لە چەند ڕوویەکەوە لێیان دەکۆڵرێتەوە:

١- لە ڕووی فۆرمەوە:

پێشگر لە ڕووی فۆرمەوە دەکرێ بە دوو بەشەوە:

آ- سادە.

ب- ناسادە.

***

لیژنە لەم بەشە لێکۆڵینەوەیەی سەر بە وشەی (سەربەخۆ و بەستراو)دا چەند لاپەڕەی دوایی بلاو کردەوە بە نموونەی جۆری بۆچوون و شێوازی بیرکردنەوەی خۆی لەبارەی باسەکەوە کە وا، ئاشکرایە، بۆچوون و بیرکردنەوەیێکی نوێیە و بۆ یەکەم جار لە ڕێزمانی کوردیدا سنووری نێوان (ئامراز، گیرەک، نیشانە) ڕوون دەکاتەوە. وا پەسەند کرا ئەم باسە بە جۆرێکی سەربەخۆ بلاوبکرێتەوە، واتە، لە شێوەی بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکانی لیژنە: ئێستا تەنیا بەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکان بلاو دەبێتەوە کە بریتییە لە سەرە باسەکانی هەشت بەشە زۆر باس کراو و ناسراوەکەی ئاخاوتن کە هەر خۆیانن جۆری (وشەی سەربەخۆ و ئامراز) پێک دەهێنن. لیژنە هیواداره لە داهاتوودا باسی (وشەی بەستراو) بە ئەنجام بگەیەنێت، بە دوا ئەویشدا لە باسە زۆر گرنگەکەی (Syntax) بکۆڵێتەوە کە ناوەڕۆک و کاکڵی هەموو تۆژینەوەیێکی ڕێزمانی بەردەکەوێت.

لیژنەی (ڕێزمان و زانستەکانی) لەم بەرهەمەیدا، کە دیارییێکی کۆڕی زانیاری کوردە بۆ ڕۆشنبیریی کوردی، گەلاڵەی چالاکیی چەند ساڵەی خۆی بە تەوازوعەوە دەخاتە بەر نیگای ڕەخنە و نرخاندنی زمانزانانی کورد و کوردی.

بەغدا ١٨ - ١٢ - ١٩٧٦

لیژنەی زمان و زانستەکانی

کۆڕی زانیاری کورد

***

## پێڕست